# ئەحكامەكانی جەنازە

# و

# داهێنراوەكان

نووسینی زانای فەرموودە ناسی سەردەم

پێشەوا شێخ: محمد ناصر الدين الألباني

وەرگێڕانی: لیژنەیەك

بەسەرپەرشتی:

مامۆستا عدنان بارام كەلاری

دار المعرفة

بەیروت

كتێبخانەی ئاریز

هەولێر

زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست
( ١٣ )

# ئەحکامەکانی جەنازە
# و
# داهێنراوەکانی


نووسینی زانای فەرمووده ناسی سەردەم
پێشەوا شێخ : محمد ناصرالدین الألباني

وەرگێڕانی : لیژنەیەك
بەسەرپەرشتی :
مامۆستا عدنان بارام کەلاری

**ناوی کتێب : ئەحکامەکانی جەنازە و داهێنراوەکانی .**

**ناوی نووسەر : پێشەوا شێخ : محمد ناصرالدين الألباني .**

**ناوی وەرگێڕ** : لیژنەیەك .

**بەسەرپەرشتی** : مامۆستا عدنان بارام کەلاری .

**ژمارەی سپاردن** : ژمارە ( ٦٦٢ )ی ساڵی (٢٠٠٤) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .

**زنجیرە** : زنجیرەی ( ١٣ ) سیانزەیەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .

**نۆرەی چاپ** : چاپی یەکەم .

**ساڵی چاپ** : ( ١٤٢٩ هـ / ٢٠٠٨ ز ) .

**شوێنی چاپ : دار المعرفة / بيروت ـ لبنان .**

**بنکەی بڵاوکردنەوە** : کتێبخانەی سوننە / سلێمانی / کوردستانی عێراق .

www.R-rast.com
abo.sunnah@gmail.com
r_rast@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی نووسەر

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بالله من شُرُوْرِ أَنْفُسنَا وَمنْ سَيِّئَات أَعْمَالنَا مَنْ يَهْده اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَاديَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاته وَلاَ تَمُوتُنَّ إلاَّ وَأَنتُم مُّسْلمُونَ ﴾ ( سورة آل عمران : ١٠٢ ) .

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحدَةٍ وَخَلَقَ منْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ منْهُمَا رجَالاً كَثيرًا وَنسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذي تَسَاءلُونَ به وَالأَرْحَامَ إنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقيبًا ﴾ ( سورة النساء : ١ ) .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَديدًا يُصْلحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظيمًا ﴾ ( سورة الأحزاب : ٧٠ – ٧١ ) .

أَمَّا بَعْدُ : فَإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْث كتَابُ الله وَخَيْرَ الهَدْي هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَة بدْعَةٌ وَكُلَّ بدْعَة ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَة في النَّار .

**خوای پەروەردگار فەرمویەتی :** ﴿ تَبَارَكَ الَّذي بيَده الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ الَّذي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ ليَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزيزُ الْغَفُورُ ﴾ ( سورة الملك : ١ – ٢ ) .

**واتە : بەپێز وبەفڕ وموبارەکە ئەو خوایەی کە هەموو دارایيەکان بە دەستی ئەوە ودەسەڵاتیشی هەیە بە سەر هەموو شتێکدا ئەو خوایەیی کە مردن وژیانی دروست کردووە و خوڵقاندوونی بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کە کامەتان زیاتر چاکەکارترن وهەر ئەویشە بە توانا و لێبووردەیە بەرامبەر بە تاوانی بەندەکانی .**

**وە فەرمویەتی :** ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَائقَةُ الْمَوْت وَنَبْلُوكُم بالشَّرِّ وَالْخَيْر فتْنَةً وَإلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ ( سورة الأنبياء : ٣٥ ) ، **واتە : هەموو نەفسێك دەبێت هەر مردن بچێژێت ئێمەش تاقیتان دەکەینەوە بە خراپە و چاکەش و گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای خۆمانە .**

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** " مالي وللدنيا ؟ ما أنا في الدنيا إلا كراكب استظل تحت شجرة ثم راح وتركها " [1] ، **واتە : من چیم داوە لە دونیا ؟ نموونەی من لە دونیادا وەکو سوارێکە لە**

[1] حديث صحيح ، وهو مخرج في ( تخريج فقه السيرة للغزالي ، ص ٤٧٨ الطبعة الرابعة ) ، وفي ( الأحاديث الصحيحة ، رقم ٤٣٨ ) ولذلك أوردته في كتابي ( صحيح الجامع الصغير وزيادته ) يسر الله تعالى إتمامه بمنه وفضله .

گوزەر و سەفەرەکەیدا خۆی دابێتە سێبەری دارێك ، و پاشان بڕوات ، و بە جێ ی بهێڵێت .

پاشان کە (( ڕێگە وڕێباز وسوننەتی پێغەمبەر ﷺ باشترین ڕێگەو ڕێباز وسوننەت بووە لە بەڕێکردنی جەنازەدا ، بە پێچەوانەی ڕێگەو ڕێباز و سوننەتی ئوممەتانی تر ، کە چاکەکاری دەگرێتە خۆ بەرامبەر بە مردووەکە ، لە مامەڵە کردن لە گەڵیدا بەوەی کە سوودی لێ وەردەگرێت لە گۆڕەکەیدا ، و ڕۆژی زیندوو بوونەوەی ، لە گەڵ چاکەکاری لە گەڵ ئەهل و کەس و کاریدا ، و لەگەڵ بەرپاکردنی ئەو پەرستشانەی کە زیندوان ئەنجامی دەدەن لە کاتی مامەڵەکردنیان لە گەڵ مردووەکەدا ، لە ڕێگەو ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ لە جەنازەدا بەرپاکردنی پەرشتش بووە بۆ خوای پەروەردگاری بەرز و بڵندی بە باشترین شێوەی چاکەکاری لە گەڵ مردووەکەدا ، و ئامادەکردن و بەڕێخستنی بۆ لای خوای پەروەردگار لە سەر باشترین و چاکترین شێوەی ، لە گەڵ وەستانی خۆی و هاوەڵانی ڕیز لە دوای ڕیز بۆ دەربڕینی شوکر و ستایش بۆ خوای پەروەردگار ، لە گەڵ داوای لێخۆش بونیش بۆ مردووەکە ، و داوای لێخۆش بوون و بەزەیی و لێبوردن بۆ خۆیان بە ڕێکردنیان لە بەر دەستەکانی خوای پەروەردگار تاکو بە گۆڕ نانی مردووەکە ، پاشان خۆیی و هاوەڵانیشی لە بەر دەستەکانیدا ڕادەوەستن ، و داوای جێگیر بوونی بۆ دەکەن کە زیاترین شوێنێکە مردووەکە پێویستی بە پاڕانەوەیان هەبێت ، پاشان هەوڵ دەدەن جار لەدوای جار سەردانی گۆڕەکەی بکەن ، سەلامی لێ بکەن ، بۆی بپاڕێنەوە ، هەروەکو چۆن لە دونیادا زیندوان سەردانی هاوەڵەکانیان دەکەن .

یەکەمین شتیش لەوانە : سەردانی کاتی نەخۆشی وبیرخستنەوەی دواڕۆژی ، وفەرمان پێکردنی بە وەسێت کردن ، وتۆبە کردن ، فەرمان کردن بەوانەی کە سەردانی دەکەن کە هەوڵی ئەوە بدەن کە شایەتوومان : ( واتە : لا إله إلا الله ) ی بیرخەنەوە ، وبیخەنە سەر زمانی ، بۆ ئەوەی دوا ووتەی بێت لە دونیادا .

پاشان نەهی کردن ، و قەدەغەکردنی داب و نەریتی ئەو ئوممەتانەی کە بڕوایان بە زیندوو بوونەوە وهەستانەوە نیە ، لە لێدان و ڕووشاندنی ڕوومەت ، و دادڕینی جل و پۆشاك ، و تاشین و دارنینی پرچ ، و بەرزکردنەوەی دەنگ بە شیوەن واوەیلا ، ئەوانەش بە دوایاندا دێت .

وە بێدەنگی لە کاتی مردن وگریانێك کە دەنگی پێ بەرز نەکرێتەوە ، ودڵ تەنگی ، وئەوانەشی ئەنجام دەدا ، ودەیفەرموو : " تدمع العين ، ويحزن القلب ، ولا نقول إلا ما يرضي الرب " [٢] ، واتە :

---

(٢) صححه العلامة الألباني في ( صحيح سنن أبي داود ، برقم : ٣١٢٦ ) ، و ( صحيح سنن ابن ماجه ، برقم : ١٥٨٩ ) ، و ( صحيح الجامع الصغير ، برقم : ٢٩٣١ ) ، و ( سلسلة الأحاديث الصحيحة ، برقم : ١٧٣٤ ) .

چاوەکان فرمێسك دەڕێژن ، و دڵیش تەنگ دەبێت ، هیچیش نالێن ڕازی بوونی خوای پەروەردگاری تێدا نەبێت .

وە ئەوەشی کردووە بە سوننەت بۆ ئوممەتەکەی شوکر و ستایشی خوای پەروەردگار بکەن لە بیستنی خەبەری مردنی یەکێکیان ، لە گەڵ ووتنی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) ، و ڕازی بوون بەوەی کە خوای پەروەردگار بە سەریدا هێناویەتی ، ئەوەش پێچەوانە بوونەوە نیە لە گەڵ فرمێسکی چاوەکان ، و دڵ تەنگی ، بۆیە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیترین کەسە لە بەندەکانی خوای پەروەردگار بەرامبەر بە قەزا و قەدەرەکانی ، گەورەترین شوکرانەبژێریشی بووە ، لە گەڵ ئەوەشدا لە کاتی مردنی ( إبراهيم ) ی کوڕی گریاوە ، وەکو بەزەیی و سۆزێك بەرامبەر بە کوڕی خۆی ، بەڵام لە گەڵ دڵێکی پڕ لە ڕازی بوون لە خوای پەروەردگار ، و شوکرانە بژێری ئەو ، و لەولاشەوە زمانی خەریکی زیکر و شوکرانە بژێری بووە )) [٣] .

وە لە بەر ئەوەی زۆرینەی خەڵك لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە تەواوی دورکەوتوونەتەوە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو پەرستشەکانیاندا ، لەوانەش لە ( **ئەحکامەکانی جەنازە** ) دا ، ئەوەش بە هۆی دورکەوتنەوەیان لە خوێندن ، و فێر بوونی زانستە شەرعییەکان ، بە تایبەت زانسی فەرمووده و سوننەتەکانی ، و هەڵپەکردنیان بۆ زانستە دونیایەکان ، هەوڵدان و کارکردن بۆ بەدەست هێنانی پارە و پوڵ و سامانی دونیا ، بۆیە چەند بەرێزێك بە بۆنەی کۆچی یەکێك لە خزم و خێشەکانی لە ڕۆژی هەینی لە بەرواری ( **١١ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٣٧٣هـ** ) داوای لێ کردم کە نووسراوێکی کورت بنووسمەوە سەبارەت بە ( **ئاداب و سوننەتەکانی جەنازە لە ئیسلامدا** ) بۆ ئەوەی ئەو یان جگە لەو هەستێت بە چاپکردن و دابەشکردنی بە سەر ئامادەبوان لە تەعزیەکەیدا ، و لە ڕۆژانی دیاریکراویاندا کە ڕاهاتوون لە سەری ، ئەو ڕۆژانە بە هەڵ بزانێت بۆ ناساندنیان بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیان ﷺ بۆ ئەوەی لە ژیانیاندا پیادەی بکەن ، شوێنی ڕێگەکەی بکەون ، و ببێتە ڕووناکاری ژیانیان .

---

[٣] من كلام ابن القيم ــ رحمه الله ــ في ( الفصل الأول من الجنائز / زاد المعاد : ١ / ١٩٧ ) وتمامه : (( ولما ضاق هذا المشهد ، والجمع بين الامرين على بعض العارفين ، يوم مات ولده ، جعل يضحك ! فقيل له ، أتضحك في هذه الحالة ؟! فقال : ان الله تعالى قضى بقضاء ، فاحببت أن أرضى بقضائه . فاشكل هذا على جماعة من أهل العلم ، فقالوا كيف يبكي رسول الله ﷺ يوم مات إبنه إبراهيم ، وهو أرضي الخلق عن الله ، ويبلغ الرضى بهذا العارف إلى أن يضحك ! فسمعت شيخ الاسلام ابن تيمية يقول : هدي نبينا ﷺ كان أكمل من هدي هذا العارف ، أعطى العبودية حقها ، فاتسع قلبه للرضى عن الله ورحمة الولد والرقة عليه ، فحمد الله و رضي عنه في قضائه ، وبكى رحمة ورأفة ، فحملته الرأفة على البكاء ، و عبوديته الله ، ومحبته الله الرضى والحمد . وهذا العارف ضاق قلبه عن اجتماع الامرين ولم يتسع باطنه لشهودهما ، والقيام بهما ، فشغلته عبودية الرضى عن عبودية الرحمة والرأفة )) .

منیش سەرەڕای ئەوەی كە دەستم دابوو بە چەند نووسینێكی ترەوە ، بەڵام موژدەی خێرشم بە ئەو دابوو ، چونكە ئەو كارە هاریكاری تێدا بوو لە زیندووكردنەوەی سوننەت ، و مراندن و نەهێشتنی بیدعە ، بۆیە بۆ بەجێهێنانی حەزەكەی ، و وەك پاداشتێك بۆ داواكارییەكەی دەست پێشخەریم كرد لەو كارەدا .

لەو كاتەی كەزۆر نزیك بوو دەست بكەم بە نووسینەكەم ، بۆم ڕوون بووەوە كارەكە زۆر لەوە دوورترە كە لە ماوەیەكی خێرای ئەوتۆدا بەدیبهێنرێت ، لەوەش فراوانترە كە نامیلكەیەكی بچوكدا كۆبكرێتەوە ، و دابەش بكرێت بە سەر خەڵكانێكدا لەو جۆرە بۆنانەدا ، ئەوەش لەبەر ئەوەی كە ئادابەكانی جەنازە و ئەحكامەكانی زۆر زۆرن ، بەشێكی گەورەشی لەو جۆرەیە كە زانایان ووتە و بۆچوونی جیاوازیان هەیە تیایدا ، بۆیە دەبینین هەندێكیان شتێلێك بە حەرام و قەدەغەكراو دادەنێن ، كەچی هەندێكی تریان بە حەڵاڵ و ڕێپێدراوی دەزانن ، یان هەندێكیان هەندێك شتیان لە لا واجب و پێویستە كەچی ئەوانی تر بە ڕەوای نازانن ، وە هەندێكیان بە سوننەتی دەزانن ، بەڵام ئەوانی تر بە بیدعە و داهێنراوی دەزانن ، وە بەم شێوەیە ... هتد ، هەروەكو چۆن لە زۆر لە باس و بابەتەكانی تردا بەرچاو دەكەوێت ، لە زۆربەی بابەتەكانی شەریعەتدا ، ئەوەش دەربڕینی ئەو ڕاستییەیە كە خوای پەروەردگار سەبارەت بەوە فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾ ( سورة هود : ١١٨ — ١١٩) .

لە بەر ئەوە وای پێویست دەكرد پێش هەموو شتێك بابەت و باسەكانی جەنازە كۆبكرێتەوە ، و پاشان لێكدانەوەی بە لێكدانەوەیەكی ورد ، و بە دواگەڕانی ئەو بەڵگانەی كە زانایان وتەی جیاوازیان هەیە سەبارەتیان ، پاشان ڕەخنەكاری كردنیان لە ڕوانگەی هەر دوو زانستی ( أصـول الحديث ) ، و ( أصول الفقـه ) ، و دیاریكردنی بۆچوونی ڕەوا تیایاندا ، بێ هیچ لایەنگرییەك بۆ مەزهەب و بۆچونێكی دیاری كراو ، یان كەوتنە ژێر كاریگەری داب و نەریتێك كە دەستی گرتبێت بە سەر خەڵك دا ، بە شێوەیەك هەروەكو بڵێت فەرمایشێكی ئایینیە دەبێت پەیڕەو بكرێت !

وە لەوانەش كە شاراوە نیە لە لای ئەو زانایانەی كە هەستاون بە كاری نووسین ، جێ بەجێ كـردنن و بـەجێهێنانی كردارێكـی ئـاوا بـەم شـێوەیە ، پێویـست دەكـات هـەوڵ و تێكۆشـانێكی بەردەوامی دەوێت ، و توانایەكی زۆری دەوێت ، لە گەڵ ئارامگرییەكی زۆر باش و كاتێكی درێژە خایەنیشی دەوێت ، دوای جێ بەجێ كردنی ئەم داواكاریانە ئینجا دەتوانرێت پەرتوكی داواكراو بنووسرێتەوە ، بەو شێوەیەی كە دڵی پێ خۆش بكرێت ، و سنگی پێ ئارام ببێت ، سودێكی گەورەش ببەخشێت .

بۆیـە كورتـەی ئـەم باسـەم كـرد بـۆ ئـەو برایـەی كـە پێـشتر نـاومبرد، ئـەوەش وەكـو داوای لێ بووردنێك لێی ، ئەویش خوای پەروەردگار پاداشتی بەخێری بداتەوە ، ئەوەی لێ وەرگرتم ، بەڵام

داوای ئەوەی لێ كردم كە واز لەو كارە نەهێنم ، و زۆر هانی دام لە سەر ئەو كارە ، و هیواشی وا بوو كە زۆر بە سوود دەبێت .

منیش ئیستخارەی خوای پەروەردگارم كرد ، كەوتمە سەر لێكۆڵینەوەی ئەو بابەتە ، و پیاچوونەوە نزیكەی سێ مانگی ڕەبەق ، بە شەو و ڕۆژ كارم لێ دەكرد ، جگە لەو كاتانە نەبێت كە خەریكی كاركردن بووم لە میهنەو كارەكەم دا ، یان لە كاتی خەوتنمدا كە مرۆڤ ناتوانی دەست بەرداری بێت بو ئیسراحەتی لەشم كە پێویستی بێیە ، تاكو توانیم ئەم كتێبە بنووسمەوە كە لە بەر دەستی خوێنەری بەڕێزدایە .

ئەو كارەش داخوازی كاتێكی زیاتری دەكرد كە بۆی تەرخان كرا بوو ، ئەگەر ئەوە نەبایە كە بەشێكی گەورەی بابەتەكان ، و فەرموودەكانیان پێشتر تەحقیق كرا بوون لە هەندێك لە نووسراوەكانمدا ، بۆیە دەبینیت لە زۆر شوێند ئاماژەیان پێ دەكەم .

وە هەوڵی ئەوەشم داوە كە بەدوای هەموو ئەوانەدا بڕۆم كە پەیوەستن بە بابەتەكەوە لە باسەكانیدا كە بەڵگەیان لە سەرە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتەوە ، وە پشتیشم هەڵكردووە لە هەموو ئەو بابەتانەی كە پشت و پەنایان تەنها بۆچوونە ، چونكە بابەتكە پەرستشە و هیچ ڕێگەیەكی تێدا نیە بۆ بۆچوونی پەتی و پێوانەی بابەتەكان لە سەر یەكتر كە دورە لە بەڵگە ، لە باسی جەنازەدا ، لە هەموو پەرتۆكەكانی فیقە و شەریعەتدا ، وەك وەسێت ، و نیشانەكانی ئاخر خێری تێدا ، جگە لەوانەی كە پێواندنێكی ڕوون و ئاشكرای دەوێت .

وە لە سەرەتایدا هەندێك بەش و بابەتم هێناوەتەوە و باس كردووە ، كە وەكو عادەت لە باسی جەنازەدا باس ناكرێن بە گشتی لە كتێبە فیقهیەكاندا ، وە باسی وەسێت كردن ، و نیشانەكانی ئاخر خێری ، هاوشێوەكانی ، وەهەندێكیان هەر باس ناكرێت تێیدا ، وەكو بەشی ( ٥ ، و ٨ ، و ٩ ) ، و باسی ( ٣٠ ) ، و بڕگەی ( ج ) ، و ( د ) لە باسی ( ٧٤ ) دا ، و باسی ( ٩٨ ، و ٩٩ ، و ١٠٥ ، و ١٠٧ ، و ١١٣ ، و ١٢٥ ) ، و بڕگەی ( ٧ ) لە باسی ( ١٢٨ ) دا ، لە گەڵ گرنگی تووش بوونی موسڵمانان بەو شتانە ، كە بە موتەواتری پێمان گەشتووە ، بڕگەی ( ١٠ ) تیایدا ، شێوازی داڕشتنەكەشیم لە لەواقعەوە وەرگرتووە ، كە بەم شێوەیە دەستم پێ كردووە :

١ ـ بە ( **ئەو شتانەی كە لە سەر نەخۆش پێویستن** ) ، لە ڕازی بوونی بە قەزاوقەدەری خوای پەروەردگار و ، ئارامگرتن لە سەری ، و وازهێنان لە ئاواتەخوازی مردن ، و جێ بەجێ كردنی مافەكان ، وەسێت كردن ، و شایەت گرتن لە سەری ... هتد .

٢ ـ پاشان ( **تەلقین كردن لە سەرە مەرگ** ) ، و ئەوەی كە لە سەر ئامادە بوان پێویستە ، لە تەلقین كردن و فەرمان پێكردنی بە هێنانی شایەتومان .

٣ ـ پاشان ( چی لەسەر ئامادە بوانە دوای مردنی ) لە چاو نوقاندن ، و بۆ پاڕانەوەی ، داپۆشینی ، و پەلەكردن لە بەڕێكردنی ، و دەستپێشی خستن و پەلەكردن لە دانەوەی قەرزەكانی .

٤ ـ پاشان ( چی ڕەوایە بۆ ئامادەبوان و جگە لەوان ) ، لە لابردنی ئەو شتەی كە دراوەتە سەر ڕوومەتی ، وماچكردن و بۆ گریانی .

٥ ـ پاشان ( ئەوەی كە پێویستە لە سەر كەس و كاری مردووەكە ) لە ئارامگرتن ، و ڕازی بوون بە قەدەری خوا ، و ووتنی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) ، و وازهێنانی ئافرەت لە خۆڕازاندنەوە بە مردنی مێردەكەی .

٦ ـ پاشان ( ئەوەی كە حەرام و قەدەغەیە لە سەر كەس و كاری مردووەكە ) لە شیوەن ، و لە ڕوومەت دان ، و دادڕانی یەخە ، و جگە لەوانەش وەك بلاوكردنەوەی خەبەری مردنی لە سەر مینبەرەكانەوە .

٧ ـ پاشان ( هەواڵ گەیاندنی ڕەوا بە مردنەكەی ) .

٨ ـ پاشان ( نیشانەكانی ئاخر خێری ) .

٩ ـ پاشان ( بە باشە باسكردنی خەڵك بۆ مردووەكە ) .

١٠ ـ پاشان ( شۆردنی مردوو ) ، ئا بەو شێوەیە تاكو دەگاتە بەخاك سپاردن ، و سەردانی گۆڕستان .

وە كۆتایم پێ هێناوە بە بەشێكی تایبەت بە بیدعە و داهێنراوەكانی جەنازەوە ، هەموو ئەو بیدعە و تازەگەریانە دەگرێتە خۆ كە بەرچاوم كەوتوون كە دەقی ووتەی زانایانی لە سەر بووە لە پەرتوكەكانیاندا ، لە زانایانی كۆن و تازە ، لە گەڵ ئامـاژەكردن بە شوێنی وتەكانیان لە سەرچاوەكەیەوە ، وە ئەوەش كە ئاماژەم پێ نەداوون ، لەو جۆرە بیدعانەن كە بنەوا زانستیەكان ئەو حوكمەیان بە سەردا دەدەن ، بەڵام من وتەی ئەوانم لە سەر نەدیوە ، زۆربەشیان ئەو بیدعانەن كە لەم سەردەمەی خۆماندا داهێنراون .

وە داواكاریشم لە خوای پەروەردگار ، كە ئەم پەرتوكە بكات بە مایەی سودمەندی بۆ خوێنەرانی ، و پاداشتی منیش بنووسێت ، وە هاوشێوەشی بۆ ئەو كەسەی كە هۆی نووسینی بوو ، ئەوانەش كە هەستاون بە چاپكردنی ، هەر ئەویشە بیسەر و وەڵام دەرەوەی بەندەكانی .

دمشق ٢٤ محرم سنة ١٣٨٨ هـ [٤] .

محمد ناصر الدين الألباني

---

[٤] وكان منتظرا صدور الكتاب في ١٣٨٥ بعد أن سبكت الحروف وأعد للطبع ولكن توقف مطابع المكتب الإسلامي من ذي القعدة ١٣٨٤ حتى منتصف ربيع الأول ١٣٨٨ حال دون ذلك . والله المستعان على كل حال . الناشر .

## (١) ئەو شتانەی كە لە سەر نەخۆش پێویستن ( ما يجب على المريض ) :

١ ـ پێویستە لە سەر نەخۆش ڕازی بێت بە قەزای خوای پەروەردگار و ئارامگریش بێت لە سەر قەدەری و گومانیشی چاك بێت بەرامبەر بە پەروەردگاری چونكە ئەوە بۆی باشترە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی یەتی : " عجبا لأمر المؤمن إن أمره كله خير ، وليس ذاك لأحد إلا للمؤمن ، إن أصابته سراء شكر ، فكان خيرا له ، وإن أصابته ضرّاء صبر ، فكان خيرا لـه " [٥] ، واتە : سەرم سووڕماوە لە باروكرداری بڕواداران هەموو بارووكردارێكی چاكەیە بۆی ئەو شتە بۆ كەسی تر نی یە جگە لە بڕواداران نەبێت ، ئەگەر چاكەیەكی تووش بێت شوكرانە بژێری دەكات بە چاكە بۆی دەنووسرێت وە ئەگەر خراپەیەكی تووش بێت ئارامی لە سەر دەگرێت بە چاكە بۆی دەنووسرێت .

وە ﷺ فەرمو و یەتی : " لا يموتن أحدكم إلا وهو يحسن الظن بالله تعالى " [٦] .

واتە : هیچ كەسێكتان نەمرن ئیللا گومانی چاكبێت بە خوای پەروەردگاری .

٢ ـ وە پێویستیشە لە سەری لە نێوان ترس ( الخوف ) و هیوا ( الرجاء ) دا بژێت لە بەر تاوانەكانی واتە : لە سزایی خوای پەروەردگار بترسێت و لەو لاشەوە هیوای بە ڕەحم و میهرەبانی خوای پەروەردگاری هەبێت لە بەر فەرموودەكەی ( أنس ) ﷺ كە فەرموویەتی : " أن النبي ﷺ دخل على شاب وهو بالموت فقال : كيف تجدك ؟ قال : والله يارسول الله إني أرجو الله وإني أخاف ذنوبي فقال رسول الله ﷺ : لا يجتمعان في قلب عبد في مثل هذا الموطن إلا أعطاه الله ما يرجو وأمنه مما يخاف " [٧] .

واتە : جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە لای لاوێك لە سەرە مەرگدا بوو پـێی فەرموو : چۆن خۆت دەبینیت ؟ ئەویش ووتی : سوێند بێت بە خوای پەروەردگار . ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ . هیوام بە میهرەبانی پەروەردگارم هەیە و لەولاشەوە ترسی تاوانەكانم هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : هەرگیز ئەو دوو شتە لە كاتێكی ئاوادا كۆ نابنەوە لە دڵی بەندەیەك لە بەندەكانی خوای پەروەردگار ئیللا ئەوەی پێ دەبەخشێت كە بە هیوایەتی و دڵ ئارام و متمانەشی دەكات لەو

---

[٥] رواهما مسلم والبيهقي وأحمد .

[٦] رواهما مسلم والبيهقي وأحمد .

[٧] أخرجه الترمذي وسنده حسن ،وابن ماجه ،وعبدالله بن أحمد في (زوائد الزهد : ٢٥/٢٤) وابن أبي الدنيا كما في (الترغيب:١٤١/٤).

شتەی کە لێی دەترسێت .

٣ ـ وە هەرچەندە ئازاری نەخۆشیەکەی زۆر بێت بۆی نیە ئاوات و خۆزگەی مردن بکات لە بەر فەرموودەی ( أم فضل ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت . کە دەگێڕێتـەوە : " أن رسول الله ﷺ دخـل علـيهم وعباس عم رسول الله يشتكي فتمنى عباس الموت فقال له رسول الله ﷺ : يا عم !لا تتمن المـوت فانـك إن كنت محسنا فأن تؤخر تزداد إحسانا إلى إحسانك خير لك وإن كنت مسيئا فأن تؤخر فتستعتب من إساءتك خير لك فلا تتمن الموت " [٨] .

واتـە : جارێکیـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆشـتە ژوورەوە بـۆ لایـان و ( عبـــاس ) ی مـامی پێغەمبەریش ﷺ نەخۆش و بە ئازار بوو بۆیە ( عباس ) ئاوات و خۆزگـەی مردنـی کـرد پێغەمبـەری خواش ﷺ پێی فەرموو : ئەی مامی بەڕێزم ئاوات و خۆزگەی مردن مەکە چونکە ئەگـەر چاکەکار بیت ئەوا تا مردنت دوا بکەوێت چاکەی زیاتر دەکەیت لە سەر چاکەکانت وە ئەگەر خراپـەکار بیت ئەوا تا مردنت دوا بکەوێت زیاتر پەشیمان دەبیتەوە لە تاوانەکانت ئەوەشت بۆ باشترە بۆیە ئاوات و خۆزگەی مردن مەکە .

وە لە فەرموودەی ( أنس ) دا بە ( مرفوع ) ی هاتووە کە فەرموویەتی ﷺ : " فإن كان لا بد فاعلا فليقل : اللهم أحيني ما كانت الحياة خيرا لي : وتوفني إذا كانت الوفاة خيرا لي " [٩] ، واتـە : وە ئەگـەر هـەر نەکرا و دەبێت وتەیەك بڵێت ئەوا با بڵێت : ئەی پەروەردگارم بمژێنە تا ئەو کاتەی کە ژیانم چاکە بۆم وە بشمرێنە ئەگەر مردنم چاك بوو بۆم .

٤ ـ وە ئەگەر هەر مافێکی لە سەر بوو با بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی ئەگەر لە توانایدا بـوو بـا وەسێتی پێ بکات چونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : " من كانت عنده مظلمة لأخيـه مـن عرضه [١٠] أو ماله ، فليؤدها إليه ، قبل أن يأتي يوم القيامة ، لا يقبل فيه دينار ولا درهم ، إن كان له عمل صالح أخذ منه ، وأعطي صاحبه ، وإن لم يكن له عمل صالح ، أخذ من سيئات صاحبه فحملت عليه " [١١].

واتـە : هـەر کەسێك ستم و زوڵمـی کـردووە لـە برایـەکی لـە ناموسـی بێـت یـان لـە سـەروەت و سامانی با بیداتەوە پێی پێش ئەوەی کە ڕۆژی دوایی بێت ئەو ڕۆژەی کە درهـەم و دینـاری تێدا وەرناگیرێت ئەگـەر کـرداری چاکـەی هـەبێت بەرامبـەر بـەو ستەم و زوڵمانـەی کـە کردوویـەتی لێـی

---

[٨] أخرجه الحاكم (٣٣٩/١) وقال : ( صحيح على شرط الشيخين ) ووافقه الذهبي . وإنما هو على شرط البخاري فقط .

[٩] أخرجه الشيخان والبهقي (٣٧٧/٣) وغيرهم .

[١٠] العرض : موضع المدح والذم من الانسان سواء كان في نفسه أو من يلزمه أمره ( نهاية ) .

[١١] أخرجه البخاري والبيهقي (٣٦٩/٣) وغيرهما .

دەبرێت و دەدرێت بە ئەو کەسەی کە ستەم وزوڵمی لێ کردووە ئەگەر نە لە خراپەی ئەو کەسەی دەخرێتە سەر .

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : " أتدرون ما المفلس ؟ قالوا : المفلس فينا من لا دراهم لـه ولا متاع فقال : إن المفلس من أمتي يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة ويأتي قد شتم هذا وقذف هذا وأكل مال هذا وسفك دم هذا وضرب هذا فيعطى هذا من حسناته وهذا من حسناته . فإن فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار " [١٢] .

واتە : ئایا دەزانن کێ موفلیس و بێ پارەیە ؟ فەرموویان : موفلیس و بێ پارە لە لای ئێمە ئەو کەسەیە کە درهەم و ناوماڵەی نەبێت ئەویش فەرمووی : موفلیس لە ئوممەتی مندا ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دێت نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتی هەبێت بەڵام لەو لاشەوە قسەی بەم کردووە و بوختیانی بۆ ئەو هەڵبەستووە و ماڵی ئەمی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە و لەوی داوە لەو ڕۆژەدا : لە چاکەکانی دەدرێت بە ئەم و بە ئەو جا ئەگەر چاکەکانی تەواو بێت پێش ئەوەی کە لەسەریەتی ئەدای بکات لە خراپەکانیان دەهێنن و دەیخەنە سەر خراپەکانی و پاشان دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " من مات وعليه دين فليس ثم دينار ولا درهم ولكنها الحسنات والسيئات " [١٣] ، واتە : ئەوەی کە دەمرێت و قەرزێکی لە سەرە ئەوا با بزانێت کە لەو ڕۆژەدا دینار و درهەم نیە جگە لە چاکەکان و خراپەکان نەبێت .

وە ( جابر ) ی کوڕی ( عبدالله ) ﷺ فەرموویەتی : " لما حضر أحد دعاني أبي من الليل فقال : ما أراني إلا مقتولا في أول من يقتل من أصحابه ﷺ وإني لا أترك بعدي أعز علي منك غير نفس رسول الله ﷺ وإن علي دينا فاقض واستوص بإخوتك خيرا . فأصبحنا فكان أول قتيل ... " [١٤] تاکو کۆتایی فەرموودەکە .

---

[١٢] رواه مسلم (٨/ ١٨) .

[١٣] أخرجه الحاكم (٢/٢٧) والسياق له وابن ماجه وأحمد (٢/٧٠-٨٢) من طريقين عن ابن عمر ، والأول صحيح كما قال الحاكم ووافقه الذهبي ، والثاني حسن كما قال المنذري (٣/٣٤) ، ورواه الطبراني في الكبير بلفظ : " الدين دينان ، فمن مات وهو ينوي قضاءه فأنا وليه ، ومن مات وهو لا ينوي قضاءه ، فذاك الذي يؤخذ من حسناته ، ليس يومئذ دينار ولا درهم " وهو حديث صحيح بما قبله ، وبحديث عائشة التي في آخر المسألة ( ١٧ ) .

واتە : قەرز دوو جۆرە : هەر کەسێك بمرێت و لە نیەتیدا هەبێت قەرزەکانی بداتەوە ئەوا من پشتیوانیم لە دوا ڕۆژیدا ، بەڵام ئەو کەسەی کە بمرێت و لە نیەتیدا نەبێت کە قەرزەکانی بداتەوە ، ئەوا ئەو کەسەیە کە چاکەکانی دەبرێت لە ڕۆژی دواییدا ، ڕۆژێك کە هیچ دینار و درهەمێك نیە .

[١٤] أخرجه البخاري .

واتە : كە جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە شەو بوو باوكم بانگی كردم و فەرمووی : وا بزانم لەو كەسانە ئەبم كە یەكەم كەس دەكوژرێم لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ منیش لە تۆ عەزیز ترم نیە دوای خۆم بەجێی بهێڵم جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ جا كوڕم بزانە قەرزێكم لە سەرە هەوڵی دانەوەی بدە و چاوت لە خوشكەكانت بێت بە چاكی دەڵێت : كە ڕۆژمان كردەوە یەكەم كەس بوو كە كوژرا ... هتد .

٥ - وە پێویستە پەلە بكرێت لە كردنی ئەو وەسێتە لە بەر ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی : " ما حق لامرئ مسلم يبيت ليلتين وله شيء يريد أن يوصي فيه إلا ووصيته مكتوبة عند رأسه " [١٥] ، واتە : ڕەوا نیە بۆ هیچ كەسێكی موسڵمان دوو شەوی بەسەردا بێت و وەشتێكی هەبێت بۆ ئەوەی وەسێتی پێبكات ئیللا وەسێتەكەی نووسرابێت ولە ژێر سەریدا بێت .

( عبدالله ) ی كوڕی ( عمر ) ﷺ فەرموویەتی : (( ما مرت علي ليلة منذ سمعت رسول الله ﷺ قال ذلك إلا وعندي وصيتي )) [١٦] ، واتە : شەوێكم بە سەردا نەهاتووە لەو كاتەوە كە ئەوەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوە ئیللا وەسێتەكەم لە لا بووە .

٦ - وە پێویستە لە وەسێتەكەیدا وەسێت بكات بۆ ئەو خزمانەی كە میرات گری نین ، واتە میراتیان بەر ناكەوێت ، ئەوەش لە بەر ووتەی خوای بڵند و پایە بەرز : ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ ( البقرة : ١٨٠ ) .

واتە : ئەی موسڵمانان ئەگەر مردنی یەكێكتان نزیك بووەوە ، ئەوەش بە دەركەوتنی نیشانە ، و بەڵگەكانی ، و لە دوای خۆی ماڵ و سامانێكی بەجێ هێشت بوو ، ئەوا با وەسێت بكات بەوەی كە بەشی باوك و دایك و كەس و كاری بدرێت ، ئەوەش واجبە و پێویستە لە سەرتان .

٧ - وە ڕەواشە بۆی كە سێ یەكی داراییەكەی بكات بە خێر لە وەسێتەكەیدا و بۆی نیە زیاد لەوە بكات بە خێر بەڵكو چاكترە لەوە كەمتر بێت لە بەر فەرموودەی ( سعد ) ی كوڕی ( أبي وقاص ) ﷺ كە دەفەرموێت : " كنت مع رسول الله ﷺ في حجة الوداع فمرضت مرضا أشفيت منه على الموت ،

[١٥] ( متفق عليه ) .

[١٦] رواه الشيخان وأصحاب السنن وغيرهم .

فعادني رسول الله ﷺ فقلت : يا رسول الله إن لي مالا كثيرا ، وليس يرثني إلا ابنة لي ، أفأوصي بثلثي مالي ؟ قال : لا . قال : قلت : بشطر مالي ؟ قال : لا . قلت : فثلث مالي ؟ قال : الثلث ، والثلث كثير ، إنك يا سعد ! أن تدع ورثتك أغنياء خير لك من أن تدعهم عالة يتكففون الناس ( وقال بيده ) ، إنك يا سعد لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله تعالى إلا أجرت عليها ، حتى اللقمة تجعلها في فيّ امرأتك . ( قال : فكان بعد الثلث جائزا ) " [١٧] .

واتە : لە گەڵ پێغەمبەری خوادا بووم ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا ، تووشی نەخۆشیەك بووم نزیك بوو بمرم ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو کاتە سەردانی کردم ، و پێم وت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵێکی زۆرم هەیە ، و جگە لە کچێکیش کەسی تر میرات گرم نیە ، ئایا دوو لە سێی ماڵەکەم بکەم لە ڕێی خوای پەروەردگار ؟ فەرمووی : نەخێر ، دەڵێت ، ووتم : ئەی نیوەی بکەم ؟ دیسان فەرمووی : نەخێر ، دەڵێت ووتم : ئەی سێ یەکێکی ؟ فەرمووی : بەڵی سێ یەکێکی ، بەڵام سێ یەکیش هەر زۆرە ، تۆ ئەی ( سعد ) ! ئەگەر میرات گرانت بە دەوڵەمەندی لە دوای خۆت بەجێ بهێڵیت ، باشترە بۆت لە دوای خۆت بە هەژاری بەجێیان بهێڵیت ، دەست لە خەڵك پان بکەنەوە ، و ( دەستیشی پان دەکردەوە ) ، تۆ ئەی ( سعد ) ! تۆ هەر بژێویەکی ماڵەکەت کردبێت ، لە بەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار ئیللا پاداشت دەدرێیتەوە لە سەری ، تەنانەت ئەو پارووەش کە دەیکەیت بە دەمی خێزانەکەتەوە ئەوەشت هەر بە چاکە بۆ دەنووسرێت ، و پاداشت دەدرێیتەوە لە سەری ( فەرمووی : دوای ئەوە سێ یەك بە دواوە بو بە ڕەوا ) .

وە ( عبدالله ) ی کوڕی ( عباس ) ﷺ فەرموویەتی : " وددت أن الناس غضوا من الثلث إلى الربع في الوصية ، لأن النبي ﷺ قال : الثلث كثير " [١٨] .

واتە : حەزم دەکرد خەڵکی وازیان بهێنایە لە سێیەك بۆ چواریەك ( چارەك ) لە بەخشینی میراتەکەیان لە کاتی وەسێت کردندا ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " الثلث كثير " واتە : سێیەك زۆرە " .

٨ ـ وە دوو موسڵمانی عادل بکات بە شایەت لە سەر ئەو وەسێتەی ، ئەگەر نەبوون ، ئەوا دوو کەسی غەیرە دین ، بەمەرجێ متمانەیان بکرێتە سەر لە کاتی گوماندا ، هەروەکو ئەوەی کە لە وتەی خوای پەروەردگاردا ڕوونکراوەتەوە : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلاَةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لاَ نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَلاَ نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللّهِ إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الآثِمِينَ فَإِنْ عُثِرَ

---

[١٧] اخرجه أحمد ( ١٥٢٤ ) والسياق له والشيخان والزيادتان لمسلم وأصحاب السنن .

[١٨] اخرجه أحمد (٢٠٢٩، ٢٠٧٦) والشيخان والبيهقي (٢٦٩/٦) وغيرهم .

عَلَى أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا [19] فَآخَرَانِ يِقُومَانُ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يَأْتُواْ بِالشَّهَادَةِ عَلَى وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُواْ أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ وَاتَّقُوا اللّهَ وَاسْمَعُواْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴾ ( سورة المائدة : ١٠٦ ــ ١٠٨ ) .

**٩ ـ بەڵام سەبارەت بە وەسیێت كردن بۆ باوك و دایك ( الوالدان ) و كەس و كاری ( الأقربون ) ئەوانەی كە میراتیان بەر دەكەوێت ، نابێت بكرێت ، چونكە حوكمەكەی هەڵگیراوە ، و نەماوە ( واتە : منسوخة ) بەو ئایەتەی كە باسی میراتگری دەكات ، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بە باشترین شێوە ئەوەی ڕوون كردووەتەوە لە ووتاری حەجی ماڵئاوایدا ، كە فەرموویەتی : " إن الله قد أعطى كل ذي حق حقه ، فلا وصية لوارث " [20] .**

**واتە : خوای پەروەردگار بەش و مافی هەموو خاوەن بەشێكی داوە ، بۆیە بۆ میرات گری پێویست بە وەسیێت ناكات .**

**١٠ ـ زیان و زەرەر گەیاندنیش لە وەسیێتدا ، وەك ئەوەی كە وەسیێت بكات كە هەندێك لە میرات گرانی لە مافی خۆیان بێ بەش بكات لە مافیان لە میراتەكە ، یان بەشی هەندێكیان زیاتر بكات لە بەشی ئەوانی تر ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی :** ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ ... مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ... ﴾ ( سورة النساء : ٦ ــ ١٢ ) ، **وە لە دواییەكەیاندا فەرموویەتی :** ﴿ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾ .

**وە لە بەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " لا ضرر ، من ضار ضاره الله ، ومن شاقه الله " [21] ، واتە : زیان و زەرەر گەیاندن دروست نیە ، جا هەر كەسێك زیان و زەرەر بە كەسێك**

---

[19] أي فإن اتفق الاطلاع على أن الشاهدين المقسمين استحقا إثما بالكذب والكتمان في الشهادة ، أو بالخيانة وكتمان شئ من التركة في حالة ائتمانهما عليها فالواجب ، أو فالذي يعمل لاحقاق الحق هو أن ترد اليمين إلى الورثة بأن يقوم رجلان آخران مقامهما من أولياء الميت الوارثين له ، الذين استحق ذلك الاثم بالاجرام عليهم ، والخيانة لهم . كذا في " تفسير المنار " ، وراجع تمام البحث فيه ( ٧ / ٢٢٢ ) .

[20] أخرجه أبو داود والترمذي وحسنه والبيهقي (٦ / ٢٦٤) وأشار لتقويته ، وقد أصاب ، فإن إسناده حسن ، وله شواهد كثيرة عند البيهقي و " مجمع الزوائد "( ٤ / ٢١٢) " .

فالناسخ إنما هو القرآن ، والسنة إنما هي مبينة لذلك كما ذكرنا ، وكما هو واضح من خطبته ﷺ خلافا لما يظنه كثيرون أن الحديث هو الناسخ ، ثم استغل ذلك بعض المعاصرين فزعموا أن حديث الاحاد ينسخ القرآن فقد عرفت الجواب ، وهو أن الناسخ إنما هو القرآن ، ولو سلمنا أن الناسخ إنما هو الحديث ، فهو صالح للنسخ اتفاقا ، لان العلماء جميعا تلقوه بالقبول . على أنه حديث متواتر ، كما يعلم ذلك من وقف على طرقه الكثيرة المبثوثة في دواوين السنة ومسانيدها . ولعلنا نوفق لا ستخراجها وتحقيق الكلام عليها في جزء مفرد ... ثم جمعت طرقه وخرجتها في ( إرواء الغليل ، رقم : ١٦ ) فجاوزت طرقه العشرة ، عن ثمانية من الصحابة بعضها صحيح وبعضها حسن وبعضها منجبر الضعف .

[21] أخرجه الدار قطني (٥٢٢) والحاكم (٢/٥٧– ٥٨) عن أبي سعيد الخدري ، ووافق الذهبي الحاكم : على قوله " صحيح على شرط

بگەیەنێت ، خوای پەروەردگار زەرەر و زیانی پێدەگەیەنێت ، وە ئەو کەسەش کە مەشەقەت و ناڕەحەتی بخاتە سەر کەسێك ، خوای پەروەردگار مەشەقەت و ناڕەحتی و دەخاتە سەر .

١١ ـ ئەو وەسێتەش کە زوڵم و ستەمی تێدا بێت ، پوچەڵە و ڕەتکراوەیە ، لە بەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : " من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد " [٢٢] ، واتە : ئەو کەسەی کە تازەگەری و بیدعەیەك لە ئاینەکەی ئێمەدا بهێنێتە کایەوە ، بە ڕووی خاوەنەکەیدا دەدرێتەوە ، و ڕەت دەکرێتەوە .

وە لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە ( عمران ) ی کوڕی ( حصين ) ﷺ دەیگێڕێتەوە کە : " أن رجلا أعتق عند موته ستة رجلة [٢٣] ، فجاء ورثته من الاعراب ، فأخبروا رسول الله ﷺ بما صنع ، قال : أو فعل ذلك !؟ قال : لو علمنا ـ إن شاء الله ـ ما صلينا عليه ، قال : فأقرع بينهم ، فأعتق منهم اثنين ، ورد أربعة في الرق " [٢٤] ، واتە : پیاوێك لە سەرە مەرگیدا شەش کۆیلەی لە کویلەکانی ئازاد دەکات کە هەموو پیاو دەبن ، پاشان میرات گرانی کە کەسانێکی دەشتەکی بوون هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، و هەواڵی ئەو کارەیان پێ ڕاگەیاند ، ئەویش فەرمووی : ئایا ئەوەی کردووە ؟ وتیان بەڵێ ، ئەگەر ئاگاداری ببوایەین . بە ویستی خوای پەروەردگار . نوێژمان لە سەر نەدەکرد ، دەڵێت : پێغەمبەری خواش ﷺ تیروپشکی لە نێوان کردن ، و دووانی لێ ئازاد کردن ، و چواریانی گەڕانەوە بۆ کۆیلایەتی .

١٢ ـ وە لە بەر ئەوەی کە کاری زۆرینەی خەڵك لەم سەردەمانەدا تازەگەری و بیدعە کردنە لە ئاینەکەیان بە گشتی ، و بەتایبەت لەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە جەنازەوە ، یەکێك لەو پێویستانە ئەوەیە کە موسڵمان وەسێت بکات بەوەی کە بەڕێکردن و بەخاك سپاردنەکەی بە پێی سوننەت بێت ، ئەوەش کردەوە کردنە بە وتەی خوای پەروەردگار کە فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ ( سورة التحريم : ٦ ) .

لە بەر ئەوەیە دەبینین هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسێتیان بەو شتە دەکرد ، وە

---

مسلم " والحق أنه حديث حسن كما قال النووي في " الاربعين " وابن تيمية في " الفتاوى "( ٢٦٢/٣) لطرقه وشواهده الكثيرة ،وقد ذكرها الحافظ ابن رجب في" شرح الاربعين" (ص ٢٢٠،٢١٩) ثم خرجتها في " إرواء الغليل " رقم ٨٨٨) .

[٢٢] أخرجه الشيخان في " صحيحيهما " وأحمد وغيرهم .

[٢٣] کۆی ( رجل ) ە .

[٢٤] أخرجه أحمد (٤٤٦/٤) ومسلم بنحوه وكذا الطحاوي والبيهقي وغيرهم .

شوێنەواریان لەو باسەی كە كردوومانە زۆرە ، لێرەشدا هەندێكی باس دەكەین :

أ ـ لە ( عامر ) ی كوڕی ( سعد ) ی كوڕی ( أبي وقاص ) ﷺ دەگێڕێتەوە كە باوكی لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا فەرمووی : " ألحدوا لي لحدا ، وانصبوا علي اللبن نصبا ، كما صنع برسول الله ﷺ " [٢٥] .

واتە : لە كاتی بەخاك سپاردنم ئەڵحەدێكم بۆ دروست بكەن ، و خشتەكانم بە جوانی لە سەر ریز بكەن ، هەروەكو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام درا .

ب ـ لە ( أبو بردة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أوصى أبو موسى ﷺ حين حضره الموت قال : إذا انطلقتم بجنازتي فأسرعوا بي المشي ، ولا تتبعوني بمجمر ، ولا تجعلن على لحدي شيئا يحول بيني وبين التراب ، ولا تجعلن على قبري بناء ، وأشهدكم أني برئ من كل حالقة أو سالقة أو خارقة ، قالوا سمعت فيه شيئا ؟ قال : نعم ، من رسول الله ﷺ " [٢٦] .

واتە : ( أبو موسى ) ﷺ لە كاتی سەرەمەرگیدا وەسیەتی بەوە كرد ، و فەرمووی : ئەگەر تەرمەكەمتان بە ڕێكرد ، ئەوا بە پەلە تەرمەكەم ببەن ، ئاگر و ئاگردانم بە دوادا نەبەن ، و هیچ شتێك لە سەر ئەڵحەدەكەم دامەنەن ببێت بە ڕێگر لە نێوان من و خۆڵدا ، بیناش لە سەر گۆڕەكەم درووست مەكەن ، و ئێوەش شایت بن كە من بێ بەریم لە هەموو ئەو ئافرەتانەی كە پرچیان دەڕنن لە كاتی مردنی كەسێكیان ، و ئەوانەش كە لە ڕوومەتیان دەدەن و دەیڕوشێنن ، وە ئەوانەش كە یەخە و كراسەكەنیان دادەدڕن ، پێیان ووت شتێكت لەو بارەیەوە بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ؟ ئەویش ووتی : بەڵی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە .

ج ـ لە ( حذيفة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " إذا أنا مت فلا تؤذنوا بي أحدا ، فإني أخاف أن يكون نعيا ، وإني سمعت رسول الله ﷺ ينهي عن النعي " [٢٧] .

واتە : ئەگەر من مردم كەس ئاگادار مەكەن بە مردنم ، چونكە دەترسم بڕواتە بابی نەعیەوە ، چونكە لە پێغەمبەری خواوە بیستوومە نەهی دەكرد لە نەعی كردن .

لە بەر هەموو ئەوانە كە لە پێشدا باس كران پێشەوا ( النووي ) ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت . لە كتێبی ( الأذكار ) دا فەرموویەتی : (( ويستحب له استحبابا مؤكدا أن يوصيهم باجتناب ما جرت العادة به من البدع في الجنائز ويؤكد العهد بذلك )) .

---

[٢٥] أخرجه مسلم والبيهقي (٣/ ٤٠٧ ) وغيرهما .

[٢٦] أخرجه أحمد (٤/٣٩٧) والبيهقي (٣/٣٩٥) بهذا التمام ، وابن ماجه بسند حسن .

[٢٧] أخرجه الترمذي (٢/ ١٢٩) وقال : " حديث حسن "، ورواه غيره بنحوه وسيأتي في (النعي) وفي الباب آثار أخرى تأتي في المسألة (٤٧) .

واتـە : سـوننەتە . سـوننەتێكی جـەخت لـە سـەر كـراو . بۆ موسـڵمان كـە وەسـێت بكـات بـە دووركەوەتنـەوە لـە هـەموو ئـەو بیدعـە و تازەگەریانـەی كـە بوونەتـە داب و نـەریتی خـەڵك لـە كـاتی بەڕێكردن و مەراسیمی جەنازەدا ، وە زوو بە زووش ئەوەیان بیر بخاتەوە و تازەی بكاتەوە .

## ( ٢ ) تەلقین كردن لە سەرە مەرگدا ( تلقين المحتضر ) :

١٣ـ ئەگەر كاتی سەرەمەرگی بوو ، ئەوا پێویستە لە سەر ئامادەبووان لە لایدا بەم كارانە هەستن :

أ ـ هەوڵی لە گەڵدا بدەن كە شایەتوومان بهێنێت ، واتە : تەلقین بكرێت بەو وشـەیە ، ئـەوەش لە بەر فەمووودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " لقنوا موتاكم ( بــ ) ( لا إله إلا الله ) ، مـــن كان آخر كلامه ( لا إله إلا الله ) عند الموت دخل الجنة يوما من الدهر ، وإن أصابه قبل ذلك ما أصابه " واتە : ئەریٚ ئەوەی كە مردووە موسڵمان نیە ؟ ، هـەوڵ بـدەن لـە گـەڵ ئـەو كەسـانەی كـە لـە سـەرەمەرگدان بڵێت : ( لا إله إلا الله ) ، چونكە ئەو كەسەی دوا وتەی ( لا إله إلا الله ) بێت لە كـاتی مردنـدا دەڕواتـە بەهەشتەوە ، ڕۆژێك لە ڕۆژان ، با پێش ئەوەش هەرچیەكی تووش بێت . وە دەیفەرموو : " من مات وهو يعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة " واتە : ئەو كەسەی بمرێت و بزانێت كە ( لا إله إلا الله ) دەڕواتـە بەهەشتەوە ، وە لە فەرموودەیـەكی تـردا هـاتووە : " من مات لا يشرك بالله شيئا دخل الجنة "[٢٨] ، ئـەو كەسەی بمرێت و هیچ هاوەڵێك بۆ خوای پەروەردگار بڕیار نەدات دەڕواتە بەهەشتەوە .

ب ، ج ـ دوعای خێری بۆ بكەن ، لە كاتی ئامادەبوونیان لە لایدا جگە لە وتـەی چاك هیـچی تـر نـەڵێن ، ئـەوەش لـە بـەر فـەرموودەی ( أم ســـلمة ) كـە بۆمـان دەگێڕێتـەوە كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی : " إذا حضرتم المريض أو الميت فقولوا خيرا فإن الملائكة يؤمنون على ما تقولون "[٢٩] .

واتە : ئەگەر لە سەرمەرگی كەسێك یان لە كاتی مردنیدا ئامادە بوون ، ئەوا وتەی چاك بڵێن ، چونكە فریشتەكانی خوای پەروەردگار هەرچی بڵێن ئامینی لە سەر دەكەن .

١٤ ـ تـەلقین كـردن بریتـی نیـە لـە شـایەتومان هێنـان لـە ئامـادە بـوونی ئـەودا ، بەشێوەیەك بۆ ئەوەی كە ئەو گوێی لێ بێت ، بەڵكو بریتیە لە فەرمان پێكردنی بە ووتنـی ئـەو وشـەیە ( لا إله إلا الله ) ،

---

[٢٨] أخرجها مسلم في صحيحه ، والزيادة في الحديث الاول عند ابن حبان (٧١٩ موارد ) . ولها شاهد من حديث معاذ بن جبل ، وسنده حسن كما بينته في " إرواء الغليل " ( ٦٧٩ ) وسيأتي لفظه في علامات حسن الخاتمة " المسألة ٢٥ " .

[٢٩] أخرجه مسلم والبيهقي ( ٣ / ٣٨٤ ) وغيرهما .

بـە پێـچەوانەی گومـانی هەنـدێك كـە وا دەڵـێن ، بەڵگـەش ئـەو فەرموودەیەیـە كـە ( أنـــس ) ﷺ دەیگێڕێتەوە كـە : " أن رسول الله ﷺ عاد رجلا من الانصار فقال : يا خال ! قل : لا إلـه إلا الله فقـال : أخال أم عم ؟ فقال : بل خال ، فقال : فخير لي أن أقول : لا إله إلا الله ؟ فقال النبي ﷺ : نعم " [٣٠] .

واتـە : پێغەمبـەری خـوا ﷺ جارێكیـان سـەردانی پیاویـك لـە پشتیوانان دەكـات ، و پـێی دەفەرمووێت : ئەی خاڵۆ! ( لا إله إلا الله ) بڵـێ ، ئەویش ووتی : خاڵۆ یان مامە ؟ ئەویش فەرمووی : بەڵكو خـاڵۆ ، ئـەویش ووتـی : ئەگـەر بڵـێم ( لا إلـه إلا الله ) سـودم پـێ دەگەیـەنێت ؟ پێغەمبـەری خواش ﷺ فەرمووی : بەڵێ .

١٥ ـ بەڵام سەبارەت بە خوێندنەوەی سورەتی ( یـس ) لەلایـدا ، و ڕوو كردنـی لـە قیبلـە ، هـیچ فەرموودەیەكی ( صحيح ) مـان پێنەگەیشتووە لـەو بارەیـەوە ، بـەڵكو ( سعيد ) ی كوڕی ( المسيب ) ڕووكردنی مردووی پێ ناخۆش بوو ، و دەیفەرموو : (( أليس الميت امرأ مسلما !؟ )) ، واتە : ، وە لـە ( زرعة ) ی كـوڕی ( عبد الرحمن ) ەوە دەگێڕنـەوە كـە : (( أنه شهد سعيد بن المسيب في مرضه وعنده أبـو سلمة بن عبد الرحمن فغشي على سعيد فأمر أبو سلمة أن يحول فراشه إلى الكعبة . فأفاق فقال : حولتم فراشي !؟ فقالوا نعم فنظر إلى أبي سلمة فقال : أراه بعلمك [٣١] ؟ فقال : أنا أمرهم ! فأمر سعيد أن يعاد فراشه )) [٣٢] .

واتـە : ئامـادەی سەرەمەرگی ( سـعيد ) ی كـوڕی ( المسيب ) بـووم ، ( أبـو سـلمة ) ی كـوڕی ( عبد الرحمن ) لە لا ئامادە بوو ، ( سعيد ) بێ هـۆش كـەوت ، ( أبو سلمة ) ەش فـەرمانی پـێ كردن كە جێگەكەی ڕوو بكرێت لە قیبلە ( الكعبة ) ، ( سعيد ) هاتەوە هۆش ، و ووتی : جێگەكەمتان ڕوو كردووە لە قیبلە ؟! وتیان بەڵێ ، سەیری ( أبو سلمة ) ەی كرد و وتـی : وادەبینم بە زانینـی تـۆ بێت ؟ وتـی : بـەڵێ من فرمـانم پێكـردن ! ( سـعيد ) یـش فـەرمانی پێكـردن بـەوەی كـە جێگەكـەی بگەڕێننەوە شوێنی خۆی .

١٦ ـ وە هیچی تێدا نیە ئەگـەر موسڵمان ئامـادەی سـەرەمەرگ و مردنـی بـێ بـاوەڕ ببـێ ، بـۆ ئەوەی ئیسلامی بۆ بخاتە ڕوو ، بەڵكو موسڵمان ببێت ، ئەوەش لە بەر ئەو فەرموودەیـەی كـە ( أنس ) بۆمـان دەگێڕێتـەوە كـە : " كان غلام يهودي يخدم النبي ﷺ ، فمرض فأتاه النبي ﷺ يعوده ، فقعد عنـد رأسه ، فقال له : أسلم ، فنظر إلى أبيه وهو عنده ؟ فقال له أطع أبا القاسم ﷺ ، فأسلم فخـرج الـنبي ﷺ

---

[٣٠] اخرجه الامام أحمد ( ٣ / ١٥٢ ، ١٥٤ ، ٢٦٨ ) بإسناد صحيح على شرط مسلم .

[٣١] الأصل : ( علمك ) ولعل الصواب ما أثبتنا .

[٣٢] إخرجه ابن أبي شيبة في " المصنف " ( ٤ / ٧٦ ) بسند صحيح عن زرعة .

وهو يقول : الحمد لله الذي أنقذه من النار ، ( فلما مات قال : صلوا على صاحبكم ) " (٣٣) .

واتە : لاوێکی جولەکە هەبوو خزمەتکاری پێغەمبەری خوای دەکرد ﷺ ، نەخۆش دەکەوێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕوات بۆ سەردانی ، و لە لای سەریەوە دادەنیشێت ، و پێی دەفەرمووێت : موسڵمان بە ، ئەویش سەیری باوکی کرد کە لە لای دانیشتبوو ؟ ئەویش پێی وت گوێڕایەڵی باوکی قاسم بکە ، ئەویش موسڵمان بوو ، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆشتە دەرەوە و فەرمووی : شوکر و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کە لە دۆزەخ ڕزگاری کرد ، ( کە لاوەکە مرد پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو : نوێژ بکەن لە سەر هاوەڵەکەتان ) .

## ( ٣ ) چی لەسەر ئامادەبوانە لەدوای مردنی ؟
## ( ما على الحاضرين بعد موته ؟ )

١٧ ـ ئەگەر گیانی سپارد و مرد چەند شتێکیان لەسەرە :

أ ـ ب ـ نوقاندنی چاوەکانی ، و دوعای خێر بۆ کردنی ، ئەوەش لە بەر فەرمووەکەی ( أم سلمة ) . ڕەزای خوای لێ بێت . کە دەگێڕێتەوە و دەڵێت : " دخل رسول الله ﷺ على أبي سلمة ، وقد شق بصره ، فأغمضه ، ثم قال : إن الروح إذا قبض تبعه البصر ، فضج ناس من أهله ، فقال : لا تدعوا على أنفسكم إلا بخير ، فان الملائكة يؤمنون على ما تقولون ، ثم قال : اللهم اغفر لأبي سلمة ، وارفع درجته في المهديين ، واخلفه في عقبه في الغابرين ، واغفر لنا وله يا رب العالمين ، وافسح له في قبره ، ونور له فيه " .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای ( أبو سلمة ) کاتی گیان سپاردنی ، و چاوەکانی کرابوونەوە ، چاوەکانی نوقاندن ، و دوای ئەوە فەرمووی : هەرکاتێك گیان لەجەستە دەرچوو ئەوا چاویش بەدوایدا دەڕوانێت ، کۆمەڵە کەسێك لە کەس و کاری ( أبو سلمة ) شڵەژان و کردیان بە هات و هاوار ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموون : دوعا لەخۆتان مەکەن بەخێر نەبێت ، چونکە فریشتەکان ئامین لەسەر دوعاکانتان دەکەن ، دوای ئەوە فەرمووی : واتە : خوایە لە ( أبو سلمة ) خۆش بە ، و لە ناو هیدایەت دراواندا پلەی بەرز بکەرەوە ، و جێگەشی پڕ بکەرەوە بۆ ئەوانەی کە لە دوای بەجێ ماوون ، و لە ئێمەو لە ئەویش خۆش بە ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە ، و ڕووناکی بکەرەوە (٣٤) .

---

(٣٣) أخرجه البخاري والحاكم والبيهقي وأحمد (٣/ ١٧٥،٢٢٧، ٢٦٠، ٢٨٠) والزيادة له في رواية .

(٣٤) أخرجه مسلم ، وأحمد (٦/٢٩٧) ، والبيهقي (٣/٣٣٤) ، وغيرهم .

ج - بە پۆشاكێك كە هـەموو لەشـی بگرێتـەوە داپۆشـرێت ، لـە بـەر فەرموودەکـەی ( عائـشة ) - ڕەزای خـوای لێ بێـت . کە دەفـەرمووێت : " أن رسول الله ﷺ حين توفي سجي ببرد حبرة " [٣٥] ، واتـە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد بە عابایەکی پیاوانەی دروستکراوی یەمەن داپۆشرا .

د - ئەمە بۆ کەسێك لەکاتی ئیحرام پۆشی دا نەبێت ، بەڵام ئەو کەسەی کە پۆشاکی ئیحرامـی لەبەردایە دەم و چاوی داناپۆشرێت ، لە بەر فەرموودەکـەی ( ابن عبـاس ) ﷺ کە دەفـەرموێت : " بينما رجل واقف بعرفة ، إذ وقـع عن راحلته فوقصته ، أو قـال : فاقعصته ، فقـال الـنبي ﷺ : اغـسلوه بمـاء وسدر ، وكفنوه في ثوبين ( وفي رواية : في ثوبيه ) ولا تحنطوه ( وفي رواية : ولا تطيبوه ) ولا تخمروا رأسه ( ولا وجهه ) ، فـإنه يبعث يوم القيامة ملبيا " [٣٦] .

واتـە : جارێکیـان پیاوێـك لەسـەر کێـوی عەرەفـە ڕادەوەسـتێت ، لەسـەر وڵاخەکـەی دەکەوێتـە خـوارەوە و ملـی دەشـکێت ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فـەرمووی : بـە ئـاو و سـیدر بیشـۆن ، لـە دوو کراسدا کفنی بکەن ( وە لە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە : بـە دوو کراسـەکەی خـۆی کفنـی بکـەن ) ، و کراسەکان بۆن خۆش مەکەن ( وە لە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە : بۆنی خۆشـی بەسـەردا مەکـەن ) ، نەسـەر و نەڕوومەتیـشی دامەپۆشـن ، چـونکە لـە کـاتی زیندووبونەوەیـدا بـە تەلبیەیـەوە زینـدوو دەکرێتەوە ( واتە : لبيك اللهم لبيك ... هتد دەکات ) .

هـ - ئەگـەر مردنـی ئاشـکرا بـوو ، ئـەوا پەلـە بکرێـت لـە شـۆردن و کفـن و ناشـتنی ، لەبـەر فەرموودەکەی ( أبو هريرة ) ﷺ کە دەیداتـە پـاڵ پێغەمبـەر ﷺ ( واتـە : مرفوعا ) کە فەرمویـەتی : " أسرعوا بالجنازة " ، واتە : پەلە بکەن لە بەڕێکردنی جەنازەدا .

درێژەی ئەم فەرموودەیە لە بەشی ( ٤٧ ) دا بەتەواوی باسی لێوە دەکرێت .

هەر لەم بابەتەدا دوو فەرموودەی تر هەن کە لەم فەرموودەیە ڕوون و ئاشکرا ترن ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەردووکیان ( ضعيف ) ن ، نەمان کردوون بە بەڵگە ، و نەمانهێناونەتەوە [٣٧] .

---

[٣٥] أخرجه الشيخان في صحيحيهما والبيهقي ( ٣/ ٣٨٥ ) وغيرهم .

[٣٦] أخرجه الشيخان في صحيحيهما ، وأبو نعيم في (المستخرج: ق ١٣٩ـــ١٤٠) ، والبيهقي (٣/٣٩٠) ، وليست الزيادة عند البخاري .

[٣٧] أما الحديث الاول فهو عن ابن عمر مرفوعا ولفظه : " إذا مات أحدكم فلا تحبسوه ، وأسرعوا به إلى قبره ، وليقرأ رأسه بفاتحة البقرة ، رجليه بخاتمتها " أخرجه الطبراني " المعجم الكبير " ( ٣ / ٢٠٨ / ٢ ) والخلال في " القراءة عند القبود ، " ( ق ٢٥ / ٢ ) من طريق يحي بـن عبد الله بن الضحاك البابلي ثنا أيوب بن نهيك الحلبي الزهري ـــ مولى آل سعد بن أبي وقاص ـــ قال : سمعت عطاء بن أبي رباح المكي قـال : سمعت ابن عمر قال : فذكره . قلت : وهذا سند ضعيف وله علتان :

الاول : البابلتي ـــ ضعيف كما قال الحافظ في " التقريب " .

الثانية : شيخه أيوب بن نهيك ، فانه أشد ضعفا منه ، ضعفه أبو حاتم وغيره ، وقال الازدي : متروك . وقال أبو زرعة : منكر الحـديث .

و ـ هەر لەو شوێنەی كە مردووە بنێـژرێت ، و نەگوێزرێتـەوە بـۆ شـوێنێكی تـر ، چـونكە پێچەوانەی ئەو پەلەكردنەیە كە لە فەرموودەكەی پێشووی ( أبو هريرة ) ﷺ فەرمانی پـێ هاتبوو ، وە لە هاوشێوەكانی وەك فەرموودەی ( جابر ) ی كوڕی ( عبدالله ) ﷺ كە دەفەرموێت : " لما كان يوم أحد ، حمل القتلى ليدفنوا بالبقيع ، فنادى منادي رسول الله ﷺ : إن رسول الله ﷺ يأمركم أن تدفنوا القتلـى في مضاجعهم ــ بعدما حملت أمي أبي وخالي عديلين [٣٨] ( وفي رواية : عادلتهما ) ( على ناضح ) لتدفنـهم في البقيع ــ فردوا ( وفي رواية قال : فرجعناهما مع القتلى حيث قتلت ) " [٣٩] .

واتە : لـە شـەڕی ( أحـد ) دا بـوو كوژراوەكـان هـەڵگیران بـۆ ئـەوەی لـە گۆڕستـانی ( بقيـع ) دا بنێـژرێن ، لەوكاتـەدا جـاڕدەری پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـانگی كـردوو وتـی : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمانتان پێ دەكات كە كوژراوەكان لە شوێنی خۆیان بنێژرێن ، ئەمە دوای ئەوەی كە دایكم باوك و خاڵمی لە ئەم دیوو ئەو دیوی وشترێكدا بەستبوو بۆ ئەوەی بیانبـات لـە ( بقيـع ) بیاننێـژێت ، گەڕاندماننەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ كوژراوەكانی تردا بنێژرێن .

لەبەر ئەمەیە ( عائشة ) . ڕەزای خوای لێ بێت . كاتێك كە برایـەكی لـە ( وادي الحبشة ) دەمرێت و دەیگوێزنەوە لەشوێنەكەی خۆی ، دەفەرموێت : " ما أجد في نفسي ، أو يحزني في نفسي إلا أني وددت أنه كان دفن في مكانه " [٤٠] ، واتە : هیچم لە دڵدا نییە ، یان هیچ دڵتەنگی نەكردووم ، جگە لەوە نەبێت

---

وساق له الحافظ في " اللسان " حديثا آخر ظاهر النكاره من طريق يحيى بن عبد الله ثنا أيوب عن مجاهد عن ابن عمر مرفوعا . ثم قال : " ويحي ضعيف ، لكنه لا يحتمل هذا " ثم قال : ! فإذا عرفت هذا فالعجب من الحافظ حيث قال في " الفتح " ( ٣ / ١٤٣ ) في حديث الطبراني هذا : " إسناده حسن " ! ونقله عنه الشوكاني في " نيل الاوطار " ( ٣ / ٣٠٩ ) وقره ! وأما الهيثمي فقال " المجمع " ( ٣ / ٤٤ ) . " رواه الطبراني في الكبير ، وفيه يحيى بن عبد الله البابلتي وهو ضعيف " . وفاته أن فيه أيوب بن نهيك وهو شرمنه كما سبق . وأما الحديث الثاني فهو عن حـصين بن وحوح : " أن طلحة بن البراء مرض ، فأتاه النبي ﷺ يعوده ، فقال : إني لا أرى طلحة إلا قد حدث به الموت ، فآذنوني به حـتى أشـهده فأصلي عليه ، وعجلوه ، فانه لا ينبغي لجيفة مسلم أن تحبس بين ظهراني أهله " .

أخرجه أبو داود والبيهقي ( ٣ / ٣٨٦ ــ ٣٨٧ ) ، وفيه عروة ــ ويقال عزرة ــ ابن سعيد الانصاري عن أبيه ، وكلاهما مجهول كما قال الحافظ في " التقريب " . ثم إن الاستدلال بحديث أبي هريرة على ما ذكرنا إنما هو بناء على أن المراد بـ ( أسرعوا ) الاسراع بتجهيزها ، وأمـا على القول بأن المراد الاسراع بحملها إلى قبرها ، فلا يتم الاستلال به . وهذا القول هو الذي استظهره القرطبي ثم النووي ، وقوى الحافظ القول الاول بالحديثين اللذين تكلمنا عنهما آنفا ، ولا يخفى ما فيه .

[٣٨] أي شددهما على جنبتي البعير ، كالعديلين .

[٣٩] أخرجه أصحاب السنن الاربعة وابن حبان في صحيحه (١٩٦- موارد) والرواية الاخرى لـه وأحمـد (٣/٢٩٧-٣٨٠) والبيهقـي (٥٧/٤) بإسناد صحيح وقال الترمذي : "حديث حسن صحيح " والزيادة لاحمد في رواية يأتي لفظها في المسألة الفصل(٨٠) .

[٤٠] أخرجه البيهقي بسند صحيح .

قال النووي في " الاذكار " : " وإذا أوصى بأن ينقل إلى بلد آخر لا تنفذ وصيته ، فان النقل حرام على المذهب الصحيح المختار الذي قاله

كە حەزم دەكرد لەو شوێنەی كە مردووە هەر لەو شوێنە بنێژرابایە .

ز ـ دەبێت هەندێكیان پەلە بكەن لە دانەوەی قەرزەكانی لە پارەو ماڵی مردووەكە خۆی ، ئەگەر قەرزەكە ئەوەندەش بێت كە هەموو ماڵەكەی تەواو بكات ، بەڵام ئەگەر پارە و ماڵی نەبوو ، ئەوا لەسەر دەوڵەتە قەرزەكانی بۆ ببژێرێت ئەگەر هەوڵی دابوو بۆ دانەوەی ئەو قەرزانە بەڵام پێی نەدرابێتەوە ، و ئەگەر دەوڵەت ئەو قەرزانەی نەبژارد ، ئەوا هەركەسێكی تر لەجیاتی ئەودا دەتوانێت قەرزەكان بداتەوە ، وە لەم بارەیەشەوە چەند فەرموودەیەك هەن :

یەكەم : لە ( سعد ) ی كوڕی ( الأطول ) ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أن أخاه مات وتـرك ثلاثمائة درهم ، وترك عيالا ، قال : فأردت أن أنفقها على عياله ، قال : فقال لي النبي ﷺ : إن أخاك محبـوس بدينه ( فاذهب ) فاقض عنه ، ( فذهبت فقضيت عنه ثم جئت ) ، قلت : يارسول الله قد قضيت عنه إلا دينارين ادعتهما امرأة وليست لها بينة ، قال أعطها فإنها محقة ( وفي رواية : صادقة ) " [٤١] .

واتە : براكەی مردوو و سێ سەد درهەمی لەپاش خۆی بەجێ هێشت بوو ، و چەند منداڵێكیشی لەپاش خۆی بەجێ هێشت بوو ، دەڵێت : ویستم لەسەر منداڵەكانی خەرجی بكەن ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم : براكەت بەندكراوە بەهۆی قەرزەكانیەوە جا بڕۆ قەرزەكانی بۆ ببژێرە ، منیش ڕۆشتم و قەرزەكانم بۆ بژارد ، و پاشان ڕۆشتم و پێم وت : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو قەرزەكانم بۆ بژاردن ، جگە لە دوو دینار نەبێت كە هی ئافرەتێك بوو كەچی هیچ بەڵگەیەكی نەبوو ، ئەویش فەرمووی : بیدەرێ حەقی خۆیەتی ، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : ئەو ئافرەتە ڕاستگۆیە .

دووەم : لە ( سمرة ) ەی كوڕی ( جندب ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أن النبي ﷺ صلى على جنازة ( وفي رواية : صلى الصبح ) فلما انصرف قال : أههنا من آل فلان أحد ؟ ( فقال رجل : هـو ذا ) قال : فقام رجل يـجر إزاره من مؤخر الناس ( ثلاثا لا يجيبه أحد ) ، ( فقال له النبي ﷺ : ما منعك في المرتين الأولين أن تكون أجبتي ؟ ) أما إني لم أنوه باسمك إلا لخير ، إن فلانا ـ لرجل منهم ـ مأسور بدينه ( عن الجنة ، فان شئتم فافدوه ، وإن فأسلموه إلى عذاب الله ) ، فلو رأيت أهله ومن يتحرون أمره قاموا فقضوا عنه ، ( حتى ما أحد يطلبه بشيء ) " [٤٢] .

---

الاكثرون ، وصرح به المحققون " .

[٤١] اخرجه ابن ماجه (٢/ ٨٢ ) واحمد ( ٤/ ١٣٦ ٥/ ٧ ) والبيهقي (١٠/ ١٤٢) واحد إسناديه صحيح والاخر مثل إسناد ابـن ماجـه وصححه البوصيري في " الزوائد " ! وسياق الحديث والرواية الثانية للبيهقي وهي والزيادات لاحمد في رواية .

[٤٢] اخرجه أبو داود (٢/ ٨٤) والنسائي (٢/٢٣٣) والحاكم (٢/٢٥٢٦) والبهقي (٦/٤/٧٦) والطيالسي في مسنده (رقم ٨٩١٨٩٢)

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازەیەك كرد ( وە لە ڕیوایەتێكدا هاتووە : نوێژی بەیانی كرد ) ، و كە لێ بووەوە ، فەرمووی : ئایا لێرەدا لەبنەماڵەی فلانە كەس كەسێك هەیە ؟ سێ جار ئەو قسەیەی دووبارەكردەوە كەچی كەس وەڵامی نەدایەوە ، تا پیاوێك هەستاو وتی : ئەوە یەكێكە لەوان . دەڵێت : پیاوێك هەستاو كراسەكەی هەڵكردبوو لەپشتی خەڵكەوە بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو : چی وای لێ كردی لەجاری یەكەم و دووەم دا وەڵامم نەدەیتەوە ؟ من بۆ ئیشێكی خێر بانگم لێ كردیت : فلانە كەس . كە یەكێك بوو لە پیاوەكانی بنەماڵەكەی . بەربەست كراوە بە هۆی قەرزەكەیەوە لە چوونە بەهەشت ، ئەگەر دەتانەوێت قەرزەكەی بۆ ببژێرن ، ئەگەر نە دەیدەنە دەستی خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی سزای بدات ، كەس و كارەكەیمان دەبینی بەدوای قەرزەكانی دەگەڕان تاوەكو ئەو قەرزە كە لەسەری بوو بۆیان بژارد ، تاكو هیچ كەسێك نەمایەوە كە قەرزی مابێت بەلایەوە .

**سێیەم :** لە ( جابر ) ی كوڕی ( عبدالله ) ەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " مات رجل فغسلناه وكفناه وحنطناه ، ووضعناه لرسول الله ﷺ حيث توضع الجنائز ـــ عند مقام جبريل ـــ ثم آذنا رسول الله ﷺ بالصلاة عليه ، فجاء معنا ( فتخطى ) خطى ، ثم : قال لعل على صاحبكم دينا ؟ قالوا نعم ديناران ، فتخلف ، ( قال : صلوا على صاحبكم ) ، فقال له رجل منا يقال له أبو قتادة : يا رسول الله هما علي ، فجعل رسول الله ﷺ يقول : هما عليك وفي مالك والميت منهما بريء ؟ فقال : نعم ، فصلى عليه فجعل رسول الله ﷺ ، إذا لقي أبا قتادة يقول : ( وفي رواية ثم لقيه من الغد فقال : ) ما صنعت الديناران ؟ ( قال : يارسول الله إنما مات أمس ) حتى كان آخر ذلك ( وفي الرواية الاخرى : ثم لقيه من الغد فقال : ما فعل الديناران ؟ ) قال : قد قضيتهما يا رسول الله ، قال الان حين بردت عليه جلده " (٤٣) .

واتە : پیاوێك مرد ، و ئێمەش شۆردمان و كفنمان كرد و بۆن خۆشمان كرد ، و ئامادەمان كرد بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەی كە جەنازەی تیادا دادەنرا . لە شوێنێكدا پێی دەووترێت ( مقام

---

وكذا أحمد (٥/١١ ، ١٣٢٠) بعضهم عن الشعبي عن سمرة وبعضهم أدخل بينهما سمعان بن مشنج وعلى الوجه الثاني صحيح فقط .

والرواية الاخرى للمسندين والزيادة الاول والثانية للحاكم وكذا الثالثة والخامسة وللبيهقي الثانية ولاحمد الثالثة والرابعة وللطيالسي الخامسة وله ولاحمد وأبي داود السادسة .

وله شاهد من حديث ابن عباس ، رواه الطبراني في " المعجم الكبير " ( ق ١٥٦ / ٢ ) بسند ضعيف .

(٤٣) أخرجه الحاكم (٢/ ٥٨) والسياق له والبيهقي (٦/٧٤-٧٥) والطيالسي ( ١٦٧٣) وأحمد ( ٣/٣٣٠) بإسناد حسن كما قال الهيثمي (٣/٣٩) وأما الحاكم فقال : " صحيح الاسناد " ! ووافقه الذهبي ! والرواية الاخرى مع الزيادات عندهم جميعا إلا الحاكم إلا الزيادة الثانية فهي للطيالسي وحده .

" الآن حين بردت عليه جلده " ، واتە : بەهۆی هەڵگرتنی سزا لە سەری پاش بژاردنی قەرزەكانی .

جبريل ) - پاشان ڕوخسەتمان لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بكات ، ئەویش لەگەڵماندا هات ، و چەند هەنگاوێكی ناو ، فەرمووی : لەوانەیە ئەم هاوەڵەتان قەرزی لەسەر بێت ؟ وتیان : بەڵێ دوو دیناری لە سەرە ، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە دواوە ، فەرمووی : ئێوە لەسەر هاوڕێكەتان نوێژ بكەن ، پیاوێك كەناوی ( أبو قتادة ) بوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو دینارە لەسەر من ، و من دەیانبژێرم ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : لەسەر تۆیە و لەپارەی خۆتە ، و مردوەكە لێ ئازادە ؟ وتی : بەڵێ ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر كرد ، دوای ئەوە هەركاتێك پێغەمبەری خوا ( أبو قتادة ) ی ببینایە پێی دەفەرموو : ( لە ڕیوایەتێكدا هاتووە : لە ڕۆژی داهاتوودا بینی پێی فەرموو ) : چیت بە دوو دینارەكە كرد ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە هەر دوێنێ بوو وەفاتی كرد ! ( حتى كان آخر ذلك ) ( وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : ئینجا لەڕۆژی داهاتوودا بینی و پێی فەرموو : دوو دینارەكە چی بەسەر هات ؟ ئەویش وتی : بۆم بژاردن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ئێستا داتەوە دوای ئەوەی كە پێستەكەی لەسەر ئەو دوو دینارە سارد بوویەوە ) ، واتە : بەهۆی لادانی عەزاب و سزا لەسەری دوای دانەوەی قەرزەكان .

**دوو بیرخستنەوە :**

١ - ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت كە نوێژكردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر مردووەكە دوای بژاردنی قەرزەكەی بووە لە لایەن ( أبو قتادة ) وە رضي الله عنه .

ئەمەش گرفتە ! چونكە ( أبو قتادة ) رضي الله عنه خۆی لەفەرموودەیەكی ( صـــحيح ) ی تردا كە ( أبـو هريرة ) رضي الله عنه لێیەوە دەیگێڕێتەوە ، دەڵێت : كە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر بكات قەرزەكەی بژاردووە ، وەكو چۆن لە ( باسی : ٥٥ ) بڕگەی ( و ) باس دەكرێت ، ئەگەر ئەم چیرۆكە ( ڕوداوە ) بەوە دانەنرێت كە دووبارە بۆتەوە ، ئەوا ڕیوایەتی ( أبـو قتـادة ) ( صـــحيح ) ترە لە فەرموودەكەی ( جابر ) ، چونكە ( عبدالله ) كوڕی ( محمد ) كوڕی ( عقيل ) تێدایە و قسەی لەسەرە ، و لەگەڵ ئەوەشدا فەرموودەی ( عبدالله ) ( حسن ) ە ، ئەگەر دژ یەك نەبێت لەگەڵ فەرموودەیەكی تردا ، بەڵام لەگەڵ دژ یەك دا ( مخالفة ) ئەوە بەبەڵگە ناژمێردرێت ، والله اعلم .

٢ - ئەم فەرموودانە ئەوە دەگەیەنن كە بژاردنی قەرزی مردوو سوودی پێ دەگەیەنێت ، ئەگەرچی لەكەسێك بێت لەنەوەكانی خۆیشی نەبێت ، و ئەو قەرز بژاردنە دەبێتە هۆی لابردنی سزا

( عذاب ) لەسەری ، ئەم فەرموودەیەش یەکێکە لەکۆی ئەو تایبەت کراوانەی ( مخصصات ) کە گشتگیری ( عموم ) فەرمایشتی خوای گەورە کە فەرموویەتی : ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ ( سورة النجم : ٣٩ ) ، وە لە بەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : " إذا مات الانسان انقطع عمله إلا من ثلاث ... " ، واتە : مرۆڤ ئەگەر مرد ، پێگەیشتنی پاداشتی کردەوەی دەوەستێت و دەبڕێتەوە ، جگە لەسێ شت نەبێت ... هتد ، ئەم فەرموودەیە ( مسلم والبخاري في الأدب المفرد و أحمد ) یش ڕیوایەتیان کردووە .

بەڵام بژاردنی قەرزەکانی مردوو شتێکە و صەدەقەکردن و بەخشین کردن لەجیاتی شتێکی ترە و دوو شتی جیاوازن ، چونکە بژاردنی قەرز تایبەت ترە لە صەدقە بۆکردنی ، وە ئەگەر نە ئەو کاتە ئەو فەرموودانە کە دەربارەی صەدقەکردن لەجیاتی مردوو هاتوون تایبەت دەکرێت صەدەقەکردنی کوڕ و کچ لەجیاتی دایك و باوکیان ، چونکە منداڵ لە بەرهەمی دایك وباوکیان دەژمێردرێن بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ . بۆیە جائیز نیە کەسانی تری بێگانە بپێورێت و ( قیاس ) بکرێت ، چونکە ئەم ( قیاس ) کردنە ( قیاس ) کردنێکە لەگەڵ جیاوازیەکی زۆر لەنێوانیاندا هەروەکو ئاشکرایە ، هەروەها ( قیاس ) کردنی ( صدقة ) ەش لەگەڵ بژاردنی قەرز ناکرێت ، چونکە ( صدقة ) کردن مانایەکی گشتی ترە لە بژاردن ، وە ئەگەر کرا باسی ئەم بابەتەش بەدرێژی لە کۆتایی کتێبەکەدا باس دەکەین إن شاء الله .

**فەرموودەی چوارەم** : دیسان لە جابرەوە ﷺ : " أن أباه استشهد يوم أحد ، وترك ست بنات وترك عليه دينا ( ثلاثين وسقا ) ( فاشتد الغرماء في حقوقهم ) فلما حضره جَداذُ النخل أتيت رسول الله ﷺ فقلت : يارسول الله قد علمت أن والدي استشهد يوم أحد وترك عليه دينا كثيرا ، وإني أحب أن يراك الغرماء ، قال : اذهب فبيدر كل تمر على حدة ، ففعلت ثم دعوت ( فغدا علينا حين أصبح ) ، فلما نظرو إليه أغروا بي تلك الساعة ، فلما رأى ما يصنعون أطاف حول أعظمها بيدرا ثلاثا ( ودعا في ثمرها بالبركة ) ، ثم جلس عليه ، ثم قال : ادع أصحابك ، فما زال يكيل لهم حتى أدى الله أمانة والدي [٤٤] ، وانا والله راض أن يؤدي الله أمانة والدي ، ولا أرجع إلى أخواتي بتمرة فسلمت والله البيادر كلها حتى إني أنظر إلى البيدر الذي عليه رسول الله ﷺ كأنه لم ينقص تمرة واحدة ( فوافيت مع رسول الله ﷺ المغرب ، فذكرت ذلك له فضحك ، فقال : ائت أبا بكر وعمر فأخبرهما فقالا : لقد علمنا إذ صنع رسول الله ﷺ ما صنع أن سيكون ذلك " [٤٥] .

---

[٤٤] أي وصيته إياه بقضاء الدين عنه ، أنظر حديثه في ذلك في الفصل الاول من المسألة الرابعة .

[٤٥] أخرجه البخاري (٥ /٤٦ ١٧١٣١٩ ٦ /٤٦٢ ٤٦) والسياق مع الزيادات لهورواه بنحوه أبو داود ( ٢/ ١٥) والنسائي ( ٢ / ١٢٧١٢٨) والدارمي (١ /٢٢-٢٥) وابن ماجه (٢/٨٢-٨٣) والبيهقي (٦/٦٤) وأحمد (٣/ ٣١٣٣٦٥، ٣٧٣، ٣٩١،٣٩٧) مطولا

واتە : باوكى لە ڕۆژى ( أُحُد ) دا شەهيد بوو ، و شەش كچى لەپاش خۆى بەجێ هێشت ، و بڕێك قەرزى بەلاوە بوو ( سى وسق دەبوو ) ، خاوەن قەرزەكانيش زۆريان پێهێنايين بە داواكردنى قەرزەكانيان ، وە كە كاتى لێكردنەوەى بەرى دارخورما بوو ، هاتم بۆ لاى پێغەمبەرى خوا ﷺ ، و پێم وت : ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ خۆت دەزانى كە باوكم لەشەڕى ( أُحُد ) دا شەهيد بوو ، و قەرزێكى زۆرى لەسەر بەجێ ماوە ، و منيش حەز دەكەم خاوەن قەرزەكان تۆ لەوێ ببينن ، پێى فەرمووم : بڕۆ هەر جۆرە خورمايەك لە جێگەيەكدا كۆ بكەرەوە ، و بيكە بە خەرمان ، چۆنى پێ فەرمووم منيش وام كرد ، دواى بانگم كرد ، لە بەيانێكەيدا هات بۆ لامان ، ئەوانەى كە قەرزيان لاى باوكم بوو كە پێغەمبەرى خوايان بينى بە پەرۆشى كەوتنە گەڕان بە دوامدا ، كاتێك پێغەمبەرى خوا ﷺ خاوەن قەرزەكانى بينى چى دەكەن ، بەدەورى گەورەترين خەرمانى خورماكەدا سێ جار سوڕايەوە ، و دوعاى بەرەكەتى كرد لە بەروبومەكانى ، دواى ئەوە دانيشت لەسەرى ئينجا وتى : بانگى خاوەن قەرزەكانت بكە ، دەستى كرد بە پێوانە كردن بۆ خاوەن قەرزەكان ، تاكو خواى گەورە هەموو ئەو قەرزەى كە لەسەر باوكم بوو دايەوە ، سوێند بێ بەخوا من لە پيش ئەو كارەى پێغەمبەرى خوا ﷺ بەوە ڕازى بووم كە خواى گەورە قەرزەكانى باوكم بداتەوە و بە بێ ئەوەى دەنكە خورمايەكيش ببەمەوە بۆ خوشكەكانم . بەڵام سوێند بێ بەخوا هەموو خەرمانەى خورماكانم بۆ مايەوە تەنانەت كە سەيرى ئەو خەرمانەشم دەكرد كە پێغەمبەرى خواى ﷺ لەسەر بوو وەكو خۆى وابوو كە هيچ خورمايەكى لێ دەرنەكرا بێت ، لەگەڵ پێغەمبەرى خوادا ﷺ نوێژى مەغريبم كرد ، باسى ئەوەم كرد بۆ پێغەمبەرى خـوا ﷺ ئـەويش پێكەنى و فـــەرمووى : بڕۆ بۆ لاى ( أبو بكر ) و ( عمر ) ئەو هەواڵەيان بدەرێ ، ئەوانيش وتيان ، بە دڵنيايەوە زانيمان ئەو ئيشەى ئەگەر پێغەمبەرى خوا ﷺ بيكات هەر ئاوەها دەبێت .

**فەرموودەى پێنجەم :** هەروەها لە ( جابر ) ەوە ﷺ دەفەرمووى : " كـــان رســـول الله ﷺ يقـــوم فيخطب ، فيحمد الله ، ويثني عليه بما هو أهل له ، ويقول : من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، إن خير الحديث كتاب الله ، وخير الهدي هدي محمد ، وشر الامور محدثاها ، وكل محدثة بدعة ( وكل بدعـــة ضلالة ، وكل ضلالة في النار ) ، وكان إذا ذكر الساعة احمرت عيناه ، وعلا صوته واشتد غضبه ، كأنه منـــذر جيش ( يقول ) : صبحكم ومساكم ، من ترك مالا فلورثته ، ومن ترك ضياعا [٤٦] أو دينا فعلي ، وإلي ، وأنا ( أ

---

ومختصرا . وفيه عند أحمد زيادات كثيرة،لم أوردها خشية الاطالة .

[٤٦] أي عيالا ، قال ابن الاثير : " وأصله مصدر ضاع يضيع ضياعا ، فسمي العيال بالمصدر كما تقول:من مات وترك فقراً ، أي فقراء ".

) ولى ( بـ ) المؤمنين ( وفي رواية : بكل مؤمن من نفسه ) " [٤٧] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەستاوی ووتاری دەخوێندەوە ، پاش ئەوە سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاری دەكرد بەوەی كە شایستەیەتی ، و دەیفەرموو : هەركەسێك خوای پەروەردگار هیدایەتی بدات كەس نیە گومڕای بكات ، و هەركەسێكیش گومڕا بێت كەس نیە هیدایەتی بدات جگە لە خوای پەروەردگار ، بەڕاستی باشترین گوفتار گوفتاری خوای گەورەیە ، و باشترین ڕێنمووی ڕێنموویی ( محمد ) ە ﷺ ، و خراپترین كاریش داهێنراوەكانە ، و هەموو داهێنراوێكیش ( بیدعة ) یە و هەموو بیدعەیەكیش گومڕاییە و هەموو گومڕایی یەكیش لە ئاگرە ، و كاتێك باسی قیامەت و دوا ڕۆژی بكردایە چاوەكانی سوور دەبوونەوە ، و دەنگی بەرز دەبوویەوە ، و توڕەبوونی زیادی دەكرد ، هەروەكو ئەو كەسەی كە ئاگاداری خەڵكی دەكردەوە كە سوپایەك هێرشیان بۆ دێنێت ، و دەڵێن : بەیانی پێتان دەگەن یان ئێوارە ، وە دەیفەرموو : هەركەسێك ماڵ و منداڵەكانی بە هەژاری بە جێهێشت یان قەرزار بوو ئەوا لەسەر منە و لای منە ، منیش ئەولاترم بۆ هەموو بڕوادارێك ، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : من دۆستی هەموو بڕوادارێكم و ئەولاترم لە خودی خۆشی .

**شەشەم** : لەدایكی ئیماندارانەوە ( عائشة ) ڕەزای خوا لیێ بێت فەرمووی : پێغەمبەری ﷺ فەرمووی : " من حمل من أمتي دينا ، ثم جهد في قضائه ، فمات ولم يقضه ، فأنا وليه " [٤٨] ، واتە : هەركەسێك لە ئوممەتی من قەرزار بوو ، و هەوڵی زۆری دا بۆ بژاردنی بەڵام نەیتوانی بیبژێرێت ، ئەوا من كەفالەتی ئەو قەرزەی دەكەم .

---

[٤٧] أخرجه مسلم (٣/١١) والنسائي (١/٢٣٤) والبيهقي في " السنن " (٣/ ١٣٢– ٢١٤) وفي " الاسمائك والصفات " ( ص ٨٢ ) وأحمد (٣/ ٢٩٦، ٣١١، ٣٣٨ –٣٧١) والسياق له،وإبو نعيم في " الحلية " ( ٣ / ١٨٩ ) ، والزيادة الاولى له،وللنسائي والبيهقي وإسنادها صحيح على شرط مسلم ، والزيادة الثانية له وللبيهقي ، والثالثة والرابعة لاحمد ، والرواية الثانية لمسلم .

وفي الباب عن أبي هريرة عند الشيخين وغيرهما، وسيأتي حديثه في المسألة( ٥٥) فقره (و) الحدث الثاني .

[٤٨] أخرجه أحمد (٦/٧٤) وإسناده صحيح على شرط الشيخين . وقال المذري (٣/٣٣) : " رواه أحمد بإسناد جيد وأبو يعلى والطبراني في الاوسط " ونحوه في " المجمع " (٤/ ١٣٢) إلا أنه قال : " ورجال أحمد رجال الصحيح " وعزاه الشوكاني ( ٤ / ٢١ ) لابن ماجه وهم ، فاني لم أجده عنده بعد مزيد البحث عنه ، ولم يورده النابلسي في " الذخائر " ولو كان عنده لعزاه إليه المنذري ، ولما أورده الهيثمي في " المجمع " كما هو المعروف عند المشتغلين بهذا العلم الشريف .

## ( ٤ ) چی ڕەوایە بۆ ئامادەبوان و جگە لەوان ( ما يجوز للحاضرين وغيرهم ) :

١٨ - جائیزە بۆ ئامادەبوان ئەو پارچەیەی لەسەر ڕوومەتی مردووەكە لای بدەن ، و ماچی بكەن ، و سێ ڕۆژیش بۆی بگرین لەم بارەیەشەوە چەند فەرموودەیەك هاتووە :

**یەكەم :** لە ( جابر ) ی كوڕی ( عبدالله ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرمووی : " لما قتل أبي ، جعلت أكشف الثوب عن وجهه أبكي ، وهوني ، والنبي ﷺ لا ينهاني ، ( فأمر به النبي ﷺ فرفع ) ، فجعلت عمتي فاطمة تبكي ، فقال النبي ﷺ تبكين ، أو لا تبكين ، مازالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفعتموه " [٤٩] .

واتە : كاتێك باوكم كوژرا ، پارچەكەم لەسەر ڕوومەتی لادەدا و دەگریام ، خەڵكەكەش نەیاندەهێشت ، پێغەمبەری خواش ﷺ نەهی لێ نەدەكردم ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد كە تەرمەكەی ( جنازة ) ەكەی هەڵگرن ، ( فاطمة ) ی پورم دەستی كرد بەگریان ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو دەگریت یان ناگریت ، هێشتا فریشتەكان ( ملائكة ) كان بەباڵەكانیان سێبەریان بۆ دەكرد هەتاوەكو بەرزتان كردەوە .

**دووەم :** لە ( عائشة ) ەوە . ڕەزای خوای لێ بێت . فەرموویەتی : " أقبل أبوبكر ﷺ على فرسه من مسكنه بـ ( السنح ) حتى نزل فدخل على المسجد ، ( وعمر يكلم الناس ) فلم يكلم الناس حتى دخل على عائشة رضي الله عنها ، فتيمم النبي ﷺ وهو مسجى ببردة حبرة ، فكشف عن وجهه ، ثم أكب عليه ، فقبله ( بين عينيه ) ، ثم بكى فقال : بأبي أنت وأمي يا نبي الله " لا يجمع الله عليك موتتين ، أما الموتة التي عليك فقد متها ، وفي رواية : لقد مت الموتة التي لا تموت بعدها " [٥٠] .

واتە : ( أبو بكر ) ﷺ بەسواری ئەسپەكەیەوە لەماڵی خۆیەوە لە ( السنح ) ەوە هات ، تاكو لە ئەسپەكەی هاتە خوارەوە و چووە ناو مزگەوتەوە ، ( عمر یش قسەی بۆ خەڵك دەكرد ) هیچ لەگەڵ خەڵكدا قسەی نەكرد تاوەكو چووە لای ( عائشة ) . ڕەزای خوای لێ بێت . و ڕوی كردە لای پێغەمبەر

---

[٤٩] أخرجه الشيخان والنسائي والبيهقي وأحمد (٣/٢٩٨) والزيادة لمسلم والنسائي .

[٥٠] أخرجه البخاري (٣ /٨٩) والنسائي (١ /٢٦٠- ٢٦١) والزيادة له في رواية ، وابن حبان في صحيحه ( ٢١٥٥) والبيهقي (٣/ ٤٠٦ ) وغيرهما .

ﷺ و پۆشتە لای ، كە بە جۆرە عەبایەكی یەمەنی پێی دەووترێت عابای حەبرە داپۆشرابوو ، عاباكەی لەسەر ڕوومەتی لادا و خۆی دا بەسەریدا و پاشان ماچی نێو چاوانی كرد ، و ئینجا دەستی كرد بە گریان ، و وتی : دایك و باوكم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەرگیز خوای گەورە دوو مردنت لەسەر كۆ ناكاتەوە ، ئەو مردنەی كە لەسەرت بوو مردیت ، لە ڕیوایەتێكدا ( ئەو مردنەی كەلەدوای ئەوە نامریت ) .

**سێیەم :** هەروەها لە ( عائشة ) ەوە . ڕەزای خوای لێ بێت . دەگێڕێتەوە : " أن النبي ﷺ دخل على عثمان بن مظعون وهو ميت ، فكشف في وجهه ، ثم أكب عليه فقبله ، وبكى حتى رأيت الدموع تسيل على وجنتيه " [٥١] ، واتە : كە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای ( عثمان ) كوڕی ( مظعون ) لە كاتێكدا كە مرد بوو ، پارچەكەی لەسەر ڕوومەتی لادا ، و خۆی دا بەسەریدا و ماچی كرد و دەستی كرد بە گریان تاكو فرمێسكەكانم دەبینی بەسەر گۆناكانیدا دەهاتنە خوارێ .

**چوارەم :** لە ( أنس ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : " دخلنا مع رسول الله ﷺ على أبي سيف ــ وكان ظئرا [٥٢] لإبراهيم عليه السلام ــ فأخذ رسول الله ﷺ إبراهيم فقبله وشمه ، ثم دخلنا عليه بعد ذلك وإبراهيم يجود بنفسه ، فجعلت عينا رسول الله ﷺ تذرفان ، فقال له عبد الرحمن بن عوف : وأنت يا رسول الله ؟ فقال : يا ابن عوف ! إنها رحمة ، ثم أتبعها بأخرى فقال : إن العين تدمع ، والقلب يحزن ، ولا نقول إلا ما يرضي ربنا ، وإنا بفراقك يا إبراهيم لمحزونون " [٥٣] .

واتە : لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ چووین بۆلای ( أبــو ســيف ) كەمێردی ئەو ئافرەتە بوو شیری بە ( إبــــراهيم ) ی كوڕی پێغەمبەر ﷺ دەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ ( إبــــراهيم ) ی گرتە باوەشەوە و ماچی كرد و بۆنی كرد ، دوای ئەوە كە جارێكی تر چووینەوە بۆ لای ( أبو ســيف ) ( إبــــراهيم ) لەسەرە مەرگدا بوو و دوا هەناسەی دەدا ، چاوەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ پڕ بوون لەفرمێسك ، ( عبد الرحمن ) كوڕی ( عوف ) بە پێغەمبەری خوای وت ﷺ : تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا دەگریت ؟! فەرمووی : ئەی كوڕی ( عــوف ) ئەمە ڕەحمەتێكە ، پاشان فەرمووی : چاوەكان فرمێشك دەڕێژن ، و دڵیش تەنگ دەبێت ، وە ئێمە هیچ شتێك ناڵێین شتێك نەبێت خوا پێ ی ڕازی بێت ، وە ئێمەش بەدابڕان و كۆچی تۆ ئەی ( إبراهيم ) دڵ تەنگین .

**پێنجەم:** لە ( عبدالله ) كوڕی ( جعفر ) ەوە ﷺ دەگێڕێتەوە : " أن النبي ﷺ أمهل آل جعفر ثلاثا أن

---

[٥١] أخرجه الرمذي ( ٢ / ١٣٥ ) وصححه والبيهقي وغيرهما ، وله شاهد بإسناد حسن يراجع في " مجمع الزوائد " (٣ / ٢٠) .

[٥٢] أي زوج مرضعة إبراهم عليه السلام .

[٥٣] أخرجه البخاري ( ٣/ ٣٥) ومسلم والبيهقي ( ٦٩/٤) بنحوه .

يأتيهم ، ثم أتاهم فقال : لا تبكوا على أخي بعـــد اليـــوم .... " [٥٤] تا كۆتایی فەرموودەكە ، واتـە : كە پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژ مۆڵەتی دا بە كەسوكاری ( جعفر ) كە بۆی بگرین سەردانی نـەكردن ، دوای ئەوە هات بۆ لایان و فەرمووی : لە دوای ئەمڕۆوە نەگرین لەسەر براكەم ... .

## ( ٥ ) چی پێویستە لەسەر كەس وكاری مردوو
## ( ما يجب على أقارب الميت ) :

١٩ - پێویستە لەسەر خزم و كەس وكاری مردوو كاتێك كە هەواڵی مردنیان پێ دەگات ئەم دوو خاڵە ڕەچاو بكەن :

**یەكەم :** ئارام گرتن و ڕازی بوون بە قەدەری خوا ، چونكە خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ وَلَنَبْلُـوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴾ ( البقرة : ١٥٥ ـــ ١٥٧ ) .

وە لە بەر ئەو فەرموودەیەی كە ( أنس ) ی كوڕی ( مالك ) ﷺ دەیگێڕێتەوە كە : " مرَّ رسول الله ﷺ بامرأة عند قبر وهي تبكي ، فقال لها : اتقي الله واصبري ، فقالت : إليك عني ، فانك لم تصب بمـــصيبتي ! قال : ولم تعرفه ! فقيل لها : هو رسول الله ﷺ ! فأخذها مثل الموت ، فأتت باب رسول الله ﷺ فلم تجد عنده بوابين ، فقالت : يا رسول الله إني لم أعرفك ، فقال رسول الله ﷺ : إن الصبر عند أول الصدمة " [٥٥] .

واتـە : پێغەمبـەر ﷺ دای بـەلای ئافرەتێكدا لەسـەر گۆڕێك دانیشتبوو دەگریـا ، پێغەمبـەری خوا ﷺ پێی فەرموو : لە خوا بترسە و ئـــارامت هەبێت ، ئـــافرەتەكەش پێی وت : وازم لـێ بێنـە ( دوور بكەوە لێم ) ئــەوەی تــووشی مــن بووە تووشی تۆ نەبووە !! ( أنـــس ) ووتـی : ئەو ئافرەتـە پێغەمبـەری خـوای ﷺ نەناسیەوە ! پێیـان وت : ئـەوە پێغەمبـەری خـوا بـوو ﷺ !! ئافرەتەكـەش وەكـو چـۆن تووشـی مـردن بوبێـت وای لـێ هـات ، و هاتـە بـەردەرگای پێغەمبــەر ﷺ وهـیچ دەرگاوانێكی بەرچاو نەكەوت ، وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ من تـۆم نەناسـی ، و پێغەمبـەری خواش ﷺ پێی فەرموو : ئارام گرتن ئەوەیە كەلەسەرەتای لێ قەومانەوە بێت .

ئـارام گـرتنیش لەسـەر مردنـی منـداڵ پاداشـتێكی گـەورەی هەیـە و لـەو بارەیەشـەوە چـەندین

---

[٥٤] رواه أبو داود (١٢٤/٢) والنسائي (٢٩٢/٢) وإسناده صحيح على شرط مسلم ، وأخرجه أحمد بأتم منه ، وسيأتي لفظه في " التعزية " . إن شاء الله تعالى .

[٥٥] أخرجه البخاري (٣/ ١١٥- ١١٦) ومسلم (٣/٤٠-٤١) والبيهقي (٦٥/٤) والسياق له .

فەرمووده هاتوون هەندێكيان باس دەكەين :

**يەكەم :** " لَا يَمُوت لِأَحَدٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ ثَلَاثَة مِنْ الْوَلَد تَمَسّهُ النَّار إِلَّا تَحِلَّة الْقَسَم" (٥٦) ، واتە : هيچ كەسێكى موسڵمان نيە سێ منداڵى بمرێت و دواى ئەوە ئاگرى بەركەوێت ، جگە لە جێ بەجێ كردنى ئەو سوێندە نەبێت كە خواى پەروەردگار خواردوويەتى ، سوێندەكەش هەروەكو زانايان فەرموويانە لە يەكێكە لەم دوو ئايەتە : ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ ( سورة مريم : ٧١ ) ، يان : ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴾ ( سورة مريم : ٦٨ )

**دووەم :** " ما من مسلمين يموت لهما ثلاثة من الولد ، لم يبلغوا الحنث إلا أدخلهم الله ، وأبويهم الجنة بفضل رحمته ، قال : ويكونون على باب من أبواب الجنة ، فيقال لهم : ادخلوا الجنة ، فيقولون : حتى يجيء أبوانا ، فيقال لهم : ادخلوا الجنة أنتم وأبواكم بفضل رحمة الله " (٥٧) .

واتە : هيچ دايك و باوكێكى موسڵمان نيە كە سێ منداڵيان بمرێت ، نەگەيشتبێتنە تەمەنى باڵغ بوون ، ئيللا خواى گەورە خۆيان ودايك وباوكيشيان دەخاتە بەهەشتەوە بەفەزڵ و ڕەحمەتى خۆى ، پاشان فەرمووى : منداڵەكان لەبەر دەرگايەك دەبن لە دەرگاكانى بەهەشت ، كە پێيان دەڵێن : بڕۆنە بەهەشتەوە دەڵێن : ناڕۆين تاكو دايك وباوكمان نەيەن ، پێيان دەڵێن : خۆتان و دايك و باوكيشتان بەفەزڵ و ڕەحمەتى خوا بڕۆنە بەهەشتەوە .

**سێيەم :** " أيما امرأة مات لها ثلاثة من الولد ، كانوا حجابا من النار ، قالت امرأة : واثنان ؟ قال : واثنان " (٥٨) ، واتە : هەر ئافرەتێك سێ منداڵى بمرێت ، ئيللا ئەو منداڵانە دەبنە پەردەيەك بۆى لەئاگرى دۆزەخ . ئافرەتێك وتى : ئەى دوو منداڵ ؟ فەرمووى : دوو منداڵيش .

**چوارەم :** " إن الله لا يرضى لعبده المؤمن إذا ذهب بصفيه من أهل الأرض ، فصبر ، واحتسب ، بثواب دون الجنة " (٥٩) ، واتە : خواى گەورە ڕازى نابێت بە هيچ پاداشێك بۆ بەندەى ئيماندارى خۆى كاتێك خۆشەويستێكى دەمرێنێت ، و ئەويش ئارام دەگرێت و چاوەڕوانى پاداشتى خوا دەكات ، جگە لە پاداشتى بەهەشت نەبێت .

**دووەم :** شتێكى تر لەو شتانەى كە لەسەر كەس وكارى مردوو پێويستە : ئيسترجاع كردنە

---

(٥٦) أخرجه الشيخان والبيهقي (٤/٦٧) عن أبي هريرة .

(٥٧) أخرجه النسائي (١/ ٢٦٥) والبيهقي (٤/٦٨) وغيرهما عنه ، وسنده صحيح على شرط الشيخين .

(٥٨) أخرجه البخاري (٣/٩٤) ومسلم والبيهقي (٤/٦٧) عن أبي سعيد الخدري ﷺ .

(٥٩) أخرجه النسائي (١/ ٢٦٤) عن عبد الله بن عمرو بسند حسن .

( الاسترجاع ) کە بریتیە لە وتنی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) ، وەکو لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە کە لە پێشەوە باس کرا ، وە بە دوایدا بلێت: " اللهم أجرني في مصيبتي واخلف لي خيرا منها " ، واتە : ئەی پەروەردگارم پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم ( موصیبەتە ) م و شتێکم تووش بکە بۆ ئەوەی جێی بگرێتەوە لەو باشتر بێت ، ئەوەش لە بەر فەرموودەکەی ( أم سلمة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ کە دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوویەتی ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " ما من مسلم تصبه مصيبة فيقول ما أمره الله ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) اللهم أجرني في مصيبتي واخلف لي خيرا منها إلا أخلف الله له خيرا منها . قالت : فلما مات أبو سلمة ، قلت : أي المسلمين خير من أبي سلمة ، أول بيت هاجر إلى رسول الله ﷺ ثم إني قلتها ، فأخلف الله لي رسول الله ﷺ قالت : أرسل إلي رسول الله ﷺ حاطب بن أبي بلتعة يخطبني له ، فقلت : إن لي بنتا وأنا غيور ، فقال : أما ابنتها فندعو الله أن يغنيها عنها ، وأدعو الله أن يذهب بالغيرة " [٦٠] ، واتە : لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە فەرموویەتی : هیچ کەسێك لە موسڵمانان موصیبەتێکی تووش نابێت و لەو کاتەدا ئەوە بلێێت کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە ، وەکو وتنی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) ە و بڵێت : خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم موصیبەتەم وشتێکم تووش بکە لەوە باشتر بێت ، ئیللا خوای گەورە لەوەی باشتر تووش دەکات ، ( أم سليم ) . ڕەزای خوای لێ بێت . وتی : کاتێك ( أبو سلمة ) ﷺ وەفاتی کرد ، وتم کام موسڵمانێك لە ( أبو سلمة ) ﷺ چاکتر بێت ؟! یەکەمین ماڵێکە کە کۆچی کردبێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ، پاشان ئەو دوعایەم خوێند ، و دوای ئەوە خوای گەورە لەجیاتی ( أبو سلمة ) پێغەمبەری خوای ﷺ پێ بەخشیم ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ ( حاطب ) ی کوڕی ( أبي بلتعة ) ی ﷺ نارد بۆ خوازبێنیم ، منیش وتم : من کچێکم هەیە وکەسێکی غەیرەدارم ( غيور ) م پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بۆکچەکەی لە خوا دەپاڕێمەوە کە پێویستی بەئەم نەبێت ، وداواش دەکەم کە غەیرەکەی نە هێڵێت .

٢٠ ـ واز هێنانی ئافرەت لەهەموو خۆڕازاندنەوە و جوانکاریەك ( واتە : الحداد ) بۆ مردنی منداڵێکی یان هەر کەسێکی تری بەدەرچوون لە ( ئارام گرتن ) ناژمێررێت بەمەرجێك لەسێ ڕۆژ زیاتر نەبێت ، مەگەر بۆ مردنی مێردەکەی ، کە دەبێت چوار مانگ و دە ڕۆژ واز بهێنێت لە هەموو خۆڕازاندنەوە و جوانکاریەك ( واتە : الحداد ) ، لەبەر فەرموودەکەی ( زينب ) کچی ( أبو سلمة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ کە دەفەرموێت : " دخلت على أم حبيبة زوج النبي ﷺ فقالت : سمعت رسول الله ﷺ يقول : " لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر ( أن ) تحد على ميت فوق ثلاث ، إلا على زوج أربعة أشهر

---

[٦٠] أخرجه مسلم (٣/٣٧) والبيهقي (٤/٦٥) وأحمد (٦/٣٠٩) .

وعشرا " ثم دخلت على زينب بنت جحش ــ حين توفي أخوها فدعت بطيب فمست ، ثم قالت : مالي بالطيب من حـاجة ، غير أني سمعت رسول الله ﷺ يقـول : ... "[٦١] پـاشان هەمـان فـەرموودەكەی ( أم حبيبة ) . ڕەزای خوای لیٚ بێت . تا كۆتای دەگێڕتەوە .

واتە : چووم بۆ لای ( أم حبيبـة ) ی . ڕەزای خـوای لـیٚ بێـت . خێزانـی پێغەمبـەر ﷺ وتـی : لـە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیسوومە فەرموویەتی : بۆ هیچ ئافرەتێك كە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایـی هەبێت حەلاڵ نیە كە لە سیٚ ڕۆژ زیاتر واز بهێنێت لە هەموو خۆڕازاندنـەوە و جوانكاریـەك ، مەگـەر بـۆ مێردەكـەی نـەبێت ، ئـەوا چـوار مـانگ و دە ڕۆژ واز دەهێنێـت لـە هـەموو خۆڕازاندنـەوە و جوانكاریەك ، و دوای ئەوە چووم بۆ لای ( زينب ) ی كچی ( جحش ) . ڕەزای خوای لیٚ بێت . كاتێك براكـەی وەفـاتی كردبـوو داوای هەنـدێك بـۆنی كـرد دای لەدەسـتی و دوای ئـەوە وتـی : هـیچ پێویـستییەكم بـــە بـۆن نیـە بـەڵام لـــەبەر ئـــەوەیە كـە بیـستوومە لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ فـەرموویتی : ... هتد .

٢١ . بەڵام ئەگەر ئافرەت واز نەهێنێت لە هەموو خۆڕازاندنەوە و جوانكاریەك ( واتە : الحداد ) بۆ جگە لە مێردەكەی ، لە بەر ڕەزامەندی مێردەكەی و تێركردنی ئارەزووەكانی لـە خێزانەكـەی ( قضاء وطرة منها ) ئـەوا چاكترە بۆی ، و ئومێد دەكرێت لـەدوای ئـەوە تووشـی خێرێكـی زۆر گـەورە بـن ، هـەروەك چۆن بەسـەر ( أم سليم ) و ( أبو طلحة ) ی ( الأنصاری ) ی مێردیدا هـاتووە . ڕەزای خوایـان لیٚ بێت . واش بەباش دەزانم كە چیرۆكەكەیان ئەگـەر چـی هەنـدێك درێـژە بـاس بكـەم ، چونكە پـڕە لەسوود و پەند و ئامۆژكـاری ، ( أنس ) دەڵێـت : " قال مالك أبو أنس لامرأته أم سليم ــ وهي أم أنس ــ : إن هذا الرجل ــ يعني النبي ﷺ يحرم الخمر ــ فانطلق حتى أتى الشام ، فهلك هناك ، فجاء أبـو طلحـة ، فخطب أم سليم ، فكلمها في ذلك ، فقالت : يا أبا طلحة ! ما مثلك يرد ، ولكنك امرؤ كافر ، وأنـا امـرأة مسلمة لا يصلح لى أن أتزوجك ! فقال : ما ذاك دهرك ، قالت : وما دهري قال : الصفراء والبيضاء ! قالت : فإني لا أريد صفراء ولا بيضاء ، أريد منك الاسلام ، ( فإن تسلم فذاك مهري ، ولا أسألك غيره ) ، قال : فمن لي بذلك ؟ قالت : لك بذلك رسول الله ﷺ ، فانطلق أبو طلحة يريد النبي ﷺ ورسـول الله ﷺ جـالس في أصحابه ، فلما رآه قال : جاءكم أبو طلحة غرة الاسلام بين عينيه ، فأخبر رسول الله ﷺ بما قالت أم سـليم ، فتزوجها على ذالك ، قال ثابت ( وهو البناني أحد رواة القصة عن أنس ) فما بلغنا أن مهرا كان أعظم منه أنهـا رضيت الاسلام مهرا ، فتزوجها وكانت امرأة مليحة العينين ، فيها صغر ، فكانت معه حتى ولد له بني ، وكـان

[٦١] أخرجه البخاري (٣ / ١١٤، ٩ ٤٠٠/٤٠٠– ٤٠١) .

يحبه أبو طلحة حبا شديدا . ومرض الصبي ( مرضا شديدا ) ، وتواضع أبو طلحة لمرضه أو تضعضع له ، ( فكان أبو طلحة يقوم صلاة الغداة يتوضأ ، ويأتي النبي ﷺ فيصلى معه ، ويكون معه إلى قريب من نـصف النـهار ، ويجيء يقيل ويأكل ، فإذا صلى الظهر تهيأ وذهب ، فلم يجيء إلى صلاة العتمة ) فانطلق أبو طلحة عشية إلى النبي ﷺ ( وفي رواية : إلى المسجد ) ومات الصبي فقالت أم سليم : لا ينعينَّ إلى أبي طلحة أحـد ابنه حتى أكـون أنا الذي أنعاه له ، فهيأت الصبي ( فسجت عليه ) ، ووضعته ( في جانب البيت ) ، وجاء أبو طلحة مـن عنـد رسول الله ﷺ حتى دخل عليها ( ومعه ناس من أهل المسجد من أصحابه ) فقال : كيف ابني ؟ فقالت : يا أبـا طلحة ماكان منذ اشتكى أسكن منه الساعة ( وأرجـو أن يكون قـد استراح ! ) فأتته بعشائه ( فقربته إليهم فتعشوا ، وخرج القوم ) ، ( قال : فقال إلى فراشه فوضع رأسه ) ، ثم قامت فتطيبت ، ( وتصنعت له أحسن ما كانت تصنع قبل ذلك ) ، ( ثم جاءت حتى دخلت معه الفراش ، فما هو إلا أن وجد ريح الطيب كان منه مـا يكون من الرجل إلي أهله ) ، ( فلما كان آخر الليل ) قالت : يا أبا طلحة أرأيت لو أن قوما أعاروا قوما عاريـة لهم ، فسألو هم إياها أكان لهم أن يمنعو هم ؟ فقال : لا ، قالت فإن الله عزوجل كان أعارك ابنـك عاريـة ، ثم قبضه إليه ، فـاحتسب واصبر ! فغضب ثم قـال : تركتني حتى إذا وقعت بما وقعت به ، ثم نعيت إلي ابني ! ( فاسترجع ، وحمد الله ) ، ( فلما أصبح اغتسل ) ، ثم غدا إلى رسول الله ﷺ( فصلى معه ) فـأخبره ، فقـال رسول الله ﷺ ، بارك الله لكما في غابر ليلتكما ، فثقلت منت ذلك الحمل ، وكانت أم سليم تسافر مع الـنبي ﷺ ، تخرج إذا خرج ، وتدخل معه إذا دخل ، وقـال رسول الله ﷺ إذا ولدت فأتوني بالصبي ، ( قال : فكان رسول الله ﷺ في سفر وهي معه ، وكان رسول الله ﷺ إذا أتى المدينة من سفر لا يطرقها طروقا ، فدنوا مـن المدينة ، فضربها المخاض ، واحتبس عليها أبو طلحة ، وانطلق رسول الله ﷺ ، فقال أبو طلحة : يا رب إنـك لتعلم أنه يعجبني أن أخرج مع رسولك إذا خرج ، وأدخل معه إذا دخل ، وقد احتبست بما ترى ، قال : تقول أم سليم : يا أبا طلحة ما أجد الذي كنت أد فانطلقا قال : وضربها المخاض حين قدموا ) ، فولدت غلاما ، وقالت لابنها أنس : ( يا أنس ! لا يطعم شيئا حتى تغدوا به إلى رسول الله ﷺ ، ( وبعثت معه بتمرات ) ، قال : فبات يبكي ، وبت مجنحا [٦٢] عليه ، أكالئه حتى أصبحت ، فغدوت إلى رسول الله ﷺ ) ، ( وعليه بـردة ) ، وهـو يسم إبلاء أو غنما ( قدمت عليه ) ، فلما نظر إليه ، قال لانس : أولدت بنت ملحان ؟ قال : نعم ، ( فقـال : رويدك أفرغ لك ) ، قال : فألقى ما في يده ، فتناول الصبي وقال : ( أمعه شئ ؟ قالوا : نعم ، تمرات ) ، فأخـذ النبي ﷺ ( بعض ) التمر ( فمضغهن ، ثم جمع يزاقه ) ، ( ثم فغز فاه ، وأوجره إياه ) ، فجعل يحنـك الـصبي ، وجعل الصبي يتلمظ : ( يمص بعض حلاوة التمر وريق رسول الله ﷺ ، فكان أول من فتح أمعاء ذلك الـصبي

---

[٦٢] ماتلا .

علی (٦٣) ريق رسول الله ﷺ فقال : انظروا إلى حب الانصار التمر ، ( قال : قلت : يارسول الله سمه ، قال : ) ( فمسح وجهه ) وسماه عبد الله ، ( فما كان في الانصار شاب أفضل منه ) ، قال : فحرج منه رجل (٦٤) كثير ، واستشهد عبد الله بفارس ) " (٦٥) .

واتـه : ( مالك ) بـاوكی ( أنــس ) بەخێزانەكەی ( أم ســليم ) كە دايكی ( أنــس ) بـوو ، وتـی : بەڕاستی ئەم پياوە . مەبەستی پێغەمبەری خوايە ﷺ ـ ئارەق حەرام دەكات ، دوای ئەوە ڕۆيشتن بۆ شام و لەوێدا مرد ، دوای ئەوە ( أبو طلحـــة ) هـات بۆ خـوازبێنی ( أم ســـليم ) وقسەی كـرد لـەو بارەيەوە . ( أم سليم ) يش پـێ ی ووت : ئەی ( أبو طلحة ) كەسی وەكو تۆ ڕەت ناكرێتەوە ، بەڵام تـۆ پياوێكی كافريت ، ومنيش ئافرەتێكی موسڵمانم ، نابێت شـووت پـێ بكـەم !! ئەويش وتـی: ئەوە ژيانی تۆ نيە ، ( أم سليم ) يش وتی : ئەی ژيانی من چيە ؟ ئەويش وتی : ژيانی تۆ ئاڵتون وزيـوە . ( أم سليم ) يش پـێی وت : من زێڕ و زيوم لـە تـۆ ناوێـت ، تـەنها ئـەوەم دەوێـت كـە موسڵمان بيـت ، ئەگەر موسڵمان بيت ئەوە مارەيەكەمـە ، وهيـچی تـرم ناوێـت ، ئـەويش وتـی : بڕۆم بۆ لای كـێ بـۆ ئەوە ؟ ( أم سليم ) يش وتی : بۆ ئەوە بڕۆ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .

پێغەمبەريش ﷺ لە نێو هاوەڵەكانيدا دانيشتبوو ، كاتێك ( أبو طلحة ) ەی بينـی ، فـەرمووی : ئەوە ( أبو طلحة ) هات بۆ لاتان نـوری ئيسلامی بـــــەنێو چاوانيەوە ديـارە ، ( أبوطلحـــة ) ەش كە گەشتە خزمەتی ئــــــەوەی ( أم سليم ) وتبووی بـــە پێغەمبـەری خـوای ﷺ ڕاگەيانـد ( أم سليم ) ی لــەسەر ( موسڵمان ) بوونی خـــۆی مــارە دەكات ، ( ثابت ) وتی: ( واته : ثابت البناني ، كە يەكێكە لەوانەی ئەم چيرۆكەيان لە ( انس ) ەوە گێڕاوەتەوە ) هەرگيز نەمان بيستووە كە مارەييەك گەورەتر بێت لە مارەييەكەی ( أم سليم ) كە ڕازی بوو كـە ئيسلام مـارەيی بێـت ، ( أبو طلحة ) ( أم ســـليم ) ی خواست كە ئافرەتێك بوو دوو چاوی جوانی هەندێك بچووكی هەبوو . پێكەوە بوون هـەتاكو خـوای گەورە كوڕێكی پـێ بەخشين ، و ( أبو طلحة ) ش ئەم منداڵەی زۆر خۆش دەويست بـەڵام ئـەم منداڵـە

---

(٦٣) كذا الاصل ، ولعل حرف ( على ) مقحم من بعض النساخ .

(٦٤) جمع راجل ، وهو ضد الفارس .

(٦٥) أخرجه الطيالسي (رقم ٢٠٥٦) والسياق له ، ومن طريقــه البيهقــي (٤/٦٥-٦٦ وابــن حبــان (٧٢٥) وأحمــد (٣/ ١٠٥-١٠٦،١٨١، ١٩٦ ، ٢٨٧ ، ٢٩٠) والزيادات كلها له كما سيأتي ، ورواه البخــاري (٣/ ١٣٢- ١٣٣) ومــسلم (٦/ ١٧٤- ١٧٥ ) مختصرا مقتصرا على قصة وفاة الصبي ، وروى النسائي (٢/ ٨٧) قسما من أوله ، والزيادة الاولى له ، والسادسة والثامنة والخامـــسة عـــشر والسادسة عشر للبخاري ، والتاسعة عشر والثانية والعشرون لمسلم ، وسائرها لاحمد كما سبق ... وقد عنيت عناية خاصة بجمع روايات هذه القصة وألفاظها ، لما فيها من روعة وجلالة ، وليأخذ القارئ عنها فكرة جامعة صادقة ، وذلك تتم العبرة والفائدة .

نەخۆش کـــەوت نەخۆشیەکی زۆر سەخت ( أبو طلحة ) ش زۆر دڵ گران و پەرێشان بـــوو بـــۆی ( هـەموو ڕۆژێك أبو طلحـــة ) لـە کاتی نوێـژی بەیانی دەست نوێـژی دەگـرت و دەچوو بۆ خزمـەت پێغەمبەر ﷺ و نوێژی لەگەڵدا دەکرد و لەگەڵیا دەمایەوە ، تاکو ڕۆژ نزیك لە نیوەڕۆ دەبویـەوە ، ودوای ئەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵ کەمێك دەخەوت ونانی نیوەڕۆی دەخوارد ، و دوای ئەوە خۆی ئامادە دەکرد و دەڕۆی بۆ نوێژی نیوەڕۆ و نـــەدەگەڕایەوە تـا نوێژی عیشای دەکرد ) ، شەوێکیان ( أبو طلحة ) ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ( لە ڕیوایەتێکدا هاتووە : بۆ مزگەوت ) ومنداڵەکەی مرد ( أم سليم ) وتی : ناهێڵم هیچ کەسێك هەواڵی مردنی کوڕەکە بە ( أبو طلحة ) ڕابگەیـەنێت تاکو من پێی ڕادەگەیەنم ، کوڕەکەی ئامادەکرد ( دایپۆشی ) و داینا ( لـــە گۆشـەیەکی ماڵەکەدا ) ( أبو طلحة ) لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە هات بۆ لای ( أم سليم ) ( چەند هاوەڵێکی خۆی لە مزگەوت لە گەڵ خۆیدا هێنابوو ) ( أبو طلحة ) وتی : کوڕەکەم چۆنە ؟ ( أم سليم ) وتی : ئەی ( أبـــو طلحـــــة ) لـەو ڕۆژەوەی نـەخۆش کـەوتووە تـاکو ئێستا ئەوەنـدە ئـارام نـەبووە ( تکـام وایـە کـە حەوابێتـەوە !! ) دوای ئـــەوە خواردنەکـەی بـــۆ هێنـا( لێیـانی نزیـك کـردەوە و نـــانی ئێوارەیـان خـــوارد وخـــەڵکەکەش ڕۆشتن ) .

( أنس ) ووتی : ( أبو طلحة ) چووە ناو جێگەکەیـەوە وسەری نـــایەوە ، دوای ئەوە ( أم سليم ) هەستاو خۆی بۆن خۆش کرد ، ( و زۆر جوانتر لەوەوپێش خۆی بۆ ڕازاندەوە ) دوای ئەوە هـات و چووە ناو جێگەکەیەوە لەگەڵیدا دوای ئەوە هـەر ئەوەنـدە بۆنی عەترەکەی کرد ئەوەبوو کـــــەهەر پیاوێك لــــەگەڵ خێزانیدا ئەنجامی دەدات ) ، ( پاشان لـە کۆتایی شەودا ) ( أم سليم ) وتی : ئەی ( أبـــو طلحــــة ) ئەگـەر کەسـانێك شـتێك بخەنـە لای کەسـانێك بـە ئەمانـەت دوای ئـەوە داوای ئەمانەتەکەیان بکەنەوە دەتوانن نەیاندەنەوە ؟ ئەویش وتـی : نەخێر ، ( أم سليم ) یش وتـی : دەی خـوای گـەورە ئەمانـەتێکی دابووە بـە تـۆ کـە کوڕەکـەت بـوو ، پاشـان بردیـەوە ، جا ئـارام بگـرە و چاوەڕوانی پاداشتی خـوا بکـە !! ئەویش تـوڕە بـوو و وتـی : وازت لـێ نـەهێنام هـەتاکو ئـەوەی کـە کردم کردم ، دوای ئەوە هەواڵی مردنی کوڕەکەم پـێ ڕادەگەیـەنیت !!! پاشـان سوپاس و ستایشی خوای کرد ، وە ( کە بـەیانی هـات خـۆی شـۆرد ) دوای ئـەوە ڕۆیشت بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ( نوێژی بەیانی لەگەڵدا کرد ) دوای ئەوە ڕوداوەکەی بۆ باس کرد ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ پێی فەرموو : بەرەکەتی خوا ڕژابێت بەسەرتاندا لەو شەوەدا دوای ئەوە ( أم ســـليم ) لـەو شـەوەدا سکی پڕ بوو ( أم سليم ) لەگەڵ پێغەمبـەردا ﷺ دا سـەفەری دەکـرد ، کاتێك لەمەدینـە دەربچوایە ئەویش دەردەچوو ، و کاتێك بگەڕایەتەوە دەگەڕایەوە ، و پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ئەگەر

مندالّی بوو ئەوا كوڕەكەم بۆ بهێنن ، ( أنس ) وتـی : پێغەمبەری خـوا ﷺ لـە سـەفەرێكدا بـوو و ( أم سليم ) یشی لەگەڵدا بوو ، و پێغەمبەری خوا ﷺ لەكاتێكدا دەگەڕایەوە بۆ مدینە یەكسەر نەدەهاتە ناو ( مدينة ) لەمدینە نزیك بونەوە و ( أم سليم ) كەوتە حاڵەتی منداڵ بوون ، و ( أبـو طلحـة ) لای مایەوە ، و دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەستی كرد بەڕۆیشتن بۆ مدینـە ، ( أبو طلحـة ) وتـی خوایـە گیان تۆ دەزانی من حەزدەكەم لەگەڵ پێغەمبەرەكەتدا دەرچم كاتێك دەردەچێت ، و لەگەڵیدا بچمە مەدینەوە كاتێك دەگەڕێتەوە ، بـەلاَم بەستراومەتەوە بـەوە كـە دەبینـی ، ( أنس ) وتـی : ( أم سليم ) دەڵێت : ئەی ( أبو طلحـة ) وتی : وە لـەكاتی گەڕانەوەیدا ، تووشی حاڵـەتی منداڵبوون بوو ) و كوڕێكی بوو ، ( أم سليم ) بە ( أنس ) ی كـوڕی وت : ئەی ( أنـس ) ! ئەم منداڵە هیچ خواردنێك نـاخوات هەتاكـو دەیبەیتـە لای پێغەمبـەر ﷺ ( وچـەند خورمایـەكی لەگەڵـدا نـارد ) وتـی : منداڵەكە هەر دەگریا ، ومنیش خۆم دابوو بەسەریدا ، تاكو ڕۆژ ببێتەوە ، و بڕۆم بۆ لای پێغەمبـەر ﷺ ( و عابایەكی بەسەرشانەوە بوو ) كاتێك كە سەیری منداڵەكەی كرد بە ( أنس ) ی وت : دەڵێی كچی ( ملحان ) منداڵی بووە ؟ وتی بەڵێ : ( وتی : بوەستە تاكو دەستم بەتاڵ دەبێت بۆت ) وتـی : ئینجا ئەوەی بەدەستیەوە بوو فڕێیدا ومنداڵەكەی هەڵگرد و وتی : هیچ شتێكی پێیە ؟ وتیـان : بەڵێ ، چەند خورمایەك ) پێغەمبەر ﷺ چەند خورمایەكی برد وجاوی و لەگەڵ لیكی پێغەمبـەردا ﷺ تێكەڵ بـوو ، ( دوای ئـەوە دەمی منداڵەكەی كردەوە دەیساوی بـە نـاودەمی منداڵـەكـە ( بـە ملاشـوويدا ) و منداڵەكـەش تـامی دەمـی بـۆ دەدایـەوە ( تـامی شـیرینی خورماكـە ولیكـی پێغەمبەری دەكرد ﷺ ، یەكەم شتێك كە گەدەی ئەو منداڵەی پـێ كرایـەوە لیكـی پێغەمبـەری خـوا بوو ﷺ ، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمـووی : سـەیری خـۆشەویستی ( أنصـار : پشتیوانـان ) بكـەن بـۆ خـورما ( دەڵێت : وتم ئەی پێغەمبـەری خوا ﷺ نـاوی بنـێ ، دەڵێ : دەم وچاوی سڕی ، و ناوی لێنا ( عبدالله ) ، ( هیچ گەنجێك لەناو ( أنصار ) دا وەكو ئەو جوان و چاك نـەبوو ) و لـە نـەوەی ئەو پیاوێكی زۆر بەجێما ، و ( عبدالله ) لە ولاَتی فارس شەهید بوو ) .

## ( ٦ ) چی حەرامە لەسەر كەس وكاری مردووەكە ( ما يحرم على أقارب الميت ) :

٢٢ ـ پێغەمبەری خوا ﷺ چەند شتێكی حەرام كردووە كە جاران وئێستاش هەر بەردەوام هەندێك لە خەڵك ئەنجامیان دەدەن ، كاتێك كە مردوویەكیان دەمرێت ، كە پێویستە لە سەرمان بیانزانین بۆ ئەوەی لێیان دوور بكەوینەوە ، بۆیە زۆر پێویستە ڕوون بكرێنەوە :

أ ـ شیوەن كردن : كە چەند فەرموودەیەكی لەسەرە :

١ ـ " أربع في أمتي من أمر الجاهلية ، لا يتركونهن : الفخر في الاحساب ، والطعن في الانساب ، والاستسقاء بالنجوم ، والنياحة ، وقال : النائحة إذا لم تتب قبل موتها ، تقام يوم القيامة وعليها سربال من قطران ، ودرع من جرب " [٦٦] .

واتە : چوار شت لە ئوممەتەكەمدا هەن لەئیشی نەفامین ، و وازی لیٚ ناهێنن : فەخر كردن بەبنەماڵە و تانەدان لە ڕچەڵەك ، و باران بارین دانە پاڵ ئەستێرەكان ، و شیوەن كردن ، وە فەرمووی : ئەو ئافرەتەش كە شیوەن دەكات تەوبە نەكات پێش مردنی ، لە قیامەتدا زیندوو دەكرێتەوە ، و شەرواڵێكی لە پێدایە لە مسی تواوەیە ، وە كراسێكیشی لە بەر دایە لە گەڕی .

٢ ـ " اثنتان في الناس هما بهم كفر : الطعن في النسب ، والنياحة على الميت " [٦٧] .

واتە : دوو شت هەن لەئومەتەكەمدا بە كوفر دادەنرێن ، ئەوانیش : تانەدان لە ڕەچەڵەك ، و شیوەن كردن لەسەر مردوو .

٣ ـ " لما مات إبراهيم ابن رسول الله ﷺ صاح أسامة بن زيد ، فقال رسول الله ﷺ ليس هذا مني ، وليس بصائح حق ، القلب يحزن ، والعين تدمع ، ولا يغضب الرب " [٦٨] .

واتە : كاتێك ( إبراهيم ) ی كوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد ( أسامة ) ی كوڕی ( زيد ) هاواری كرد ، پێغەمبەری خوا فەرمووی : ئەوە لەمن نیە ، وهاوار كەرێكی ڕاست نیە ، دڵ تەنگ دەبێت ، وچاویش فرمێسك دەڕێژێت ، وناشبێت بە كردەوەكانمان خوا لە خۆمان تووڕە بكەین .

٤ ـ لە ( أم عطية ) ەوە دەگێڕنەوە كە فەرمووی : " أخذ علينا رسول الله ﷺ مع البيعة ألا ننوح ، فما

---

[٦٦] رواه مسلم ( ٣ / ٤٥ ) والبيهقي (٦٣/٤) من حديث أبي مالك الاشعري .

[٦٧] رواه مسلم (٥٨/١) والبيهقي ( ٤ / ٦٣ ) وغيرهما من حديث هريرة .

[٦٨] رواه ابن حبان ( ٧٤٣) والحاكم ( ١/ ٣٨٢) عن أبي هريرة بسند حسن .

وفت منا امرأة ( تعني من المبايعات ) إلا خمس ، أم سليم ، أم العلاء ، وابنة أبي سبرة امرأة معـــاذ ، أو ابنـــة أبي سبرة ، وامرأة معاذ " [٦٩] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بەیعەتدا پەیمانی لێ وەردەگرتین کە شیوەن نەکەین ، کەچی هیچ کەسێك لەو ئافرەتانەی کە بەیعەتیان دا پەیمانەکەیان بەجێ نەهێنا ، جگە لە پێنج ئافرەت نەبێت : دایکی ( سليم ) ، ودایکی ( العلاء ) و کچەکەی باوکی ( سبرة ) کە خێزانی ( معـــاذ ) بوو ، یان کچی باوکی ( سبرة ) ، وخێزانی ( معاذ ) .

٥ ـ لە ( أنس ) ی کوڕی ( مـــــالك ) ەوە : " أن عمر بن الخطـــــاب لمـــا طعن عولت عليه حفصة ، فقـــــال : يـــــا حفصة أما سمعت رسول الله ﷺ يقول : المعول عليه يعذب ؟! وعـــــول عليه وفي أخرى : ( في قبره ) بمـــــا نيح عليه " [٧٠] .

واتە : کاتێك کە ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) لێی درا ( طعن ) ، ( حفصة ) ەی کچی دەستی کرد بە هات و هاوار بەدەنگی بەرز ، ( عمر ) یش وتی : ئەی ( حفصة ) نەتبیستووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ئەو کەسەی کە شیوەنی بەسەردا بکرێت ئازار دەدرێت ؟! .

٦ ـ " إن الميت يعذب ببكاء أهله عليه " وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : " الميت يعذب في قبره بمـــا نيح عليه " [٧١] ، واتە : بەڕاستی مردوو ئازار دەدرێت بە هۆی هەندێك لەگریانی کەس وکارەکەی لەسەری ، وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە : مردوو ئازار دەدرێت لە گۆڕەکەیدا بەو شیوەنەی کە لەسەری دەکرێت .

٧ ـ " من ينح عليه ، يعذب بما نيح عليه ( يوم القيامة ) " [٧٢] ، [٧٣] .

---

[٦٩] رواه البخاري ( ٣/ ١٣٧) ومسلم ( ٣/ ٤٦) واللفظ له ، والبيهقي ( ٤/ ٦٢) وغيرهم .

[٧٠] أخرجه البخاري ومسلم والسياق له والبيهقي ( ٤ / ٧٢ – ٧٣ ) وأحمد ( رقـــم ٢٦٨ ، ٢٨٨ ، ٢٩٠ ، ٣١٥ ، ٣٣٤ ، ٢٥٤ ، ٣٨٦ ) من طرق عن عمر مطولا ومختصرا ، وروى ابن حبان في " صحيحه " ( ٧٤١ ) . قصة حفصة فقط .

و ( صهيب ) بەدەنگی بەرز دەگریا لەسەری ( دەیوت ئای براکەم ! ئای هاوڕێکەم ) عمر وتی : ئەی صهيب ! ئەوە نازانیت کە ئەو کەسەی بەسەریدا بەدەنگی بەرز بگرین ئازار دەدرێت ؟! ( لە ڕیوایەتێکدا ) : بەڕاستی مردوو ئازار دەدرێت بەهەندێك گریانی کەس وکارەکەی لەسەری ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا ( لە گۆڕەکەی ) دا بەو شیوەنەی کە لەسەری کراوە ) .

[٧١] أخرجه الشيخان وأحمد من حديث ابن عمر ، والرواية الاخرى لمسلم وأحمد ورواه ابن حبان في صحيحه(٧٤٢) من حديث عمران بن حصين نحو الرواية الاولى.

[٧٢] أخرجه البخاري ( ٣ / ١٢٦ ) ومسلم ( ٣ / ٤٥ ) والبيهقي ( ٤ / ٧٢) وأحمد ( ٤/ ٢٤٥ ، ٢٥٢ ، ٢٥٥ ) .

[٧٣] في هذا الحديث بيان أن البكاء المذكور في الحديث الذي قبله ، ليس المراد به مطلق البكاء ، بل بكاء خاص وهو النياحة ، وقد أشار إلى هذا حديث عرم المتقدم في الرواية الثانية وهو قوله : " ببعض بكاء... " .

واتە : هەركەسێك شیوەنی لەسەر بكرێت ئازار دەدرێت بە هۆی ئەو شیوەنەی كە لەسەری كراوە ( لەڕۆژی قیامەتدا ) .

٨ ـ أ ـ لە ( النعمان ) ی كوڕی ( البشیر ) ەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أغمي على عبد الله بن رواحة ﷺ ، فجعلت أخته عمرة تبكي : واجبلاه ، واكذا ، واكذا ، تعدد عليه ، فقال حين أفاق : ما قلت شيئا إلا قيل لي ، كذلك !؟ فلما مات لم تبك عليه " [٧٤] .

واتە : ( عبدالله ) كوڕی ( رواحة ) لە هۆشی خۆی چووەوە ( یان : بێ هۆش كەوت ) ( عمره ) ی خوشكیشی دەستی كرد بەگریان و دەیووت : ئای شاخەكەم ، ئای ئەوە ، ئای ئەوە ، سیفەتەكانی دەژمارد لەسەری ، كاتێك بەهۆشدا هات وتی: هیچ شتێكت نەدەووت ئیللا بەمنیان دەووت بە هەمان شێوە !؟ پاشان كاتێك كەمرد لەسەری نەگریا .

وە هەر لەم بابەتەدا چەندەها فەرموودەی تر هەن ، لەم بڕگەیە ـ بە پشتیوانی خوای پەروەردگار. باسیان دەكەین :

ب ، ج . لە ڕوومەت دان ، و یەخە دادڕین : لە بەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " ليس منا من لطم الخدود ، وشق الجيوب ، ودعى بدعوى الجاهلية " [٧٥] .

واتە : لە ئێمە نیە هەر كەسێك لە ڕوومەت بدات ، و یەخەی دابدڕێت ، و بانگەشە بۆ كار و كردەوەی سەردەمی نەفامی بكات .

---

ثم إن ظاهر هذا الحديث واللذين قبله مشكل ، لانه يتعارض مع بعض أصول الشريعة وقواعد ها المقررة في مثل قوله تعالى : " ولا تزر وازرد وزر أخرى " ، وقد اختلف العلماء في الجواب عن ذلك على ثمانيد أقوال ، وأقربها إلى الصواب قولان :

الأول : ما ذهب إليه الجمهور ، وهو أن الحديث محمول على من أوصى بالنوح عليه ، أو لم يوص بتركه مع علمه بأن الناس يفعلونه عادة .
ولهذا قال عبد الله بن المبارك : " إذا كان ينهاهم في حياته ففعلوا شيئا من ذلك بعد وفاته ، لم يكن عليه شيء " (عمدة القارئ ( ٤ / ٧٤ ) ، والعذاب عند هم بمعنى العقاب .

والآخر : أن معنى " أي يتألم بسماعه بكاء أهله ويرق لهم ويحزن ، وذلك في البرزخ ، وليس يوم القيامة . وإلى هذا ذهب محمد بن جرير الطبري وغيره ، ونصره ابن تيمية وابن القيم وغيرهما . قالوا : " ليس المراد أن الله يعاقبه ببكاء الحي عليه ، والعذاب أعم من العقاب كما في قوله : " السفر قطعة من العذاب " ، وليس هذا عقابا على ذنب ، وإنما هو تعذيب وتألم " ( انظر كلام ابن تيمية في " مجموعة الرسائل المنيرية " ( ٢ / ٢٠٩ ) وابن القيم في " التهذيب : ٤ / ٢٩٠ - ٢٩٣ ) .

وقد يؤيد هذا قوله في الحديث (٥،٦) : " في قبره " وكنت أميل إلى هذا المذهب برهة من الزمن ، ثم بدا لي أنه ضعيف لمخالفته للحديث السابع الذي قيد العذاب بأنه "يوم القيامة " ، عندهم بين هذا القيد والقيد الاخر في قوله " في قبره " ، بل يضم أحدهما إلى الاخر ، وينتج أنه يعذب في قبره ، ويوم القيامة . وهذا بين إيشاء الله تعالى .

[٧٤] أخرجه البخاري والبهقي ( ٤ / ٦٤ ) .

[٧٥] رواه البخاري (٣/١٢٧ - ١٢٨، ١٢٩) ومسلم (١/٧٠) وابن الجارود (٢٥٧) والبيهقي (٤/٦٣ - ٦٤) وغيرهم من حديث ابن مسعود .

د . ڕنينى پرچ و تاشينى ، لەبەر فەرموودەى ( أبو بردة ) ەى كوڕى ( أبو موسى ) كە دەڵێت : " وجع أبو موسى وجعا فغشي عليه ، ورأسه في حجر امرأة من أهله ، فصاحت امرأة من أهله ، فلم يـستطع أن يرد عليها شيئا ، فلما أفاق قال : إنا بريء ممن بريء منه رسول الله ﷺ ، فان رسول الله ﷺ بريء من الصالقة [76] ، والحالقة ، والشاقة " [77] .

واتە : ( أبو موسى ) زۆر نەخۆش بوو بە شێوەيەك لە هۆشى خۆى چووەوە ، لەو كاتەدا سەرى لەباوەشى ئافرەتێك لە خێزانەكەى بوو ( واتە : لە كەس وكارى ) بوو ، ئافرەتێك لەكەس و كارى هاوارى كرد ، لەو كاتەدا ( أبو موسى ) نەيتوانى هيچ وڵامى بداتەوە ، بەڵام كاتێك بەهۆشدا هات ، وتى من بێ بەريم لەو كەسەى كە پێغەمبەرى خوا ﷺ لێى بێ بەرى بووە ، پێغەمبەرى خوا بێ بەرى بووە لەو ئافرەتەى كە دەنگى بەرز دەكاتەوە لەكاتى لێقەوماندا ، و ئەو ئافرەتەش كە پرچ دڕێنت يان دەيتاشێت وە ئەو ئافرەتەش كە يەخەى خۆى دادەدڕێت .

هـ . والآكردن و بڵاوكردنەوەى پرچ ، ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەيەى كە يەكێك لەو ئافرەتانە دەيگێڕێتەوە كە بەيعەتيان داوە بە پێغەمبەرى خوا ﷺ ، كە دەڵێت : " كان فيما أخذ علينا رسول الله ﷺ في المعروف الذي أخذ علينا أن لا نعصيه فيه ، وأن لانخمش وجها ولا ندعو ويلا ، ولا نشق جيبا ، وأن لا ننشر شعرا " [78] .

واتە : لەو شتانەى كە پێغەمبەرى خوا ﷺ پەيمانى لێ وەرگرتين لە سەرى ئەوەبوو كە سەرپێچى نەكەين لەو چاكانەى كە فرمانمان پێ دەكرێت ، وڕومەتى خۆمان نەڕنين ، شيوەن وواوەيلاش نەكەين ، ويەخەش دانەدڕين ، وپرچيشمان والآ وبڵاو نەكەينەوە .

و . دانانى ڕيش و نەتاشينى هەندێك لەپياوان ، لە چەند ڕۆژێكى كەمدا ، وەكو نيشانەيەك لەسەر دڵ تەنگيان بۆ مردووەكەيان ، وە ئەگەر ئەو چەند ڕۆژە كەمە تەواو بوو دەگەڕێنەوە سەر تاشينى!! ئەم ڕيش دانانەش . هەر وەكو ئاشكرايە . دەچێتە ژێر واتاى والآكردن و بلاّ كرنەوەى پرچ ، زياد لە سەر ئەوەش ئەم كارە داهێنراوە و بيدعەيە و پێغەمبەرى خواش ﷺ فەرموويەتى: " كل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار " [79] ، واتە : هەموو داهێنراوێك گومڕاييە ، و خاوەنى هەموو گومڕاييەكيش لە دۆزەخدايە .

---

[76] ئەو كەسەيە كە لە كاتى موسيبەتدا دەنگى بەرز دەكاتەوە .

[77] أخرجه البخاري(٣/١٢٩) ومسلم(١/٧٠) والنسائي(١/ ٢٦٣) والبيهقي( ٤ / ٦٤ ).

[78] أخرجه إبو داود ( ٢ / ٥٩ ) ومن طريقه البيهقي ( ٤ / ٦٤ ) بسند صحيح .

[79] رواه النسائي والبيهقي في "الاسماء والصفات"بسند صحيح عن جابر .

ر . ئاگادار كردنەوەی خەڵك بەمردنی لە مینبەر و شوێنە گشتی یەكاندا ، چونكە ئەمە لە ( النعـي ) دەژمێردرێت ، چونكە لە ( حذيفة ) ەی كوڕی ( اليمان ) ەوە پێمان گەشتووە كە : " كان إذا مات لـه الميت قال : لا تؤذنوا به أحدا ، إني أخاف أن يكون نعيا ، إني سمعت رسول الله ﷺ ينهى عن النعي " [٨٠] .

واتە : ئەگەر مردوویەكی بمردایەت دەیفەرموو : كەسی پێ ئاگادار مەكەنەوە ، چونكە دەترسم بچێتە قاڵبی ( نعي ) ، چـونكە بیستوومـە لـە پێغەمبەری خـواوە ﷺ كە نەهی دەكرد لە ( النعي ) .

وە وشـەی ( النعي ) لە زمانەوانیدا : بریتیە لە ئاگاداركرنەوەی خەڵكی بەمردنی مردووەكە ، بەم شێوەیەش هەموو ئاگادار كردنەوەیەك دەگرێتەوە ، بەڵام چەند فەرموودەیەكی ( صحيح ) مان پێگەیشتووە كە هەندێك ئاگادار كردنەوە ڕێپێدراوە و جائیزن ، بۆیە دەبینین زانایان ئەو نەهیە ڕەهایەیان ( مطلق ) سنووردار كردووە ( تقيد ) ، و فەرموویانە : مەبەست لەم نەهیە ئەو ئاگادار كردنەوەیە كە هاوشێوەیە لە گەڵ ئەوەی كە لە سەردەمی نەفامی دەیانكرد ، لەهات و هاوار و بانگەوازكردن لەبەر دەرگای ماڵان و بازاڕەكاندا ، هەروەك باسی دەكەین ، بۆیە منیش دەڵێم :

## ( ٧ ) ئاگادار كرنەوەی جائیز ( گەیاندنی هەواڵی مردن ) ( النعي الجائز ) :

٢٣ ـ جائیزە مردنی مردوو ئاشكرا بكرێت بەمەرجێك ئەو شتانەی لەگەڵدا نەبێت كە لە ئاگادار كردنەوەی نەفامی بچێت ، وە لەوانەشە ئەم ئاگادار كردنەوە پێویست بێت ئەگەر هاتوو مردووەكە كەسی نەبوو كە مافەكانی بەجێ بهێنێت لە شۆردن وكفن كردن ونوێژ كردن لەسەری و هاوشێوەی ئەوانە ، و چەند فەرموودەیەكیش لەو بارەیەوە هاتوون :

یەكەم : لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن رسـول الله ﷺ نعـى النجاشي في اليوم الذي مات فيه ، خرج إلى المصلى ، فصف بهم وكبر أربعا " [٨١] ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەی كە ( النجاشي ) مرد خەڵكی ئاگادار كردەوە ، و دەرچوو بەرە و نوێژگە ( مصلى ) و خەڵكی ڕیزكرد و چوار ( الله أكبر ) ی لەسەر كرد .

دووەم : لە ( أنس ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " أخذ

---

[٨٠] أخرجه الترمذي (٢/ ١٢٩ ) وحسنه ، وابن ماجه ( ١ / ٤٥٠ ) وأحمد ( ٥ / ٤٠٦ ) والسياق له والبيهقي ( ٤ / ٧٤ ) ، وأخرج المرفوع منه ابن أبي شيبة في " المصنف " ( ٤ / ٩٧ ) وإسناده حسن كما قال الحافظ في " الفتح " .

[٨١] أخرجه الشيخان وغيرهما ، وسيأتي ذكره بجميع زياداته من مختلف طرقه في المسألة (٦٠ ) الحديث السابع .

الراية زيد فأصيب ، ثم أخذ جعفر فأصيب ، ثم أخذها عبدالله بن رواحة فأصيب ــ وإن عيني رســول الله ﷺ لتذرفان ــ ثم أخذها خالد بن الوليد من غير إمرة ففتح له " [٨٢] ، واتە : ( زيد ) ئالآكەی هەڵگرت وشەهيد بوو ، پاشان ( جعفر ) هەڵيگرد وشەهيد بوو ، پاشان ( عبدالله ) ی كوڕی ڕەواحە هەڵيگرد وشەهيد بوو . ولەو كاتەدا چاوەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسكيان پێدا دەهاتە خوارەوە . دوای ئەوە خالدی كوڕی وەليد ئالآكەی هەڵگرد بەبێ ئەوەی كرابێت بە ئەمير خواش سەری خست .

ئيمامی ( البخاری ) ئەم فەرموودەيەی ڕيوايەت كردووە و ناونيشانی ( باب الرجل ينعى إلى أهل الميت بنفسه ) بۆ ئەم فەرموودەيە و فەرموودەكەی پێشتری داناوە ، وە پێشەوا ( الحـافظ ) يش لە لێكدانەوەی بۆ ( صحيح ) ی بوخاری فەرموويەتی : (( وفائدة هذاه الترجمة الاشارة إلى أن النعــي لــيس ممنوعا كله ، وإنما نهى عما كان أهل الجاهلية يصنعونه ، فكانوا يرسلون من يعلن بخبر موت الميت على أبــواب الدور )) ، واتە : سوودی ئەم ناونيشانە ئەوەيە كە ئاماژە دەكات بەوەی كە ئاگادار كردنەوەی خەڵكی بەمردنی كەسێك هەمووی حەرام نيە ، بەڵكو تەنها ئەو ئاگاداركردنەوەيە حەرامە كە خەڵكی سەردەمی نەفامی دەيان كرد ، بەوەی كە كەسێكيان دەنارد لەبەر دەروازەی ماڵان و لە بازاڕەكاندا ئاگاداری خەڵكی دەكردەوە بەمردنی ئەو مردووە .

منيش دەڵێم ( الشيخ الألباني ) : ئەگەر ئەمەمان لە لا ئاشكرا بوو كە قەدەغە كراوە ، ئەوا هات وهاوار و بانگ كردن لە مزگەوتەكانەوە ئەولا ترە كە قەدەغە كراو بێت و بەئاگاداركردنەوەی حەرام دابنرێت ، و لەبەر ئەوەيە لەبڕگەكەی پێش ئەم بڕگەيە ئەوەمان پشت ڕاست كردەوە ، و لەوانەشە چەند شتێكی تر لەگەڵ ئەم ئاگاداركردنەوە دابێت كە خۆی لەخۆيدا حەرام بێت ، وەكو وەرگرتنی كرێ لەسەر ئەم ئاگاداركردنەوەيە !! و ستايش كردنی مردووەكە بەوەی كە دەزانێت ئەو سيفەتەی تێدانيە ، وەكو دەڵێن : هەستن نوێژ بكەن لەسەر تەرمی سەروەری بەڕێزان و پاش ماوەی پێشينە پياوچاكەكان !!!

٢٤ ـ وە سوننەتە بۆ ئاگاداركەرەوە كە داوا لەخەڵكی بكات كە داوای لێخۆش بوون بۆ مردووەكە بكەن لەبەر فەرموودەكەی ( أبو قتادة ) كە فەرموويەتی : " بعث رسول الله ﷺ جيش الامراء ؛ عليكم زيد بن حارثة ، فإن أصيب زيد فجعفر بن أبي طالب ، فإن أصيب جعفر فعبد الله بن رواحة الانصاري ، فوثب جعفر فقال : بأبي أنت وأمي يارسول الله ما كنت أرهب أن تستعمل علي زيدا ، قال : امــضه فإنــك لا تدري أي ذلك خير ، فانطلقوا ، فلبثوا ما شاء الله ، ثم إن رسول الله ﷺ صعد المنبر ، وأمر أن ينادي الــصلاة جامعة ، فقال رسول الله ﷺ : ناب خير ، أو ثاب خير ــ شك عبدالرحمن يعني ابن مهدي ــ ، ألا أخبركم عن

---

[٨٢] أخرجه البخاري وترجم له والذي وقبله بقوله : " باب الرجل ينعى إلى أهل الميت بنفسه " .

جيشكم هذا الغازي ؟ إنهم انطلقوا فلقوا العدو ، فأصيب زيد شهيدا ، فاستغفروا له ــ فاستغفر له الناس ــ ثم أخذ اللواء جعفر بن أبي طالب ، فشد على القوم حتى قتل شهيدا ، أشهد له بالشهادة ، فاستغفروا له ، ثم أخذ اللواء عبدالله بن رواحة ، فأثبت قدميه حتى قتل شهيدا ، فاستغفروا له ، ثم أخذا اللواء خالد بن الوليد ــ ولم يكن من الامراء ، هو أمر نفسه ــ ثم رفع رسول الله ﷺ أصبعيه فقال : اللهم هو سيف من سيوفك ، فانصره ــ فمن يومئذ سمي خالد سيف الله ــ ثم قال : انفروا فأمدوا إخوانكم ، ولا يتخلفن أحد : فنفر الناس في حر شديد مشاة وركبانا " (٨٣) .

واته : پێغەمبەر ﷺ سوپای ئەمیرەکانی نارد وپێی فەرموون : زەیدی کوڕی ( حارثة ) ئەمیرتانە ، ئەگەر زید کوژرا ئەوا جەعفەری کوڕی ( أبو طالب ) ، وە ئەگەر جەعفەریش شەهید بوو ئەوا عبدالله ی کوڕی ( أبو رواحة ) ، جەعفەر داپەڕی وتی: دایك وباوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز نەترساوم کە زید بکەیتە ئەمیر بەسەرمەوە ، فەرمووی : باوابێت تۆ نازانیت کام لەوانە خێرترە و چاکترە و ڕۆیشتن ، و چەند خوا ویستی بوو مانەوە و ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەرەکە و فەرمانی کرد بانگەشە بکرێت خەڵك کۆبکرێتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خێرێك ڕووی داوە یان خێرێك بوو . گومان لە ( عبدالرحمن ) ە ، واتە : کوڕی مەهدی . ئایا هەواڵی ئەو سوپایەتان پێ نەڵێم کە دەرچووە بۆ شەڕ ؟ بەڕاستی ئەوان ڕۆیشتن وگەیشتن بەدوژمن ، و زید شەهید کرا ، داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکەن خەڵکیش داوای لێ خۆشبونیان بۆ کرد . دوای ئەوە ئاڵاکە جەعفەری کوڕی ( أبو طالب ) هەڵی گرد و زۆر توند بوو لەسەر دوژمن هەتاوەکو شەهید کرا ، گەواهی شەهید بوونی بۆ دەدەم ، داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکەن ، دوای ئەوە عبدالله ی کوڕی ( رواحة ) ئاڵاکەی هەڵگرت ، خۆی جێگیرکرد هەتاوەکو شەهید کرا ، داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکەن ، دوای ئەوە خالدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی هەڵ گرد . لە ئەمیرەکان نەبوو ، خۆی خۆی کرد بە ئەمیر . پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی بەرز کردەوە و فەرمووی خوایەگیان ئەو ( خالدی کوڕی وەلید ) شمشێرێکە لەشمشێرەکانی تۆ سەری بخە . هەر لەو ڕۆژەوە خالد ناوبرا بە شمشێری خوا . دوای ئەوە فەرمووی : بڕۆن بۆ یارمەتی دانی براکانتان ، هیچ کەسێك بەجێ نەمێنێت : خەڵکی کەوتنە ڕێ بۆ یارمەتی دانیان لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا بە پیادە و بە سواریەوە .

هەر لەم باسەدا لە ( أبو هريرة ) و جگە لەویش دەگێڕنەوە کە لە کاتی مردنی ( النجاشي ) دا پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی ئەوی پێگەیاندن و فەرمووی :

---

(٨٣) أخرجه أحمد (٥/٣٠٠،٢٩٩– ٣٠١) وإسناده حسن .

" استغفروا لأخـيكم " ، واتـه : داواى لێخۆش بوون بـۆ براكـەتان بكـەن ، وە ئەمـەش لـــە باسـى ژمارە (٦٠) دا بـاسـى لێوە دەكرێت لـه پەڕەى ( ) [٨٤] .

## ( ٨ ) نيشانەكانى ئاخر خێرى ( عاقيبەت خێرى ) ( علامات حسن الخاتمة ) :

٢٥ ـ پاشان خاوەن شەرعى دانا چەند نيشانەيەكى ڕوون و ئاشكراى داناوە بۆ ئەوەى بەڵگە بن لەسەر ئاخر خێرى ( عاقيبەت خێرى ) ـ خواى گەورە بەفەزڵى خۆى بۆمانى بنوسێت و بە نسيبمانى بكـات . جـا هـەر كەسێك بمرێت بەيەكێك لـەو نيشانانە ئـەوە مـوژدەى خێرە بـۆى وە ئـاى چ موژدەيەكى خێرە .

**يەكەم : وتنى شايەتوومانەلە سەرەمەرگدا ، و چەند فەرموودەيەك لەو بارەيەوە هەن :**

١ ـ " من كان آخر كلامه لا إله إلا الله ، دخل الجنة " [٨٥] .

واتە : هەر كەسێك دوا وتەى ( لا إله إلا الله ) بێت دەچێتە بەهەشتەوە .

٢ ـ لـە ( طلحة ) ەى كوڕى ( عبيدالله ) وە فـەرمووى : " رأى عمر طلحة بن عبيد الله ثقيلا ، فقـال : مالك يا أبا فلان ؟ لعلك ساءتك امرأة عمك يا إبا فلان ؟ قال : لا ( وأثنى على أبي بكر ) إلا أني سمعت من رسول الله ﷺ حديثا ما منعني أن أسأله عنه إلا القدرة عليه حتى مات ، سمعته يقول : إني لاعلم كلمة لا يقولها عبد عند موته إلا أشرق لها لونه ، ونفس الله عنه كربته ، قال : فقال عمر : إني لاعلم ماهي ! قال : وما هي ؟ قال : تعلم كلمة أعظم من كلمة أمر بها عمه عند الموت : لا إله إلا الله ؟ قال طلحة : صدقت ، هي والله هي " [٨٦] .

واتە : ( عمر ) ى كوڕى ( خطاب ) ( طلحة ) ەى كوڕى ( عبيـدالله ) ى بينـى و پـێى وت : ئەوە چيتە باوكى فلان ؟ ڕەنگە خێزانى مـامت هەڵسو كەوتى خراپى لە گەڵ كردبێت ؟! وتى : نەخێر . ( وە ستايشى ابو بكرى كرد ) بەڵام فەرموودەيەكم لە پێغەمبەرى خـواوە ﷺ بيستووە نەمتوانى پرسيارى سەبارەت بكـەم تـاكو كۆچـى دواى كـرد ، بيستم دەيفـەرموو من وشـەيەك دەزانم هـيچ

[٨٤] ومما سبق تعلم أن قول الناس اليوم في بعض البلاد : " الفاتحة على روح فلان " مخالف للسنة المذكورة ، فهو بدعة بلا شك ، لا سيما والقراءة لا تصل إلى الموتى على القول الصحيح كما سيأتي تفصيله إن شاء الله تعالى .

[٨٥] أخرجه الحاكم وغيره بسند حسن عن معاذ . وله شاهد من حديث أبي هريرة تقدم في " اللقين " فقرة ( أ ) ص ١٠ .

[٨٦] أخرجه الامام أحمد ( رقم ١٣٨٤ ) وإسناده صحيح ، وابن حبان ( ٢ ) بنحوه ، والحاكم ( ١ / ٣٥٠ ، ٣٥١ ) والزيادة له ، وقال " صحيح على شرطهما " ووافقه الذهبي .

كەسێك نیە بیڵێت لەسەرەمەرگیدا ئیللا ڕەنگی پێی گەش دەبێت ، وخوای گەورەش ناڕەحەتی مردنی لەسەر سووك دەكات ، عمر فەرمووی : من دەزانم ئەو وشەیە چیە؟ ، وتی : چیە؟ فەرمووی : وشـــەیەك دەزانیـــت گـــەورەتربێت لـــەو وشـــەیەی كـــە پێغەمبـــەر ﷺ فـــەرمانی بـــەمامی كـــرد لەسەرەمەرگدا بیڵێت كە ( لا إله إلا الله ) بوو ؟ ( طلحة ) وتی : ڕاست دەكەیت ئەوەیە والله ئەوەیە .

وە لەم باسەدا چەندەها فەرموودەی تر هەیە لە باسی ( التلقين ) دا باس كراون .

دووەم : مردن بە ئەرەقەی نێو چاوان ، لەبەر فەرموودەكەی ( بريدة ) كوڕی ( الحصيب ) ﷺ كە فەرموویەتی : " أنه كان بخراسان ، فعاد أخا له وهو مريض ، فوجده بالموت ، وإذا هو بعرق جبينه ، فقال : الله أكبر ، سمعت رسول الله ﷺ يقول : موت المؤمن بعرق الجبين " [٨٧] .

واتە : ئەو كاتەی كە ئەو لەخۆراسان دەبێت ، دەچێت بۆ لای برایەكی كە نەخۆشە ، و دەبینێ وا لە سەرەمەرگدایە ، و بینی وا نێو چاوانی ئارەق دەكات ، وتی: ( الله أكبر ) ، گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو : مردنی ئیماندار بە ئارەقی نێوچاوانە .

سێیەم : مـــردن لـــە شـــەو و ڕۆژی هەینیـــدا ، لەبـــەر فـــەرموودەی پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ كـــە دەفەرموێت : " ما من مسلم يموت يوم الجمعة ، أو ليلة الجمعة ، إلا وقاه الله فتنة القبر " [٨٨] .

واتە : هیچ موسڵمانێك نامرێت لە ڕۆژی هەینیدا ، یان لەشەوی هەینیدا ، ئیللا خوای گەورە دەیپارێزێت لە فیتنەی گۆڕ .

چوارەم : شەهید بوون لە گۆڕەپانی جەنگدا ، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّـذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّـذِينَ لَـمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ ( سورة آل عمران : ١٦٩ ــ ١٧١ ) .

هەر لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك هاتوون :

١ . " للشهيد عند الله ست خصال : يغفر له في إول دفعة من دمه ، ويرى مقعده من الجنة ، ويجـــار مـــن

---

[٨٧] اخرجه أحمد ( ٥/٣٦٠،٣٥٧) والسياق له ، والنسائي (٢٥٩/١) والترمذي (١٢٨/٢) وحسنه ، وابن ماجـه (١/ ٤٤٣-٤٤٤) وابن حبان(٧٣٠) والحاكم(٣٦١/١) والطيالسي (٨٠٨) وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " ووافقه الذهبي ! وفيه نظر لا مجال لذكره هنا ، لا سيما وأن أحد إسنادي النسائي صحيح على شرط البخاري ... وله شاهد من حديث عبد الله بن مسعود ﷺ . رواه الطـبراني في " الاوسط " و" الكبير "ورجاله ثقات رجال الصحيح ،كما في " المجمع " ( ٢ / ٣٢٥ ) .

[٨٨] اخرجه أحمد (٦٥٨٢-٦٦٤٦)من طريقين عن عبد الله بن عمرو ، والترمذي من أحد الوجهين ، وله شواهد عن أنس وجابر بن عبد الله ، وغيرهما ، فالحديث بمجموع طرقه حسن أو صحيح ( راجع " تحفة الاحوذي " ) .

عذاب القبر ، ويأمن الفزع الاكبر ، ويحلى حلية الايمان ، ويزوج من الحور العين ، ويشفع في سبعين إنسانا من أقاربه " [٨٩] .

واتە : شەهید شەش شتی بۆ دەبێت لە خوای گەورە : لەگەڵ یەكەم دڵۆپە خوێنیدا خوای گەورە لێی خۆش دەبێت ، و جێگەی لە بەهەشتدا پێی نیشان دەدرێت ، لە ئازاری گۆڕ رزگاری دەبێت ، لە ( فزع الأكبر ) بێ ترسە ، و پۆشاكی ئیمانی لەبەر دەكرێت ، و لە بەهەشتدا حۆری دەبێت بەخێزانی ، و شەفاعەت بۆ حەفتا كەس لە كەس وكاری دەكات .

٢ . لە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أن رجلا قال : يارسول الله ! ما بال المؤمنين يفتنون في قبورهم إلا الشهيد ؟ قال : كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة " [٩٠] .

واتە : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ئیمانداران لەگۆڕدا تووشی ( فیتنە ) دێن جگە لە شەهید نەبێت ؟ فەرمووی : بروسكەی شمشێرەكانی سەر سەری لە كاتی تێكۆشاندا بەسە كە فیتنە بن بۆی .

ڕوونكردنەویەك : ئەم شەهید بوونە دەخوازرێت بۆ كەسێك كە بە نیەت پاكییەوە و لە دڵەوە داوای بكات ، ئەگەر چی بۆشی نەڕەخسا شەهید بێت لە گۆڕەپانی جەنگدا ، بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " من سأل الله الشهادة بصدق ، بلغه الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه " [٩١] ، واتە : هەر كەسێك بەڕاستی داوای شەهادەت لەخوا بكات ، خوای گەورە دەیگەیەنێتە پلەی شەهیدان ، ئەگەر لەسەر جێگەی خۆیشی بمرێت .

پێنجەم : مردن لەكاتی غەزاكردن و تێكۆشان لەپێناوی خوادا ، و ئەوەش دوو فەرموودەی لەسەرە :

١ . " ما تعدون الشهيد فيكم ؟ قالوا : يارسول الله من قتل في سبيل الله فهو شهيد ، قال : إن شهداء أمتي إذا لقليل ، قالوا : فمن هم يارسول الله ؟ قال : من قتل في سبيل الله فهو شهيد ، ومن مات في سبيل الله فهو شهيد ومن مات في الطاعون فهو شهيد ، ومن مات في البطن [٩٢] فهو شهيد ، والغريق شهيد " [٩٣] .

---

[٨٩] أخرجه الترمذي (١٧/٣) وصححه ،وابن ماجه (٢/ ١٨٤) وأحمد (١٣١)وإسناده صحيح، ثم أخرجه (٤/٢٠٠)من حديث عبادة بن الصامت ومن حديث قيس الجذامي (٤/٢٠٠) وإسنادهما صحيح أيضا .

[٩٠] رواه النسائي ( ٢٨٩/١) وعنه القاسم السرقسطي في " الحديث " ( ١/١٦٥/٢) وسنده صحيح .

[٩١] أخرجه مسلم (٤٩/٢) والبيهقي (١٦٩/٩) عن أبي هريرة .وله في "المستدرك " (٢/ ٧٧) شواهد .

[٩٢] واتە : بە نەخۆشی سك ، كە بریتیە لە (استسقاء ) و ئاوسانی سك ، وە ووتراوە : بریتیە لە سك چوون ، وە ووتراویشە : بریتیە لە سكە ئێشە .

[٩٣] أخرجه مسلم (٥١/٦) وأحمد (٥٢٢/٢) عن أبي هريرة . وفي الباب عن عمر عند الحاكم ( ١٠٩/٢) والبيهقي .

واتە : ئێوە چ کەسێك بەشەهید دەژمێرن لە نێوانتاندا ؟ وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی لەپێناوی خوادا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، فەرمووی : کەواتە بەڕاستی شەهیدەکانی ئوممەتی من کەمن ، وتیان ئەی شەهیدەکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : هەر کەسێك لەپێناوی خوادا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، و هەر کەسێك لەپێناوی خوادا بمرێت ئەوە شەهیدە ، و هەر کەسێك لە ( طاعون ) دا بمرێت ئەوە شەهیدە ، و هەر کەسێك بەدەردی سك بمرێت ئەوە شەهیدە ، و خنکاویش شەهیدە .

٢ . " من فصل ( أي خرج ) في سبيل الله فمات أو قتل فهو شهيد ، أو وقصه فرسه أو بعيره ، أو لدغته هامة ، أو مات على فراشه بأي حتف شاء الله فإنه شهيد وإن له الجنة " [٩٤] .

واتە : هەر کەسێك لە ماڵ دەرچێت بە مەبەستی تێکۆشان لە پێناوی خوادا ، و لەو ڕێگەدا بمرێت یان بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، یان لە ئەسپەکەی یان وشترەکەی بەربێتەوە و بمرێت ، یان مار و دوپشك پێوە بدات ( بیگەزێت ) ، یان لەسەر جێگەی خۆی بەهەر کارەساتێك کە خوا بیەوێت بمرێت ئەوە شەهیدە و بەڕاستی بەهەشت بۆ ئەوە .

شەشەم : مردن بە نەخۆشی کۆلێرا ( طاعون ) ، و چەند فەرموودەیەکی لەسەرە :

١ . لە ( حفصة ) ی کچی ( سیرین ) ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ( أنس ) ی کوڕی ( مالك ) پێی فەرمووم : ( یحیى ) ی کوڕی ( أبو عمر ) بەچی مرد ؟ وتم : بە ( طاعون ) ، فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " الطاعون شهادة لكل مسلم " [٩٥] ، واتە : نەخۆشی کۆلێرە ( طاعون ) شەهید بوونە بۆ هەموو موسڵمانێك .

٢ . لە ( عائشة ) وە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە دەربارەی نەخۆشی کۆلێرە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندووە : " أنه كان عذابا يبعثه الله على من يشاء ، فجعله الله رحمة للمؤمنين ، فليس من عبد يقع الطاعون ، فيمكث في بلده صابرا يعلم أنه لن يصيبه إلا ماكتب الله له ، إلا كان له مثل أجر الشهيد " [٩٦] .

واتە : نەخۆشی کۆلێرا سزا و ئازارێك بووە کە خوای گەورە دەینارده سەر هەر کەسێك کە بیویستایەت ، خوای گەورە کردی بە ڕەحمەت بۆ ئیمانداران ، جا هەر بەندەیەك لە شوێنێکدا بێت ئەو نەخۆشیە تێیدا بێت ، و لەو شوێنەدا بمێنێتەوە و ئارام بگرێت و بزانێت هیچ شتێکی تووش

---

[٩٤] أخرجه أبو داود ( ١/٣٩١) والحاكم ( ٢/ ٧٨) والبيهقي (٩/ ١٦٦) من حديث أبي مالك الاشعري ، وصححه الحاكم ، وإنما هو حسن فقط .

[٩٥] أخرجه البخاري (١٠ / ١٥٦ – ١٥٧) والطيالسي ( ٢١١٣ ) وأحمد ( ٣/ ١٥٠، ٢ ٢٠ ، ٢٢٣ ، ٢٥٨ – ٢٦٥) .

[٩٦] أخرجه البخاري(١٠/١٥٧–١٥٨)والبيهقي (٣/٣٧٦)وأحمد(٦/٦٤،١٤٥،٢٥٢) .

نابێت ئەوە نەبێت کە خوا بۆی نوسیووە ، ئیللا وەکو شەهید پاداشتی بۆ دەنوسرێت .

٣ . " يأتي الشهداء والمتوفون بالطاعون ، فيقول أصحاب الطاعون : نحن شهداء ، فيقال : انظروا فإن كانت جراحهم كجراح الشهداء تسيل دما ريح المسك ، فهم شهداء ، فيجدونهم كذلك " .

واتە : لە ڕۆژی دواییدا شەهیدەکان و ئەوانەی کە بە نەخۆشی کۆلێرا ( طاعون ) مردوون دێن ، ئەوانەی بە ( طاعون ) مردوون دەڵێن : ئێمە شەهیدین ، دەوترێت : سەیریان بکەن ئەگەر برینەکانیان وەکو برینی شەهید خوێنی لێ دەهات و بۆنی میسکی بوو ، ئەوا شەهیدن ، دەیانبینن بەو شێوەیەن .

حەوتەم : مردن بە هۆی سک ئێشەوە ، وە لەو بارەیەوە دوو فەرموودەمان هەیە :

١ . " ... ومن مات في البطن فهو شهيد " [٩٧] .

واتە : وە ئەو کەسەش کە لە سک ئێشەدا بمرێت شەهیدە .

٢ . لە ( عبدالله ) ی کوڕی ( يسار ) ەوە فەرمووی : " كنت جالسا وسليمان بن صرد و خالد بن عرفطة ، فذكروا رجلا توفي ، مات ببطنه ، فإذا هما يشتهيان أن يكونا شهداء جنازته فقال أحدهما للآخر : ألم يقل رسول الله ﷺ : من يقتله بطنه فلن يعذب في قبره ؟ فقال الآخر : بلى " وفي رواية " صدقت " [٩٨] .

واتە : لە گەڵ ( سليمان ) ی کوڕی ( صرد ) و ( خالد ) ی کوڕی ( عرفطة ) دانیشتبووین و باسی پیاوێکیان دەکرد بە سک ئێشە مردبوو ، بینیانم هەردووکیان حەزیان لێ بوو ئامادەی جەنازەکەی ببن ، یەکێکیان بەوی تریان وت : ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە : هەر کەسێك سکی بیکوژێت لە گۆڕەکەیدا ئازار نادرێت ؟ ئەوی تریشیان وتی : بەڵێ ، وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە : ڕاستت فەرموو .

هەشتەم ونۆیەم : مردن بە لەناودا خنکان و دیوار بەسەردا ڕمان ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ : " الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ : الْمَطْعُونُ ، وَالْمَبْطُونُ ، وَالْغَرِيقُ ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ " [٩٩] ، واتە : شەهیدەکان پێنجن : ئەو کەسەی کە بمرێت بە هۆی کۆلێراوە ( المطعون ) ، وە ئەو کەسەی کە بەسکە ئێشە دەمرێت ، و خنکاو ، و ئەو کەسەی شتێکی بەسەردا دە ڕوخێت ، شەهیدیش لە پێناوی خوادا .

---

[٩٧] رواه مسلم وغيره ،وتقدم بتمامه في " الخامسة " .

[٩٨] أخرجه النسائي ( ١ / ٢٨٩ ) والترمذي ( ٢ / ١٦٠ ) وحسنه ، وابن حبان في صحيحه ( رقم ٧٢٨ – موارد ) والطيالسي ( ١٢٨٨ ) وأحمد ( ٤ / ٢٦٢ ) وسنده صحيح .

[٩٩] أخرجه البخاري ( ٦ / ٣٣ – ٣٤ ) ومسلم ( ٦ / ٥١ ) والترمذي ( ٢ / ١٥٩ ) وأحمد ( ٢ / ٣٢٥ ، ٥٣٣ ) من حديث أبي هريرة .

دەیەم : مردنی ئافرەت لە زەیسانی بە هۆی منداڵەکەیەوە : ئەوەش لەبەر فەرموودەکەی ( عبادە ) ی کوڕی ( صامت ) : " إن رسول الله ﷺ عاد عبد الله بن رواحة قال : فما تحوز [١٠٠] له عن فراشه ، فقــال : أتدري من شهداء أمتي ؟ قالوا : قتل المسلم شهادة ، قال : إن شهداء أمتي إذا لقليل ! قتل المســلم شــهادة ، والطــاعون شهادة والمرأة يقتلها ولدها جمعاء [١٠١] شهادة ، ( يجرها ولدها بسرره [١٠٢] إلى الجنة ) " [١٠٣] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای ( عبداللە ) ی کوڕی ( رواحة ) کاتێك کە نەخۆش بوو ، ڕاوی دەڵێت : نەیتوانی کەمێك خۆی لابدات لەسەر جێگەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ئایا دەزانیت شەهیدەکانی ئوممەتی من کێن ؟ وتیان : کوژرانی موسلمان شەهیدیە ، ئەویش فەرمووی : ئەگەر تەنها وابێت کەواتە بەڕاستی شەهیدەکانی ئوممەتی من کەمن ! کوژرانی موسڵمان شەهیدیە ، مردن بە نەخۆشی کۆلێرا ( طــاعون ) شەهیدیە ، و ئافرەت منداڵەکەی لە سکیدا بیکوژێت شەهیدیە ، ( منداڵەکەی بە ناوکەکەی ڕایدەکێشێت بۆ بەهەشت .

یانزەیەم و دوانزەیەم : مردن بەسووتان و بە دومەڵێك کە لەژێر پەراسووەکاندا دەردەچێت ( ذات الجنب ) [١٠٤] ، و چەند فەرموودەیەکی لەسەرە بڵاوترینیان لە ( جابر ) ی کوڕی ( عتيك ) کە دەیداتە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : " الشهداء سبعة سوى القتل في سبيل الله : المطعون شهيد ، والغرق شهيد ، وصاحب ذات الجنب شهيد ، والحرق شهيد ، والذي يموت تحت الهدم شهيد ، والمــرأة تموت بجمع [١٠٥] شهيدة " [١٠٦] .

---

[١٠٠] بالحاء المهملة والواو المشددة ، أي : تنحى .

[١٠١] هي التي تموت ، وفي بطنها ولد . انظر كلام " النهاية " في التعليق الاتي قريبا .

[١٠٢] السرة ما يبقى بعد القطع مما تقطعه القابلة ، والسرر ما تقطعه ، وهو السر بالضم أيضا .

[١٠٣] أخرجه إحمد ( ٤ / ٢٠١ – ٥ / ٣٢٣ ) والدارمي ( ٢ / ٢٠٨ ) والطيالسي ( ٥٨٢ ) وإسناده صحيح ، وله في " المسند " ( ٤ / ٣١٥ ، ٣١٧ ، ٣٢٨ ) طرق أخرى ، وفي الباب عن صفوان بن إمية عند الدارمي والنسائي( ٢٨٩/١) وأحمد (٦/ ٤٦٥)–٤٦٦ ) ، وعن عقبه بن عامر ٧ عند النسائي ( ٢ / ٦٢ – ٦٣ ) ، وعن راشد بن حبيش عند أحمد ( ٣ / ٢٨٩ ) ، ورجاله ثقــات ، وقــال المــذري في " الترغيب " ( ٢٠١/٢) : " إسناده وفيه الزيادة وهي في حديث عبادة عند الطيالسي وأحمد ، وعن جابر بن عتبك ويأتي لفطه في الفقرة الاتية :

[١٠٤] هي ورم حار يعرض في الغشاء المستبطن للاضلاع .

[١٠٥] في " النهاية " : " إي تموت وفي بطنها ولد ، وقيل التي تموت بكرا ، والجمع بالضم بمعنى المجموع ، كذخر بمعنى المــذخور ، وكــسر الكسائي الجيم، والمعنى أنها ماتت مع شئ مجموع فيها غير منفصل عنها من حمل أو بكارة " قلت : والمراد هنا الحمل قطعا بدليل الحديث المتقدم في " العاشرة " بلفظ " يقتلها ولدها جمعاء " .

[١٠٦] أخرجه مالك (٢٣٢/١–٢٣٣) وإبو داود (٢٦/٢) والنسائي (٢٦١/١) وابن ماجه (٢/ ١٨٥– ١٨٦) وابن حبان في صــحيحه (١٦١٦– موارد)والحاكم (١/ ٣٥٢)وأحمد (٤٤٦/٥) وقال الحاكم : " صحيح الاسناد "ا ووافقه الذهبي!

ولست أشك في صحة متنه ، لان له شواهد كثيرة ، تقدم أكثرها وروي الطبراني من حديث ربيع الانصاري مرفوعا به نحوه دون ذكر الهدم

واتە : شەهیدەکان حەوتن جگە لە کوژراوان لە پێناوی خوادا ، ئەو کەسەی کە بە نەخۆشی کۆلێرا بمرێت ( المطعون ) شەهیدە ، خنکاویش لە ئاودا شەهیدە ، ئەو کەسەش کە دومەڵ لە ژێر پەراسووکانیدا دەردەچێت و بمرێت شەهیدە ، و ئەو کەسەش کە بە نەخۆشی سك ئێشە دەمرێت شەهیدە ، و سووتاویش شەهیدە ، و ئەو کەسەش شتێك دەڕوخێت بەسەریدا شەهیدە ، و ئافرەتیش منداڵەکەی لە سکیدا بمرێت شەهیدە .

سیانزەیەم : مردن بە نەخۆشی سیل ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : " القتل في سبيل الله شهادة ، والنفساء شهادة ، والحرق [١٠٧] شهادة والغرق شهادة ، والسل شهادة ، والبطن شهادة " [١٠٨] .

واتە : کوژران لە پێناوی خوادا شەهیدیە ، و ئافرەت بە منداڵەکەیەوە بمرێت شەهیدیە ، وسووتان شەهیدیە ، و مردن بە نەخۆشی سیل شەهیدیە ، و مردن بە نەخۆشی سکە ئێشە شەهیدیە .

چواردەیەم : مردن لە پێناوی بەرگری لەماڵێك کە دەیانەوێت داگیری بکەن ، ئەوەش چەند فەرمەدەیەکی لەسەرە :

١ ـ " من قتل دون ماله ، ( وفي رواية : من أريد ماله بغير حق فقاتل ، فقتل ) فهو شهيد " [١٠٩] .

واتە : هەر کەسێك بکوژرێت لەسەر ماڵەکەی ( لە ڕیوایەتێکدا : هەر کەسێك بیانەوێت ماڵەکەی داگیر بکەن و بجەنگێت لە گەڵیاندا هەتاوەکو دەکوژرێت ) ئەوە شەهیدە .

---

.قال المنذري وتبعه الهيثمي (٥/ ٣٠٠) : " ورواته محتج بهم في الصحيح " .

وروى أحمد ( ٤/ ١٥٧ ) من حديث عقبة بن عامر مرفوعا بلفظ : " الميت من ذات الجنب شهيد " .

وسنده حسن في الشواهد ،وقا جاءت هذه الجملد في بعض طرق حديث أبي هريرة المتقدم في " الخامسة " ٧ أخرجه أحمد ( ٢/٤٤١-٤٤٢) وفيه محمد بن اسحاق وهو مدلس وقد عنعنه .

[١٠٧] بفتحتين ، وكذا ( الغرق ) ب ، كما في " حاشية المسند " ( ق ٣٠١ / ١ ) مكتبة شيخ الاسلام في المدينة .

[١٠٨] قال في "مجمع الزوائد " (٢/٣١٧ -٣٠١) : " رواه الطبراني في الاوسط ، وفيه مندل بن علي ، وفيه كلام كثير وقد وثق ". فقد زاد فيه أحمد في رواية له : "والسل " .

ورجاله موثقون ، وحسنه المنذري كما سبق ، وله شاهد آخر في " المجمع " .

[١٠٩] أخرجه البخاري ( ٥ / ٩٣ ) ومسلم ( ١ / ٨٧ ) وإبو داود (٢/٢٨٥) والنسائي (٢/١٧٣) والترمذي (٢/ ٣١٥ ) وصححه وابن ماجه ( ٢ / ١٢٣ ) وأحمد ( ٦٨١٦ ، ٦٨٢٣ ، ٦٨٢٩ ) كلهم بالرواية الثانية إلا البخاري ومسلم فبالاولى ، وهي رواية للنسائي والترمذي وأحمد ( ٦٨٢٢ ) عن عبد الله بن عمرو .

وفي الباب عن سعيد بن زيد ، ويأتي في الخامسة عشرة :

٢ ـ لە ( أبو هريرة ) وە دەگێڕنەوە کە فەرمووی : " جاء رجل إلى رسول الله ﷺ ، فقال : يارسول الله أرأيت إن جاء رجل يريد أخذ مالي ؟ قال : فلا تعطه مالك ، قال : أرأيت إن قاتلني ؟ قاتله ، قال : أرأيـت إن قتلني ، قال : فأنت شهيد ، قال : أرأيت إن قتلته ؟ قال : هو في النار " [١١٠] .

واتە : پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چی دەبینیت ئەگەر پیاوێك بێت و بیەوێت ماڵەکەم ببات ؟ فەرمووی : ماڵەکەتی مەدەرێ ، وتی : ئەی ئایا چی دەبینیت ئەگەر لە گەڵمدا جەنگا لە سەری ؟ فەرمووی : لە گەڵیدا بجەنگە ، وتی : ئەی ئایا چی دەبینیت ئەگەر کوشتمی ؟ فەرمووی : ئەوە تۆ شەهیدیت ، وتی : ئەی چی دەبینیت ئەگەر من ئەوم کوشت ؟ فەرمووی : ئەو لە ئاگردایە .

٣ ـ لە ( مخارق ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " جاء رجل إلى النبي ﷺ فقال : الرجل يأتي فيريد مالي ؟ قال : ذكره بالله ، قـال فإن لم يذكر ؟ قال : فاستعن عليه السلطان ، قال : فإن نأى السلطان عني ( و عجل علي ) ؟ قال : قاتل دون مالك حتى تكون من شهداء الاخرة ، إو تمنع مالك " [١١١] .

واتە : پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی : کەسێك دێت و دەیەوێت ماڵەکەم داگیر بکات ؟ فەرمووی : خوای بخەرەوە یاد ، وتی : ئەگەر بیری نەکەوتەوە ؟ فەرمووی : داوای یارمەتی بکە لە کاربەدەستان ، وتی : ئەی ئەگەر کاربەدەستان دوور بوون لێمەوە و ( ئەویش تەنگی پێهەڵچنیم ) ؟ فەرمووی : بجەنگە لە پێناوی ماڵەکەتدا هەتاکو دەبیتە یەکێك لە شەهیدەکانی قیامەت ، یان ناهێڵێت ماڵەکەت داگیر بکات .

پانزەیەم و شانزەیەم : مردن لە پێناوی بەرگری کردن لە ئایین و نەفس ، و دوو فەرموودەش لەو بارەیەوە هاتووە :

١ ـ " من قتل دون ماله فهو شهيد ، ومن قتل دون أهله فهو شهيد ، ومن قتل دون دينه فهو شهيد ، ومن قتل دون دمه فهو شهيد " [١١٢] ، واتە : هەر کەسێك لە پێناوی ماڵەکەیدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، وە هەر کەسێك لە پێناوی کەس و کاریدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، وە هەر کەسێك لە پێناوی ئاینەکەیدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، وە هەر کەسێك لە پێناوی خوێنیدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە .

٢ . " من قتل دون مظلمته فهو شهيد " [١١٣] .

---

[١١٠] اخرجه مسلم (٨٧/١)،واخرجه النسائي (١٧٣/٢)واحمد (٣٣٩/١-٣٦٠)من طريق أخرى عنه.

[١١١] اخرجه النسائي واحمد (٢٩٥/٥،٢٩٤،٢٩٤)والزيادة له وسنده صحيح على شرط مسلم .

[١١٢] اخرجه أبو داود ( ٢ / ٢٧٥ ) والنسائي والترمذي ( ٢ / ٣١٦ ) وصححه ، واحمد ( ١٦٥٢ ) ١٦٥٣ ) عن سعيد بن زيد ، وسنده صحيح .

[١١٣] اخرجه النسائي ( ٢ / ١٧٣ - ١٧٤ ) من حديث سويد بن مقرن ، واحمد ( ٢٧٨٠ ) من حديث ابن عباس ، وإسناده صحيح إن ســلم مــن

واتە : هەر كەسێك لە پێناوی ستەم لێكردنیدا بكوژرێت ئەوە شەهیدە .

حەڤدەیەم : مردن لە كاتی پاسەوانی گرتن ( مرابط ) لە پێناوی خوا ، وە دوو فەرموودەش لەو بارەیەوە باس دەكەین :

١ ـ " رباط يوم وليلة خير من صيام شهر وقيامه ، وإن مات جرى عليه عمله الذي كان يعمله ، وأجري عليه رزقه ، وأمن الفتان " (١١٤) .

واتە : پاسەوانی كردن لە پێناوی خوای پەروەردگار شەو و ڕۆژێك چاكترە لە ڕۆژوو و شەوونوێژی مانگێك ، وە ئەگەر لە كاتی پاسەوانیشدا مرد ئەو كردەوە چاكانەی كە دەیكرد پێش مردنی بەردەوام دەبێت بۆی ، وە ڕزق و ڕۆزیەكەشی بۆ دەنێردرێت لە گۆڕەكەیدا و لە فیتنەی گۆڕیش پارێزراو دەبێت .

٢ ـ " كل ميت يختم على عمله إلا الذي مات مرابطا في سبيل الله ، فإنه ينمى له عمله إلى يوم القيامة ، ويأمن فتنة القبر " (١١٥) .

واتە : هەموو مردوویەك كە دەمرێت كۆتایی بە كارەكانی دێت جگە لەو كەسە نەبێت كە پاسەوانی كردووە لە پێناوی خوای پەروەردگاردا و لەو كاتەدا مردووە ، كارەچاكەكانی بۆ گەش و نما دەكرێت و زیاد دەكرێت تا ڕۆژی قیامەت ، و لە فیتنەی گۆڕ پارێزراو دەبێت .

هەشدەیەم : مردن لەسەر كردەوەیەكی چاك ، ئەوەش لەبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی : " من قال : لا إله إلا الله ، ابتغاء وجه الله ختم له بها دخل الجنة ، ومن صام يوما ابتغاء وجه الله ختم له بها دخل الجنة ، ومن تصدق بصدقة ابتغاء وجه الله ختم له بها دخل الجنة " (١١٦) .

واتە : هەر كەسێك بڵێت : لا إله إلا الله ، تەنها لە بەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت ، و لە سەر ئەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەر كەسێكیش ڕۆژێك لەبەر ڕەزامەندی خوا بەڕۆژوو

---

الانقطاع بين سعد بن ابراهيم ابن عبد الرحمن بن عوف وابن عباس ، لكن أحد الطريقين يقوى الاخرى ، وفي الاولى من لم يوثقه غير ابن حبان .

قلت : وهذا بإطلاقه يشمل الانواع الاربعة المذكورة في الحديث الاول وغيرها .

(١١٤) رواه مسلم (٥١/٦) والنسائي ( ٢/ ٦٢ ) والترمذي (١٨/٣) والحاكم (٨٠/٢) وأحمد (٤٤٠/٥، ٤٤١ ) من حديث سلمان الفارسي ، ورواه الطبراني وزاد :" وبعث يوم القيامة شهيدا ".لكن في سنده من لم يعرفهم الهيثمي في " مجمعه " (٢٩٠/٥)،وسكت عليه المنذري في" ترغيبه " (١٥٠/٢) .

(١١٥) أخرجه إبو داود ( ١ / ٣٩١ ) والترمذي ( ٣ / ٢ ) وصححه ، والحاكم ( ٢ / ١٤٤ ) وأحمد ( ٦ / ٢٠ ) من حديث فضالة بن عبيد ، وقال الحاكم : " صحيح على شرط الشيخين " !

(١١٦) " أخرجه أحمد (٣٩١/٥) عن حذيفة قال : " سندت : النبي ﷺ وإلى صدري فقال " فذكره . وإسناده صحيح ، قال المنذري (٦١/٢) " لا بأس به " .

بێت و لە سەری بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەر كەسێكیش ( صدقة ) بەخشینێك بكات لەبەر ڕەزامەندی خوا و لە سەری بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە .

## ( ٩ ) بەچاكە باسكردنی خەڵك لە سەر مردووەكە ( ثناء الناس على الميت ) :

٢٦ . بەچاكە باسكردنی خەڵك لە سەر مردووەكە لە لایەن هەموو خەڵكانێكی چاكی ڕاستگۆوە ، كەمترینیان دوو كەسیش ، لەو هاوسێیانەی . كە چاكەكار و زانان . و بەباشی مردووەكە دەناسن ، دەبێتە هۆی ئەوەی كە خوای پەروەردگار بیخاتە بەهەشتەوە و بەهەشتی بۆ مسۆگەر بكات ، لەو بارەشەوە چەندەها فەرمووده هەن :

١ . لە ( أنس ) ی كوڕی ( مالك ) ەوە ﷺ فەرموویەتی : " مر على النبي ﷺ بجنازة ، فأثنى عليهـا خيرا ، ( وتتابعت الألسن بالخير ) ، ( فقالوا : كان ـــ ما علمنا ـــ يحب الله ورسوله ) ، فقـال نـبي الله ﷺ : وجبت وجبت وجبت ، ومر بجنازة فأثني عليها شرا ، ( وتتابعت الالسن لها بالشر ) ، ( فقالوا : بئس المرء كان في دين الله ) ، فقال نبي الله ﷺ : وجبت وجبت وجبت ، فقال عمر : فدى لك أبي وامي ، مر بجنـازة فـأثني عليها شرا ، فقلت : وجبت وجبت وجبت ؟ فقال رسول الله ﷺ : " من أثنيتم عليه خيرا وجبت له الجنـة ، ومن أثنيتم عليه شرا وجبت له النار ، ( الملائكة شهداء الله في السماء ، و ) أنتم شهداء الله في الأرض ، أنـتم شهداء الله في الأرض ، أنتم شهداء الله في الأرض ، ( وفي رواية : والمؤمنون شـهداء الله في الأرض ) ، ( إن لله ملائكة تنطق على ألسنة بني آدم بما في المرء من الخير والشر ) " (١١٧) .

واتە : تەرمێك بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی ، و بە چاكی باس كرا ، خەڵكەكەش یەك لە دوای یەك بە چاكە باسیان كرد ، وتیان : ئەوەندەی ئێمە لێی بە ئاگا بووین خوای پەروەردگار و پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش دەویست ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : بۆی مسۆگەر بوو ،

---

(١١٧) أخرجه البخاري (٣/ ١٧٧– ١٧٨، ٥/ ١٩٢– ١٩٣) ومسلم (٣/ ٥٣) والنسائي (١/٢٧٣) والترمذي (٢/١٥٨) وصححه ، وابن ماجه (١/ ٤٥٤) والحاكم ( ١ / ٣٧٧ ) والطيالسي ( ٢٠٦٢ ) وأحمد ( ٣ / ١٧٩ ، ١٨٦ ، ١٩٧ ، ٢١١ ، ٢٤٥ ، ٢٨١ ) من طرق عن أنس ، والسياق لمسلم ، والرواية الاخرى لابن ماجه ، ورواية لاحمد والبخاري ، والزيادات كلها إلا التي قبـل الاخـيرة لا حمـد ، وللبخاري وللبخاري الاولى منها، وللحاكم الاخيرة وصححها ، و وافقه الذهبي ، وهو كما قالا .

وأخرجه أبو داود ( ٢ / ٧٢ ) والنسائي وابن ماجه والطيالسي ( ٢٣٨٨ ) وأحمد ( ٢/٤٧٠،٤٦٦،٢٦١، ٤٩٨ ، ٥٢٨ ) من طـريقين عن أبي هريرة ، والزيادة الاخيرة للنسائي عنه ، وإسنادها صحيح ، والطريق الاخرى إسنادها حسن .

بۆی مسۆگەر بوو ، بۆی مسۆگەر بوو ، دواتر تەرمێكی تر تێپەر بوو ، بەڵام ئەمجارەیان خەڵكەكە بە خراپە باسیان لێوە كرد ، خەڵكەكەش یەك لەدوای یەك بە خراپە باسیان دەكرد ، و دەیـان وت : خراپترین كەس بۆ لـە دینداریتیـدا پێغەمبـەری خـواش ﷺ فـەرمووی : بـۆی مـسۆگەر بـوو ، بـۆی مسۆگەر بوو ، بـۆی مـسۆگەر بـوو ، پێشەوا ( عمـــر ) لـە كاتـەدا پرسـیاری كـرد و فـەرمووی : ئـەی پێغەمبەری خوا دایك و باوكم بە قوربانت بێت ، تـەرمێك تێپـەڕ بـوو و خەڵكەكە بە خراپـە باسـیان كرد فـەرمووت : بـۆی مـسۆگەر بـوو ، بـۆی مـسۆگەر بـوو ، بـۆی مـسۆگەر بـوو ، پێغەمبـەری خـوا لـە وەڵامیـدا فـەرمووی : ئـەو كەسـەی ئێـوە بەچـاكە باسـی بكـەن بەهەشـتی بـۆ مـسۆگەرە ، وە ئـەو كەسـەش بـە خراپـە باسـی بكـەن دۆزەخـی بـۆ مـسۆگەرە ، فریـشتەكان لـە ئاسمانـدا گـەواهی دەری خوای پەروەردگارن لە ئاسماندا ، و ئێوەش گەواهی دەری خوای پەروەردگارن لە زەویدا ، ئێوەش گـــــەواهی دەری خـــــوای پـــــەروەردگارن لــــە زەویـــدا ، ئێـــوەش گـــــەواهی دەری خـــــوای پەروەردگارن لە زەویدا ، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : بڕواداران گەواهی دەری خوای پەروەردگارن لـە زەویـدا ، خـوای پـەروەردگار مەلائیكـەتێلێكی هەیـە ئـەوەی چاكە یـان خراپـەی مرۆڤـەكان بێـت دەیخەنە سەر زاری بڕواداران .

٢ . لە ( أبو الأسود ) ی ( الدیلي ) دەگێڕنەوە كە فەرموویـەتی : " أتیت المدینة ، وقد بها مرض ، وهم یموتون موتا ذریعا ، فجلست إلى عمر ابن الخطاب ﷺ ، فمرت جنازة ، فأثنی خیرا ، فقال عمـــر : وجبـــت ، فقلت : ما وجبت یا أمیر المؤمنین ؟ قال : قلت كما قال النبي ﷺ : أیما مسلم شهد له أربعة بخیر أدخله الله الجنة ، قلنا : وثلاثة قال : وثلاثة قال : قلنا واثنان ؟ قال : واثنان ، ثم لم نسأله في الواحد " (١١٨) .

واتـە : هاتمـە شـاری مەدینـەوە ، لەوكاتـەدا نەخۆشـیەكی تێدا بڵاوبووبـوەوە ، زۆر بـە خراپـی دەمردن ، منیش لـە لای ( عمـــر ) ی كـوڕی ( خطـــاب ) دانیـشتم ، لـەو كاتـەدا تـەرمێك تێپـەڕی ، و بەچاكە باسـكرا ، ئـەویش فـەرمووی : بـۆی مـسۆگەر بـوو ، منـیش وتم : چـی مـسۆگەر بـوو ئـەی پێشەوای موسڵمانان ؟ فەرمووی : ئەوەم وت كە پێغەمبەری خوا فەرمووی ، هەر موسڵمانێك چوار موسڵمان گەواهی بۆ بدەن بە چاكە خـوای پـەروەردگار دەیخاتـە بەهەشـتەوە ، وتمـان : ئـەی سێ كـەس ؟ فـەرمووی : سێ كەسیش ، وتمـان : ئـەی دوو كـەس ؟ فـەرمووی : دوو كەسیش ، پاشـان پرسیاری یەك كەسمان لێ نەكرد .

٣ . " ما من مسلم یموت فیشهد له أربعة من أهل أبیات جیرانه الاذنیین أنهم لا یعلمون منه إلا خـــیرا ، إلا

(١١٨) أخرجه البخاري والنسائي والترمذي وصححه البیهقي ( ٤ / ٧٥ ) والطیالسي (رقم ٢٣) وأحمد (رقم ١٢٩، ٢٠٤ ) .

قال الله تعالى وتبارك : قد قبلت قولكم ، أو قال : بشهادتكم ، وغفرت له مالا تعلمون " (١١٩) .

واتـه : هـیچ موسـڵمانێك نیـه كـه بمرێـت ، و چـوار موسـڵمان گـەواهی چـاكەی بـۆ بـدەن لـه دەرهاوسـێكان ، و بڵـێن جگـه لـه چـاكە و خێـر نـەبێت هیـچی ترمـان لێ نـەبینیوە ، ئـیللا خـوای پەروەردگار دەفەرمووێت : ووتەكەتانم پێ قەبووڵە ، یان دەفەرمووێت : گەواهیەكەتانم وەرگرت ، و لەو گوناهانەی خۆش بوون كە ئێوەی لێ بێ ئاگان .

**مردن لە کاتی خۆر گیران یان مانگ گیران :**

٢٧ . وە ئەگەر مردنی كەسێك هاوكات بوو لە گەڵ خۆر گیران و مانگ گیران ، ئەوە ئەو هاوكات بوونـه هـیچ ناگەیـەنێت ، وە بیروبـاوەڕی ئـەوەی كـه ئـەو هاوكـات بوونـه نیـشانەی گـەورەیی مردووەكەیە بیروباوەڕێكە لە بیروباوەڕەكانی سەردەمی نەفامی ، كە پێغەمبەری خوا ﷺ پووچەڵی كردووەتـەوە لـە ڕۆژی كۆچی دوایی ئیبراهیمی كوڕی . علیـه الـسلام . لەو ڕۆژەدا خۆر گیرا و پێغەمبـەری خـوا ﷺ وتـاری خوێنـدەوە و حەمـد و ستایـشی خـوای پـەروەردگاری كـرد ، و بـەو شێوەی كە ( شایەنیەتی ) لایەقێتی ستایشی كرد ، و پاشان فەرمووی : " أما بعد ، أيها النـاس ! إن أهل الجاهلية كانوا يقولون إن الشمس والقمر لا يخسفان إلا لموت عظيم ، وإنما آيتـان مـن آيـات الله ، لا ينخسفان لموت أحد ولا لحياته ، ولكن يخوف الله به عباده ، فإذا رأيتم شيئا من ذلك فافزعوا إلى ذكره ، ودعائه واستغفاره ، وإلى الصدقة والعتاقة والصلاة في المساجد حتى تنكشف " (١٢٠) .

واتـه : وە پاشـان ، ئـەی خەڵكینـه ! خـەڵكی لـە سـەردەمی نەفامیـدا دەیـانووت : خـۆر و مـانگ

---

(١١٩) اخرجه أحمد (٣/ ٢٤٢) والحاكم (١/ ٣٧٨) وقال : "صحيح على شرط مسلم " ووافقه الذهبي !

وله شاهد من حديث أبي هريرة : أخرجه أحمد ( ٢ / ٤٠٨ ) وفيه شيخ من أهل العلم لم يسم ، والراوي عنه عبد الحميد ابن جعفر الزيادي ولم أجد له ترجمة .... وله شاهد آخر مرسل عن بشر بن كعب ، أخرجه أبو مسلم الكجي كما في " الفتح " ( ٣ / ١٧٩ ) .

إعلم أن مجموع هذه الاحاديث الثلاثة يدل هذه الشهادة لا تختص بالصحابة ، بل هي أيضا لمن بعدهم من المؤمنين الذين هم على طريقهم في الايمان والعلم والصدق وبهذا جزم الحافظ ابن حجر في " الفتح " فليراجع كلامه من شاء المزيد من البيان . ثم إن تقييـد الـشهادة بـأربع في الحديث الثالث ، الظاهر أنه كان قبل حديث عمر قبله ، ففيه الاكتفاء بشهادة اثنين ، وهو العمدة . هذا ، وأما قول بعض الناس عقب صـلاة الجنازة : " ما تشهدون فيه . اشهدوا له بالخير " ! فيجيبونه بقولهم صالح . أو من أهل الخير ، ونحو ذلك ، فليس هو المراد بالحديث قطعا ، بل هو بدعة قبيحة ، لانه لم يكن من عمل السلف ، ولان الذين يشهدون بذلك لا يعرفون الميت في الغالب ، بل قد يشهدون بخلاف ما يعرفـون استجابة لرغبة طالب الشهادة بالخير ، ظنا منهم أن ذلك ينفع الميت ، وجهلا منهم بأن الشهادة النافعة إنما هي التي توافـق الواقـع في نفـس المشهود له ، كما يدل على ذلك قوله في الحديث الاول " إن لله ملائكة تنطق على ألسنة بني آدم بما في المرء من الخير والشر " .

(١٢٠) هذا السياق ملتقط من جملة أحاديث سقتها في كتاب لي في " صلاة الكسوف " تكلمت فيه على طرقها وألفاظها ، ثم جمعت في آخره خلاصتها في سياق واحد وهذا القدر منه . وجله في " الصحيحين " " والسنن " .

ناگیرێن ئیللا بۆ مردنی كەسێكی گەورە نەبێت ، بەڵام : خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەكانی خوای پەورەردگار ، ناگیرێن بۆ مردنی هیچ كەسێك یان بۆ ژیانی كەسێك ، بەڵام خوای پەروەردگار بەندەكانی پێ دەترسێنێت ، جا ئەگەر ئێوە هەر شتێكتان لەو شتانە بەرچاو كەوت ، پەنابەرنە بەر زیكری خوای پەروەردگار كردن ، و لێ پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون لێ كردنی ، و بەخشین ، و بەندە رزگار كردن ، و نوێژكردن لە مزگەوتەكاندا ، تاكو بەردەبێت .

## (١٠) شۆردنی مردوو ( غسل الميت ) :

٢٨ . ئەگەر كەسێك بمرێت پێویستە لە سەر كۆمەڵێك لە خەڵك دەست پێشخەری بكەن لە شۆردنی ، سەبارەت بە بەڵگەی دەستپێشخەریتیان لە ( بەشی سێیەم ) لە ( باسی ١٧ دا ، لە بڕگەی هـ ) دا ، و لە پەڕەی ( ) دا باسكراوە .

وە سەبارەت بە واجبێتی شۆردنەكە لەبەر فەرمانی پێغەمبەرە ﷺ بەو كارە لە چەندەها فەرموودە ... لەوانەش :

١ . " اغسلوه بماء وسدر ... " [١٢١] ، واتە : بیشۆن بە ئاو و سیدر .

٢ . فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە زەینەبی كچی . ڕەزای خوای لێ بێت . كە فەرموویەتی : " اغسلنها ثلاثا ، أو خمسا ، أو سبعا ، أو أكثر من ذلك ... " [١٢٢] ، سێ جار بیشۆن ، پێنج جار ، یان حەوت جار ، یان زیاتر لەوەش .

٢٩ . وە لە شۆردنەكەیدا ئەم خاڵانە ڕەچاو دەكرێت :

**یەكەم :** سێ جار شۆردنی یان زیاتر ، بەو پێیەی كە ئەو كەسانە بە باشی دەزانن كە هەڵدەستن بە شۆردنی .

**دووەم :** شۆردنەكان با تاك بن .

**سێیەم :** هەندێك لەو شۆردنانەی سدری لە گەڵدا بەكار بهێنرێت ، یان هاوشێوە و جێگەی سیدر دەگرێتەوە لە مادە پاك كەرەوەكان وەكو ( الأشنان ) و سابوون .

**چوارەم :** ئاوی شۆردنی كۆتایی هەندێك بۆنی تێكەڵ بكرێت ، باشتریش وایە كافور بێت .

---

[١٢١] وقد مضى لفظه بتمامه وتخريجه في المسألة المشار إليها ( فقره د ) ،(ص ١٢– ١٣) .

[١٢٢] الحديث ويأتي بتمامه وتخريجه في المسألة التالية .

**پێنجەم :** کردنەوەی پەلکی مردووەکە ئەگەر ئافرەت بوو ، و شۆردنی بە باشی .

**شەشەم :** داهێنان و شانەکردنی پرچی .

**حەوتەم :** کردنی پرچی بە سێ پەلکە ئەگەر ئافرەت بوو ، و خستنی بە پشتی .

**هەشتەم :** دەست پێکردن بە لا ڕاستەکانی مردووەکە و شوێن و ئەندامەکانی دەستنوێژی .

**نۆیەم :** پیاوان هەستن بە شۆردنی نێرینە ، و ئافرەتانیش بە شۆردنی مێینە ، جگە لەوانەی کە جیاکراونەتەوە ، و پێشتر ڕوونمان کردەوە .

بەڵگەی هەموو ئەم خاڵانەش فەرموودەکەی ( أم عطية ) یە . ڕەزای خوای لێ بێت . کە تێیدا فەرموویەتی : " دخل علينا النبي ﷺ ، ونحن نغسل ابنته ( زينب ) ، فقال : اغسلنها ثلاثا ، أو خمسا ( أو سبعا ) ، أو أكثر من ذلك ، إن رأيتن ذلك ، ( قالت : قلت : وترا ؟ قال : نعم ) ، واجعلن في الاخرة كافورا أو شيئا من كافور ، فإذا فرغتن فآذنني ، فلما فرغنا آذناه ، فألقى إلينا حقوه [١٢٣] فقال : أشعرنها [١٢٤] إياه ( تعني إزاره ) ، ( قالت : ومشطناها ثلاثة ( قرون ) ، ( وفي رواية : نقضنه ثم غسلنه ) ( فضفرنا شعرها ثلاثة أثلاث : قرنيها وناصيتها ) وألقيناها ) ، ( قالت : وقال لنا : ابدأن بميامنها ومواضع الوضوء منها ) " [١٢٥] .

واتە : سەرقاڵ و خەریکی شۆردنی کچەکەی پێغەمبەری خوا بووین ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان و پێی فەرمووین : سێ جار بیشۆن ، پێنج جار ، یان حەوت جار ، یان زیاتر لەوەش ، ئەگەر بە پێویستان زانی ، دەڵێت : وتم : شۆردنەکانمان تاک بێت ، فەرمووی : بەڵێ با تاک بن ، وە دوا ئاویشیان کافوری تێبکەن ، یان هەندێك کافوری تێبکەن ، وە ئەگەر لێبوونەوە ئاگادارم کەن ، دەڵێت : کە لێی بووینەوە ، ئاگادارمان کرد ، ئەویش : کراسەکەی پێداین ، فەرمووی : بپێچن پێوە . بە شێوەیەك ڕاستەوخۆ بەر لەشی بکەوێت . ، دەڵێت : پرچیمان داهێنا و کردمان بە سێ پەلکەوە ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : پرچیمان کردەوە پاشان شۆردمان ، و کردمان بە سێ پەلکەوە ، دوو شاخەی و پێشەسەری ، و خستمانە پشتی ، دەڵێت : وە پێی فەرمووین : بە لا

---

[١٢٣] أي إزاره . قال ابن الاثير : " والاصل في الحقو معقد الازار ، وجمعه أحق وأحقاء ، ثم سمي بها الازار للمجاورة " .

[١٢٤] أي اجعلنه شعارها ، والشعار الثوب الذي يلي الجسد لانه يلي شعره .

[١٢٥] أخرجه البخاري (٣/٩٩-١٠٤) ومسلم (٣/ ٤٧- ٤٨) وأبو داود (٢/٦٠- ٦١ ) والنسائي (١/٢٦٦- ٢٦٧) والترمذي (٢/١٣٠-١٣١) وابن ماجه (١/٤٤٥) وابن الجارود (٢٥٨،٢٥٩) واحمد (٥/٨٤- ٨٥ ، ٤٠٧٦- ٤٠٨) وقال الترمذي : " حديث حسن صحيح ، والعمل على هذا عند أهل العلم " .

والرواية الثانية للبخاري والنسائي ، والزيادة الاول لمسلم ، والثالية له والبخاري وأبي داود والنسائي ، والثالثة للنسائي ، وللشيخين معناها ، والرابعة للبخاري وأبي داود والخامسة له ولمسلم والنسائي وابن ماجه وأحمد ، والسادسة للشيخين وأحمد ، والسابعة للبخاري وأبي داود والنسائي وأحمد ، والاخيرة لجميعهم .

ڕاستەكانی دەست بكەن بە شۆردنی ، لەگەڵ شوێنی دەستنوێژەكانی .

**دەیەم :** بە پارچە پەڕۆیەك ، یان هەر شتێكی هاوشێوەی بشۆردرێت ، لە ژێر داپۆشەرێك كە لەشی داپۆشیبێت ، دوای داماڵینی و داكەندنی هەموو جلەكانی ، چونكە كرداری موسڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە بووە ، هەروەكو لە فەرمووودەی عائیشەوە - ڕەزای خوای لێ بێت - وەردەگیرێت ، كە فەرموویەتی : " لما أرادوا غسل النبي ﷺ قالوا : والله ما ندري ، أنجرد رسول الله ﷺ من ثيابه كما نجرد موتانا ، أم نغلسه وعليه ثيابه ؟ فلما اختلفوا ألقى الله عليهم النوم ، حتى مامنهم رجل إلا وذقنه في صدره ، ثم كلمهم مكلم من ناحية البيت ، لا يدرون من هو : أن اغسلوا النبي ﷺ وعليه ثيابه ، فقاموا إلى رسول الله ﷺ فغسلوه ، وعليه قميصه يصبون الماء فوق القميص ويد لكونه بالقميص ، دون أيديهم ، وكانت عائشة تقول : لو استقبلت من أمري ما استدبرت ما غسله إلا نساؤه " [١٢٦] .

واتە : كاتێك كە ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ بشۆن ، وتیان : ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە جلەكانی ڕووت بكەینەوە هەروەك مردووەكانمان ڕووت دەكەینەوە ، یان بیشۆین و جلەكانی هەر لەبەردا بێت ؟ لەو كاتەی كە جیاواز بوون لەو كارەدا خوای پەروەردگار خەوتنی دا بە سەریاندا ، تاكو وای لێهات كەسیان نەبوو ئیلا چەناكەی لە سەر سنگی بوو ، پاشان ووتەبێژێك دوا لە گەڵیاندا لە لای كەعبەوە ، نەیان دەزانی كێیە ، دەیووت : پێغەمبەری خوا ﷺ بشۆن و با جلەكانی پێوە بێت ، ئەوانیش هەستان و پێغەمبەری خوایان بە جۆرە شوشت ، كراسەكەی لە بەر بوو و لە سەر كراسەكەیەوە دەستیان بە لاشەیدا دەهێنا ، و كراسەكەی لە نێوان لەشی و دەستی بشۆرانیاندا بوو ، وە ( عائشة ) - ڕەزای خوای لێ بێت . دەیفەرموو : ئەوەی كە ئێستا تیایدام پێشتر ببایە ، ئەوا جگە لە خێزانەكانی كەسی تر نەیدەشۆرد .

**یانزەیەم :** بەڵام ئەو كەسەی كە لە حوكمی گشتی ژمارە ( ٤ ) جیابكرێتەوە كەسێكە لە ئیحرامدا بێت ، چونكە كەسی ئیحرام پۆش نابێت بۆنخۆش بكرێت ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە پێشتر ئاماژەمان پێدا لەم نزیكانەدا ، و تێیدا هاتووە : " لا تحنطوه ، وفي رواية : ولا تطيبوه ... فإنه يبعث يوم القيامة ملبيا " [١٢٧] ، واتە : وە كراسەكانیشی بۆن خۆش مەكەن ( وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : بۆنی خۆشی بەسەردا مەكەن ) ... چونكە لە كاتی زیندووبونەوەیدا بە تەلبیەیەوە

---

[١٢٦] أخرجه أبو داود (٢/٦٠) وابن الجارود في" المنتقى " (٢٥٧) والحاكم ( ٣ / ٥٩ - ٦٠ ) وصححه على على شرط مسلم ! والبيهقي ( ٣/٣٨٧) والطيالسي ( رقم١٥٣٠) وأحمد (٦/٢٦٧) بسند صحيح ، وروى ابن ماجه ( ١/٤٤٦) منه قول عائشة في آخره : " لو استقبلت.. "ورواه ابن حبان في صحيحه ( ٢١٥٦ ) .

[١٢٧] أخرجه الشيخان وغيرهما كما تقدم ص ١٢ - ١٣ .

زیندوو دەكرێتەوە ( واتە : لبيك اللهم لبيك ... هتد دەكات ) .

**دوانزەیەم :** وە ئەو كەسانەش كە لە حوكمی گشتی ژمارە ( ٩ ) جیادەكرێتەوە هەردوو ژن و مێردن ، چونكە بۆ هەریەكەیان ڕەوایە هەستێت بە شۆردنی ئەوی تریان ، چونكە هیچ بەڵگەیەك نیە ڕێگر بێت لێی ، و لە بنەواشدا حەڵاڵە ، لە كاتێكدا ئەم ووتەیە پاڵپشت دەبێت بە دوو فەرموودە :

١ ـ لە ( عائشة ) ەوە . ڕەزای خوای لێ بێت . دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " لو كنت استقبلت من أمري ما استدبرت ما غسل النبي ﷺ غير نسائه " (١٢٨) ، واتە : ئەوەی كە ئێستا تیایدام پێشتر ببایە ، ئەوا جگە لە خێزانەكانی كەسی تر نەیدەشۆرد .

٢ ـ هەروەها لێیەوە . ڕەزای خوای لێ بێت . دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " رجع إلي رسول الله ﷺ من جنازة بالبقيع ، وأنا أجد صداعا في رأسي ، وأقول : وارأساه ، فقال : بل انا وارأساه ما ضرك لومت قبلي فغسلتك ، وكفنتك ، ثم صليت عليك ودفنتك " (١٢٩) ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناشتنی تەرمێك گەڕایەوە بۆ لام لە بەقیعەوە ، منیش سەرە ئێشەیەكی توونم هەبوو ، و دەمووت : ئای سەرم ، ئەویش فەرمووی : بەڵكو من ئای سەرم ، ئەی ( عائشة ) چ زەرەرێكت دەكرد ئەگەر پێش من بمردایەیت ، و منیش هەستایەم بە شۆردن و كفن كردنت ، و پاشان نوێژیشم لە سەر بكردایەیت ، و بمناشتایەیت .

**سیانزەیەم :** شارەزاترین كەس بە سوننەتەكانی شۆردنی مردوو هەستێت بە شۆردنی ، بەتایبەت ئەگەر لە كەس وكار و خزم وخێشی مردووەكە بێت ، چونكە ئەوانەی كە هەستان بە شۆردنی پێغەمبەر ئەوانە بوون كە باسمان كردن ، ئەوەتا ( علي ) ﷺ دەفەرمووێت : " غسلت رسول الله ﷺ ، فجعلت أنظر ما يكون من الميت فلم أر شيئا ، وكان طيبا حيا وميتا ﷺ " (١٣٠) .

---

(١٢٨) أخرجه ابن ماجه ، ورواه أبو داود وغيره في آخر حديثها المتقدم قريبا في غسل النبي ﷺ . قال البيهقي : " فتلهفت على ذلك ، ولا يتلهف : إلا على ما يجوز " . قلت : والجواز هو قول الامام أحمد كما رواه أبو داود في " مسائله " ص ١٤٩ .

(١٢٩) أخرجه أحمد ( ٦/ ٢٢٨) والدارمي ( ١ / ٣٧ – ٣٨ ) وابن ماجه ( ١/ ٤٤٨ ) وابن هشام في " السيرة " ( ٢ / ٣٦٦ ) – بولاق ) والدار قطني ( ١٩٢ ) والبيهقي ( ٣ / ٣٩٦ ) ، وفيه عندهم جميعا محمد بن اسحاق وقد عنعنه ، إلا في رواية ابن هشام فقد صرح بالتحديث فثبت الحديث ، والحمد لله . على أن الحافظ ابن حجر قد ذكر في " التلخيص " ( ٥ / ١٢٥ ) الطبعة المنيرية ) انه تابعه عليه صالح بن كيسان عند أحمد والنسائي . قلت : هو عند أحمد ( ٦ / ١٤ ٤ ) لكن ليس فيه التصريح بالغسل ، فتراجع رواية النسائي فلعله فيها ، فإني لم أر الحديث في سننه الصغرى ، فلعله في الكبرى له .

(١٣٠) أخرجه ابن ماجه ( ١ / ٤٤٧ ) والحاكم ( ١ / ٣٦٢ ) والبيهقي ( ٣ / ٣٨٨ ) وإسناده صحيح كما قال في " الزوائد " ( ق ٩٢ / ١ ) وقال الحاكم : " صحيح على شرط الشيخين " .

وتعقبه الذهبي بقوله : " قلت : فيه انقطاع " .

واتە : پێغەمبەری خوام ﷺ شوشت ، لەو كاتەدا دەمڕوانی بۆ ئەوەی ببینم ئەوەی كە لە مردوودا دەردەكەوێت ، لەویش دەردەكەوێت ، كەچی هیچم نەبینی ، پێغەمبەری خوا ﷺ جوان و بۆنخۆش بوو لە كاتی ژیان و مردنیدا .

٣٠ ـ وە ئەو كەسەش كە هەڵدەستێ بە شۆردنی پاداشتێكی گەورەی هەیە ، بەڵام ئەو پاداشتە گەورەیە بە دوو مەرجە :

یەكەم : ستری بكات و باسی هیچێك لەو عەیبانە نەكات كە بەرچاوی دەكەوێت ، ئەوەش لە بەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی : " من غسل مسلما ، فكتم عليه ، غفر له الله أربعين مرة ، ومن حفر له ، فأجنّه ، أجري عليه ، كأجر مسكن أسكنه إياه إلى يوم القيامة ، ومن كفنه ، كساه الله يوم القيامة من سندس ، واستبرق الجنة " [١٣١] ، واتە : ئەو كەسەی كە موسڵمانێك بشوات ، عەیب و عاری بپۆشێت ، ئەوا خوای پەروەردگار چل جار لە تاوانەكانی خۆش دەبێت ، و ئەو كەسەش گۆڕەكەی بۆ بكەنێت ، و دایبپۆشێت ، ئەوا بەبەردەوامی خێری ئەوەی بۆ دەنووسرێت كە ئەگەر خانوویەكی بۆ دروست كردبێت و تێیدا جێنشینی كردبێت تاكو ڕۆژی دوایی ، و ئەو كەسەش كە كفنی بكات ، ئەوا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا لە ئاورێشمی تەنك و ئەستوری بەهەشتی لە بەر دەكات .

دووەم : هەستانی بەو كارە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت ، هیچ پاداشت و سوپاس گوزاریەكی نەوێت لە شتە دونیاوییەكان ، ئەوەش لە بەر ئەو بنەوایەی كە لە شەریعەتدا جێگیر بووە كە خوای پەروەردگار هیچ پەرستش و كردەوەیەك وەرناگرێت ئەگەر تەنها بۆ خوای پەروەردگار ئەنجام نەدرابێت ، وە بەڵگەش لە سەر ئەوە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتەوە زۆر زۆرن ، كە تەنها شەشیان لێرەدا دەهێنمەوە :

---

قلت :وهذا مما لاوجه له، فإن الحديث من رواية معمر عن الزهري عن سعيد بن المسيب عن علي .وهذا سند متصل معروف رواية بعضهم عن بعض،أما معمر عن الزهري،والزهري عن سعيد فأشهر من أن يذكر، وأما رواية سعيد عن علي فموصولة أيضا كما أشار إلى ذلك الحافظ في " التهذيب " . بل ذهب إلى أنه سمع من عمر أيضا ( قلت : وفيما ذكره في عمر نظر ، لا يتسع المجال الان لبيانه ، وأما سماعه من علي فهو صحيح ، وذلك أن وفاة علي رضي الله عنه كانت سنة أربعين ، وكان لسعيد يومئذ من العمر ثمان وعشرون سنة فأين الانقطاع ! ) وفي مرسل الشعبي أنه غسل النبي ﷺ مع علي رضي الله عنه الفضل ، يعني ابن العباس وأسامة بن زيد . أخرجه أبو داود (٢/٦٩ ) وسنده صحيح مرسل .

وله شاهد من حديث ابن عباس ... أخرجه أحمد ( ٣ ٣٥٨ ) بسند ضعيف .

[١٣١] أخرجه الحاكم ( ١ / ٣٥٤ ، ٣٦٢ ) والبيهقي ( ٣ / ٣٩٥ ) من حديث أبي رافع رضي الله عنه ، وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " . ووافقه الذهبي ، وهو كما قالا . وقد رواه الطبراني في " الكبير " بلفظ : " أربعين كبيرة " .

وقال المنذري (٤/١٧١) وتبعه الهيثمي (٣/٢١) : " رواته محتج بهم في الصحيح " . وقال الحافظ ابن حجر في " الدراية " (١/٤٠ ) : " إسناده قوي " .

١ ـ ووتەی خوای پەروەردگار كە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴾ ( الكهف : ١١٠ ) ، واتە : كردەوەكە بۆ غەیری خوای پەروەردگار ئەنجام نەدرێت .

٢ ـ هەروەها وتەی خوای پەروەردگار : ﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ ( البينة : ٥ ) .

٣ ـ فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " إنما الأعمال بالنيات ، وإنما لكل امرىء ما نوى ، فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله ، فهجرته إلى الله ورسوله ، ومن كانت هجرته إلى دنيا يصيبها ، أو امرأة ينكحها فهجرته إلى ما هاجر إليه " [١٣٢] ، واتە : كردەوە تەنها نیەتە ، و هەموو كەسێكیش تەنها ئەوەی بۆ هەیە كە نیەتیەتی ، ئەو كەسەش نیەتی لە كۆچكردنیدا ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت ، و جێبەجێ كردنی فەرمانی پێغەمبەر بێت ﷺ ، ئەوا نیەتی لە كۆچكردنیدا ڕەزامەندی خوای پەروەردگارە ، وجێبەجێ كردنی فەرمانی پێغەمبەرەكەیەتی ﷺ ، وە ئەو كەسەش نیەتی لە كۆچكردنیدا بەدەست هێنانی دونیا ، یان ئافرەتێك بێت خوازبێنی بكات ، ئەوا كۆچكردنەكەی لە بەر ئەوەیە .

٤ ـ هەروەها فەرموودەی : " بشر هذه الأمة بالسناء والتمكين في البلاد ، والنصر والرفعة في الدين ، ومن عمل منهم بعمل الآخرة للدنيا ، فليس له في الآخرة نصيب " [١٣٣] ، واتە : موژدە بدە بەم ئوممەتە بە بڵندی و جێگیربوون لە زەوی و وڵاتدا ، سەركەوتن و بەرزیش لە ئاییندا ، وە ئەوەشیان ئەنجامدانی كردەوەی دواڕۆژ لە بەر دونیا ئەنجام بدات ، ئەوا هیچ بەش و نسیبێكی نیە لە دواڕۆژدا .

٥ ـ لە ( أبو أمامة ) وە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " جاء رجل إلى النبي ﷺ فقال : أرأيت رجلا غزا يلتمس الأجر والذكر ما له ؟ فقال : لا شيء له ، فأعادها ثلاث مرات ، يقول له رسول الله ﷺ لا شئ له ، ثم قال : إن الله لا يقبل من العمل إلا ما كان له خالصا وابتغي وجهه " [١٣٤] ، واتە : پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر كەسێك تێبكۆشێ و غەزا بكات ، و نیەتی ئەجر وپاداشت ، و ناوداری و شۆرەت بێت ، چی بۆ هەیە ؟ ئەویش فەرمووی : هیچی بۆ نیە ، پیاوەكەش سێ جار هەمان پرسیاری دووبارە كردەوە ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو :

---

[١٣٢] أخرجه البخاري في أول " صحيحه " ومسلم وغيرهما عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه .

[١٣٣] أخرجه أحمد وابنه في زوائد " المسند " ( ٥ / ١٣٤ ) وابن حبان في " صحيحه " ( موارد ) والحاكم ( ٤ / ٣١١ ) وقال :" صحيح الاسناد " . ووافقه الذهبي ، وأقره المنذري ( ١ / ٣١ ).قلت : وإسناد عبد الله صحيح على شرط البخاري .

[١٣٤] أخرجه النسائي ( ٢ / ٥٩ ) وإسناده جيد كما قال المنذري ( ١ / ٢٤ ) .

هیچی بۆ نیە ، و پاشان فەرمووی : خوای پەروەردگار لە کردەوەکاندا هیچ کردەوەیەك وەرناگرێت ، ئیللا ئەوە نەبێت کە بە پاکی و تەنها بۆ ڕەزامەندی ئەو ئەنجام درابێت .

٦ ـ وە ئەو فەرموودە قودسیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا دەگێڕێتەوە : " قال الله عز وجل : أنا أغنى الشركاء عن الشرك ، فمن عمل لي عملا أشرك فيه غيري فأنا منه بريء ، وهو للذي أشرك " [١٣٥] ، واتە : خوای پەروەردگار فەرموویەتی : من لە هەموو هاوبەشدار و شەریکەکان دەوڵەمەندترم بە بوونی هاوبەش و شەریك ، جا هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات و تێیدا جگە لە خۆم بکات بە هاوبەش و شەریکم ، ئەوا من بێبەریم لێی ، ئەو کردەوەش بۆ هاوبەش و شەریکەکەیە .

٣١ ـ وە سوننەتە بۆ ئەو کەسەی کە هەڵدەستێ بە شۆردنەکەی خۆی بشوات ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : " من غسل ميتا فليغتسل ، ومن حمله فليتوضأ " [١٣٦] ، واتە : ئەو کەسەی مردوویەك دەشوات با غوسڵ بکات ، وئەوەش کە هەڵی دەگرێت با دەستنوێژ بشوات .

٣٢ ـ وە ناشبێت شەهید واتە کوژراوی جەنگ بشۆردرێت ، با هەمووش لە سەر ئەوە کۆڕا بن کە لەشیشی گران بوو بێت ، لەوبارەشەوە چەند فەرموودەیەك هەن [١٣٧] .

---

[١٣٥] رواه ابن ماجه في " الزهد " من حديث أبي هريرة واسناده صحيح شرط مسلم ، وقد أخرجه في " صحيحه " ( ٨ / ٢٢٣ ) حوه .

[١٣٦] أخرجه أبو داود ( ٢ / ٦٢ – ٦٣ ) والترمذي ( ٢ / ١٣٢ ) وحسنه ، وابن حبان في صحيحه ( ٧٥١ – موارد ) والطيالسي ( ٢٣١٤ ) وأحمد ( ٢٨٠ ، ٤٣٣ ، ٤٥٤ ، ٤٧٢ ) .

من طرق عن أبي هريرة،وبعض طرقه حسن،وبعضه صحيح على شرط مسلم (وقد بينت ذلك بيانا شافيا في كتابي " الثمر المستطاب " – " كتاب الغسل ") ، وقد ساق له ابن القيم في " تهذيب السنن "إحدى عشر طريقا عنه، ثم قال : " وهذه الطرق تدل على أن الحديث محفوظ " .

قلت : وقد صححه ابن القطان ، وكذا ابن حزم في " المحلى " (٢/١،٢٥٠/٢٣ – ٢٥) والحافظ في " التلخيص " (٢/ ١٣٤– منيرية ) .

وقال : وظاهر الامر يفيد الوجوب ، وإنما لم نقل به لحديثين :

الاول : قوله ﷺ : " ليس عليكم في غسل ميتكم غسل إذا غسلتموه ، فإن ميتكم ليس بنجس ،فحسبكم أن تغسلوا أيديكم ". أخرجه الحاكم (٣٨٦/١) والبيهقي (٣٩٨/٣) من حديث ابن عباس وقال الحاكم : " صحيح على شرط البخاري " ووافقه الذهبي ! وإنما هو حسن الاسناد كما قال الحافظ في " التلخيص " لان فيه عمرو بن عمرو ، وفيه كلام ، وقد قال الذهبي نفسه في " الميزان " بعد أن ساق أقوال الائمة فيه : " حديثه صالح حسن ".

الثاني : قول ابن عمر رضي الله عنه " كنا نغسل الميت ،فمنا من يغتسل ومنا من لا يغتسل " أخرجه الدار قطني ( ١٩١ ) والخطيب في تاريخه ( ٥ / ٤٢٤ ) باسناد صحيح كما قال الحافظ ، وأشار إلى ذلك الامام أحمد ، فقد روى الخطيب عنه أنه حض ابنه عبد الله على كتابة هذا الحديث .

[١٣٧] **الأول :** أخرجه البخاري ( ٣ / ١٦٥ ) بالرواية الاولى وأبو داود ( ٢ / ٦٠ ) والنسائي ( ١ / ٢٧٧ – ٢٧٨ ) والترمذي ( ٢ / ١٤٧ ) وصححه ، وابن ماجه ( ١ / ٤٦١ – ٤٦٢ ) والبيهقي ( ٤ / ١٠ ) والرواية الاخرى له وكذا ابن سعد في " الطبقات " ( ج ٣ ق ١ ص ٧ ) والزيادة له ، وإسناده صحيح على شرط مسلم . ولها ، أي الرواية الاخرى طريق أخرى في المسند ( ٣ / ٢٩٦ ) من رواية ابن جابر عن جابر مرفوعا بلفظ : " لا تغسلوهم ، فإن كل جرح يفوح مسكا يوم القيامة،ولم يصل عليهم " . وإسناده صحيح إن كان ابن جابر هو عبد

**یەکەم : لە ( جابر ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** " ادفنوهم في دمائهم ــ يعني يوم أحد ــ ولم يغسلهم . ( وفي رواية ) فقال : أنا شهيد على هؤلاء ، لفوهم في دمائهم ، فإنه ليس جريح يجرح ( في الله ) إلا جاء وجرحه يوم القيامة يدمي ، لونه لون الدم ، وريحه ريح المسك " ، **واتە : هەر بەخوێن و جلە خوێناوییەکانیانەوە بیاننێژن . مەبەستی ڕۆژی ئوحودە . و نەیشۆردن ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : من شایەتی لە سەر ئەمانە دەدەم ، بیانپێچنەوە بەخوێن و جلە خوێناوییەکانیانەوە ، چونکە هیچ کەسێك نیە کە بریندار بێت لە پێناوی خوای پەروەردگاردا ، ئیللا لە لە ڕۆژی دواییدا دێت و برینەکەی خوێنی لێ دەتکێت ، ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و بۆنی بۆنی میسك .**

**دووەم : لە ( أبو برزة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی :** " أن النبي ﷺ كان في مغزى له ، فأفاء الله عليه ، فقال لا صحابه : هل تفقدون من أحد ؟ قالوا : نعم ، فلانا ، وفلانا ، وفلانا ، وثم قال : هل تفقدون من أحد ؟ قالوا : لا : قال : لكني أفقد جليبيبا ، فاطلبوه ، فطلب في القتلى ، فوجدوه إلى جنب سبعة قتلهم ، ثم

---

الرحمن ، وأما إذا كان ومحمدا أخا عبد الرحمن فإنه ضعيف ، ولم يترجح عندي أيهما المراد هنا . وأما الشو كاني فقال في " نيل الاوطار " ( ٤ / ٢٥ ) : " إنها رواية لا مطعن فيها " .ولها طريق ثالث،اخرجه احمد ( ٥/٤٣١-٤٣٢ ) من رواية عبد الله بن ثعلبة ابن صعير ، وله رؤية،ولم يثبت له سماع فهو مرسل صحابي فهو حجة ، وإسناده إليه صحيح ، وقد وصله البيهقي ( ٤ / ١١ ) من حديثه عن جابر .

**الثاني :** أخرجه مسلم (٧/ ١٥٢ ) والسياق له ، والطيالسي (٩٢٤) والزيادتان له ، وأحمد (٤٢١/٤ ، ٤٢٥) والبيهقي (٢١/٤) .

**الثالث :** أخرجه أبو داود ( ٢ / ٥٩ ) والزيادة له وللحاكم ويأتي لفظه – والترمذي ( ٢ / ١٣٨ – ١٣٩ ) وحسنه وابن سعد ( ٣ ق ١ ص ٨ ) والحاكم ( ١ / ٣٦٥ – ٣٦٦ ) والبيهقي ( ٤ / ١٠ – ١١ ) وأحمد ( ٣ / ١٢٨ ) وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " . ووافقه الذهبي . وقال النووي في " المجموع " ( ٥ / ٢٦٥ ) بعد ماعزاه لابي داود وحدة : " إسناده حسن أو صحيح " .

قلت : هو عندي حسن ، على أنه على شرط مسلم .

**الرابع :** أخرجه ابن حبان في " صحيحه " والحاكم ( ٣ / ٢٠٤ ) والبيهقي ( ٤ / ١٥ ) بإسناد جيد كما قال النووي في موضع من " المجموع " ( ٥ / ٢٦٠ ) ثم نسي ذلك فقال بعد ( ٥ / ٢٦٣ ) : " وذكرنا أنه حديث ضعيف " ! فجل من لا ينسى ، وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " ! وأقره الذهبي !

**الخامس :** رواه الطبراني في " الكبير " ( ٣ / ١٤٨٩ ) وإسناده حسن ، كما قال الهيثمي في " المجمع " ( ٣ / ٢٣ ) ، ورواه الحاكم ( ٣ / ١٩٥ ) دون ذكر حنظلة ، وقال : " صحيح الاسناد " وتعقبه الذهبي فأصاب ، لكن له شاهد مرسل قوي أخرجه ابن سعد ( ج ٣ ق ١ ص ٩ ) عن الحسن البصري مرفوعا مثله .

قلت : وسنده صحيح رجاله كلهم ثقات ، وفيه رد على الحافظ ، فإنه وصف حديث ابن عباس بالغرابة ، لانه ذكر فيه حمزة مع أنه قال في سنده : إنه لا بأس به ، كما حكاه الشو كاني عنه ( ٤ / ٢٦ ) ، فالظاهر أن الحافظ رحمه الله لم يقف على هذا الشاهد ( واعلم أن وجه دلالة الحديث على عدم مشروعية غسل الشهيد الجنب ، هو ما ذكره الشافعية وغيرهم أنه لو كان واجبا لما سقط بغسل الملائكة ، ولأمر النبي ﷺ بغسله ، لان المقصود منه تعبد الادمي به ، انظر" المجموع " (٢٦٣/٥) و "ونيل الأوطار" ( ٢٦/٤) .) .

قتلوه ! فأتى النبي ﷺ ، فوقف عليه فقال : قتل سبعة ثم قتلوه ! هـذا مني ، و أنا منه ، ( قالها مرتين أو ثلاثا ) ، ( ثم قال بذراعيه هكذا فبسطهما ) ، قال : فوضعه على ساعديه ، ليس له سرير إلا ساعدي النبي ﷺ قـال : فحفر له ووضع في قبره ، لم يذكر غسلا " .

**سێیەم :** لە ( أنس ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموويەتى : " أن شهداء أحد لم يغسلوا ، ودفنوا بدمائهم ، ولم يصل عليهم ( غير حمزة ) ﷺ " ، واتە : شەهيدەكانى ئوحود نەشۆردران ، و هەر بەخوێن و جلە خوێناوييەكانيانەوە نێژران ، و نوێژيان لە سەر نەكرا جگە لە حەمزە نەبێت ﷺ .

**چوارەم :** لە ( عبدالله ) ى كوڕى ( الزبير ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە لە باسى بەسەرهاتى ڕووداوى جەنگى ( أحد ) دا و لە شەهيد بوونى ( حنظلـة ) ەى كوڕى ( أبـو عـامر ) دا فەرموويەتى : وە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : " إن صاحبكم تغسله الملائكة ، فاسألوا صاحبته " ، فقالت : خرج وهـو جنب لما سمع الهائعة (*) فقال رسول الله ﷺ : " لذلك غسلته الملائكة " ، واتە : ئەم هاوەڵەتان فريشتە دەيشوات ، پرسيار لە خێزانەكەى بكەن بزانن بۆچى ، ئەويش وتى : كە دەنگى بانگەشەى تێكۆشان و دەرچوونى بيست بەلەشگرانى دەرچوو لە ماڵ ، پێغەمبەرى خـواش ﷺ فەرمووى : ئا لەبەر ئەوە بوو كە فريشتە شورديەوە .

**پێنجەم :** لە ( ابن عباس ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموويەتى : " أصيب حمـزة بـن عبـدالمطلب وحنظلة الراهب ، وهما جنب ، فقال رسول الله ﷺ : رأيت الملائكة تغسلهما " ، واتە : ( حمزة ) ەى كـوڕى ( عبدالمطلب ) ﷺ ، و ( حنظلة ) ى ( راهب ) ﷺ شەهيد كران ، و لەشيشيان گران بوو ، پێغەمبەرى خـوا ﷺ فەرمووى : فريشتەكانم بينى دەيانشۆردن .

## (١١) كفن كردنى مردووەكە
## ( تكفين الميت ) :

٣٣ ـ وە دواى لێبوونەوە لە شۆردنى مردووەكە ، واجبە و پێويستە مردووەكە كفن بكرێت ، ئەوەش لە بەر فەرمانى پێغەمبەر ﷺ بەو كارە ، لە فەرموودەى ئەو ئيحرام پۆشەى كە وشترەكەى خستوويبوويە خوارەوە ، و پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : " ... وكفنوه ... " [١٣٨] ، واتە : پاشان كفنى بكەن ، فەرموودەكەش بە تەواوى لە بەشى ( ٣ ) يەم و برگەى ( د ) دا لە پەڕەى ( .... ) باسكراوە .

---

( * ) هي الصوت الذي تفزع عنه ، وتخاف منه . " نهاية "

[١٣٨] (متفق عليه) .

٣٤ ـ کفنەکە و نرخەکەی لە دارایی و سامانی مردۆکە دەبێت ، با هیچی تری جگە لەوە بە جێ نەهێشتبێت ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی ( خباب ) ی کوڕی ( الأرت ) ﷺ کە تێیدا فەرموویەتی : " هاجرنا مع رسول الله ﷺ في سبيل الله ، نبتغي وجه الله ، فوجب أجرنا على الله ، فمنا من مضى لم يأكل من أجره شيئا ، منهم مصعب بن عمير ، قتل يوم أحد ، فلم يوجد له شيء ، ( وفي رواية : ولم يترك ) إلا نمرة ، فكنا إذا وضعناها على رأسه خرجت رجلاه ، وإذا وضعناها على رجليه خرج رأسه ، فقال رسول الله ﷺ : ضعوها مما يلي رأسه ( وفي رواية : غطوا بها رأسه ) ، واجعلوا على رجليه الإذخر [١٣٩] ، ومنا من أينعت له ثمرته ، فهو يهدبها " [١٤٠] ، أي : يجتنيها .

واتە : لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆچمان کرد لە لە پێناوی خوادا ، نیاز و مەبەستمان تەنها خوای پەروەردگار بوو ، پاداشتمان کەوتە لای خوای پەروەردگار کە پەیمانی پێ داوین لە ئایینەکەیدا ، کەسانی وامان هەبوو ڕۆشت و بەرهەمی دەستی خۆی لە دونیادا نەخوارد ، لە وانەش ( مصعب ) ی کوڕی ( عمیر ) ، کە لە جەنگی ئوحد دا کوژرا ، هیچ شتێکی نەبوو ، ( لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : هیچ شتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت ) جگە لە عابایەك نەبێت ، کە دەمانـدا بە سەریدا قاچەکانی دەردەکەوتن ، وە ئەگەر بماندایە بە قاچەکانیدا سەری دەردەکەوت ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بیدەن بە لای سەریدا ، ( لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : سەری پێ داپۆشن ) ، و بە ( الإذخر ) کە ڕووەکێکی بۆن خۆشە ، قاچەکانی داپۆشن ، کەسی واشمان هەبوو بەری کۆچەکەی پێ گەیشتووە ، خەریکی لێکردنەوەیەتی .

٣٥ ـ وە دەبێت کفنەکە درێژ و تێر و تەسەل بێت ، بە شێوەیەك هەموو لەشی مردووەکە بگرێتەوە ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی ( جابر ) ی کوڕی ( عبدالله ) ﷺ کە دەگێڕێتەوە " أن النبي ﷺ خطب يوما فذكر رجلا من أصحابه قبض فكفن غير طائل ، وقبر ليلا ، فزجر النبي ﷺ أن يقبر الرجل بالليل حتى يصلى عليه ، إلا أن يضطر إنسان إلى ذلك وقال النبي ﷺ : " إذا كفن أحدكم أخاه فليحسن كفنه ( إن استطاع ) " [١٤١] .

---

[١٣٩] بكسر الهمزة والخاء – حشيش معروف طيب الرائحة .

[١٤٠] أخرجه البخاري(٣/١١٠)ومسلم (٣/٤٥)والسياق له . وابن الجارود في " المنتقى " (٢٦٠) والترمذي (٣٥٧) وصححه والنسائي(١/٢٦٩) والبيهقي (٣/٤٠١) وأحمد (٦/٦٩٥) والرواية الثانية له وللترمذي . وروى منه أبو داود (٢/٦٢،١٤) قوله في مصعب : " قتل يوم أحد ... الخ والرواية الثالثة له وفي الباب عن عبد الرحمن بن عوف أخرجه البخاري وغيره .

[١٤١] أخرجه مسلم ( ٣ / ٥٠ ) وابن الجارود ( ٢٦٨ ) وأبو داود ( ٢ / ٦٢ ) وأحمد ( ٣ / ٢٩٥ ، ٣٢٩ ) وروى الجملة الاخيرة منه الترمذي ( ٢ / ١٣٣ ) وابن ماجه من حديث أبي قتادة ، وقال الترمذي : " حديث حسن ".

واتە : ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری خوێندەوە و باسی پیاوێكی كرد لە هاوەڵانی وەفاتی كردبوو ، و كفنێكی تێروتەسەل و پوختی بۆ نەكرابوو ، و بە شەویش نێژرابوو ، پێغەمبەری خواش ﷺ سەرزەنشتی ئەوەی كرد كە مردوو بە شەو بنێژرێت تاكو نوێژی لە سەر نەكرێت ، ئیللا بۆ كەسێك نەبێت كە لە حاڵەتێكی زۆر زەروور بێت ، و پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەگەر یەكێك لە ئێوە كفنی براكەی كرد با بەباشی كفنی بكات ، ئەگەر لە توانایدا بوو .

زانایان فەرموویانە : (( والمراد بإحسان الكفن نظافته وكثافته وستره ، وتوسطه ، وليس المراد به السرف فيه والمغالاة ، ونفاسته )) .

واتە : مەبەست لە بە باشی كفن كردن بریتیە لەوەی كە كفنێكی پاك و پتەو و پۆشەر و مام ناوەندەكەی بێت ، نەك ئەوەی مەبەستیان زیادەڕەوی كردن و ئیسراف بێت ، یان كفنەكە گران بەها بێت ، یان شتێكی بە نرخ بێت .

بەڵام ئەوەی كە پێشەوا ( النووي ) بە مەرجی داناوە كە دەبێت كفنەكە لە جۆری ئەو پۆشاك و جلانە بێت كە مردووەكە لە ژیانی دونیایدا لە بەری كردوون و پۆشیونی ، نە لەوە گران بەها تر بێت ، و نەش بێ نرخ تر ، ئەم وتەیەی پێشەوا ( النـــووي ) لە لای مندا جێ تاوتوێ كردنە ، سەرەڕای ئەوەی كە وتەیەكە بەڵگەی شەرعی لـــە سەر نەهاتووە ، لە گەڵ ئەوەشدا ڕەنگە پۆشاك و جلەكانی لە دونیادا گران بەها بێت ، یان بێ نرخ بێت ، جا چۆن كفنەكەی دەبێت لە هەمان جۆری ئەوانە بێت ؟!

٣٦ ـ ئەگەر كفنەكە ئەوەندە نەبوو كە مردووەكە بە تەواوی داپۆشێت ، نەشتوانرا كفنێكی درێژ و تێر و تەسەل بێت ، بە شێوەیەك هەموو لەشی مردووەكە بگرێتەوە ، ئەوا سەری مردووەكەی پێ دادەپۆشرێت ، و ئەوەندەی لەشیشی كە درێژترە ، و بـــە دانەپۆشراوێتی ماوەتەوە ، ئەوا هەندێك ( الإذخـــــر ) ، یـــــان هـــــەر گژوگیایەكی تـــری دەخرێتە سەر ، لـــەوبارەشەوە دوو فەرموودەمان پێگەیشتووە :

یەكەم : ئەو فەرموودەیەی كە ( خبــاب ) ی كوڕی ( الأرت ) لە بەسەرهاتی ( مــصعب ) دا دەیگێڕێتەوە ، و تێدا هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەو تەنها عابایەكی ( نمرة ) ی كە لە دوای خۆی بە جێ هێشت بوو فەرمووی : " ضعوها مما يلي رأسه ( وفي رواية : غطــوا بهــا رأســه )

---

قلت : بل هو حديث صحيح،فإن إسناده عن جــابر صحيح ( وله طريق أخرى عن جابر ، أخرجه هو والذي قبله الحاكم في " المستدرك " ( ١ - ٣٦٩ ) ، وسنده صحيح ) ، فكيف إذا انضم إليه حديث أبي قتادة ؟ وعزاه صديق حسن خان في " الروضة الندية " ( ١/ ١٦٤) لمسلم فوهم . والزيادة لاحمد في رواية له .

واجعلوا على رجليه الإذخر " [١٤٢] . وە پێشتر لە بابەتی ( ٣٤ ) دا ، و لە پەڕەی ( ) دا فەرموودەكە بە تەواوی باس كراوە .

دووەم : لە ( حارثة ) ی كوڕی ( مضرب ) ەوە دەفەرموێت : " دخلت على خباب وقد اكتــوى ( في بطنه ) سبعا ، فقال : لولا أني سمعت رسول الله ﷺ يقول : " لا يتمنين أحدكم الموت " لتمنيته . ولقد رأيــتني مع رسول الله ﷺ لا أملك درهما ، وإن في جانب بيتي الآن لأربعين ألف درهم ! ثم أتى بكفنه ، فلما رآه بكى وقال : ولكن حمزة لم يوجد له كفن إلا بردة ملحاء ، إذا جعلت على رأسه قلصت عن قدميه ، وإذا جعلت على قدميه قلصت عن رأسه ، وجعل على قدميه الإذخر " [١٤٣] .

واتە : ڕۆشتمە لای ( خباب ) لە كاتێكدا لە سەرەمەرگدا بوو ( اكتوى ( في بطنه ) سبعا ) ، و پێی فەرمووم : ئەگەر نەمبیستایە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی : كەس لە ئێوە با ئاواتی مردن نەخوازێت ، ئەوا ئاواتی مردنم دەخواست ، ئەو كاتەی كە لە گەڵ پێغەمبەردا بووم ﷺ درهەمێكم نەبوو ، بەڵام ئێستا لە لایەكی ماڵەكەمدا چوارسەد هەزار درهەمم هەیە ! پاشان هەستاو كفنەكەی بۆ هێنام ، كە بینی دەستی كرد بە گریان ، و فەرمووی : بـەڵام حەمزە كـە مرد كفنی نـەبوو جگە لــە عـابەیەكی ( ملحاء ) نەبێت ، ئەگەر بدرایەتە سەر سەریا قاچی دەردەكەوت ، و ئەگەر بدرایەت بە سەر قاچی سەری دەردەكەوت ، بــەڵام بــەهەر حــاڵ دایان بە سەر سەریدا و ڕووەكی ( الإذخر ) یان دا بەسەر قاچیدا .

٣٧ ـ وە ئەگەر كفنەكان كەم بوون ، و مردوش زۆر بوو ، ئەوا ڕەوا و جـائیزە كۆمـەڵێك لـە یـەك كفندا كفن بكرێن ، ئەوەشیان كە قورئانی زیاتر لە بەر بێت پێش دەخرێت لــە دانانیان لــە ڕووە و قیبلە ، ئـەوەش لــە بەر فەرموودەی ( أنس ) ی كـوڕی ( مالك ) ﷺ كە دەفـەرموێت : " لما كان يوم أحد ، مر رسول الله ﷺ بحمزة بن عبد المطلب ، وقد جدع ومثل به ، فقال : لو لا أن صفية ( في نفسها لــ ) تركته ( حتى تأكله العافية ) [١٤٤] ، حتى يحشره الله من بطون الطير والسباع ، فكفنه في نمرة ، ( وكانــت ) إذا خمرت رأسه بدت رجلاه وإذا خمرت رجلاه بدا رأسه ، فخمر رأسه ، ولم يصل على أحد من الـشهداء غـيره ، وقال : أنا شاهد عليكم اليوم ، ( قال : وكثرت القتلى ، وقلت الثياب ، قال : ) وكان يجمع الثلاثة والاثنين في

---

[١٤٢] متفق عليه .

[١٤٣] أخرجه أحمد (٦/٣٩٥) بهذا التمام ، وإسناده صحيح ، والترمذي دون قوله : ثم أتى بكفنه .. " وقال : " حديث حسن صحيح " . وروى الشيخان وغيرهما من طريق أخرى النهي عن تمني الموت . وله شاهد من حديث أنس ،نذكره إن شاء الله في المسألة التالية .

[١٤٤] هي السباع والطير التي تقع على الجيف كلها ، ويجمع على العوافي .

قبر واحد ، ويسأل أيهم أكثر قرآنا ، فيقدم في اللحد ، وكفن الرجلين والثلاثة في الثوب الواحد "[١٤٥] .

واتە : كە ڕۆژی ( أحـد ) بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە لای تەرمی ( حمزة ) ەی كوڕی ( عبدالمطلب ) بینی گوێ و لوتی بڕاوە ، و هەتك كراوە ، لەو كاتەدا فەرمووی : ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت شتێك لە دڵی ( صفية ) درووست بێت هەر بەو شێوەیە بەجێم دەهێلا بۆ ئەوەی دڕندە و باڵندەكان بیانخواردایە ، و خوای پەروەردگاریش لە سنگی ئەو باڵندە و دڕندانەدا كۆی بكردایەتەوە ، پاشان لە عابایەكی خۆیدا كفنی كرد دەیدا بە سەریدا قاچەكانی دەردەكەوتن ، و ئەگەر بدرایەت بە سەر قاچەكانیدا سەری دەردەكەوت ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر هیچ یەكێك لە شەهیداندا نەكرد جگە لەو نەبێت ، و فەرمووی : من ئەمڕۆ گەواهیتان لە سەر دەدەم ، لەو ڕۆژەدا كوژراوێكی زۆر هەبوون ، جل و بەرگ كەم بوو كە بكرێتە كفن بۆ هەموویان ، دەڵێت : بۆیە سێ دانە و دوو دانەی لە گۆڕێكدا كۆ دەكردە ، لە كاتی ناشتنیان پرسیاری لەوە دەكرد كامەیان قورئانی زیاتر لە بەرە ، و ئەوەیانی پێش دەخست ، دوو كەس و سێ كەسی لە یەك پارچەدا كفن دەكرد .

٣٨ ـ وە نابێت ئەو پۆشاك و جلانەی كە شەهیدی تێدا دەكوژرێت دابكەندرێت ، بەڵكو دەنرێت گۆڕ و ئەو پۆشاك و جلانەشی هەر پێوە دەبێت ، لە بەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ كە سەبارەت بە كوژراوەكانی ( أحد ) فەرمووی : " زملوهم في ثيــابهم "[١٤٦] ، واتە : دایان پۆشن بە پۆشاك و جلەكانیانەوە ، وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : " زملوهم بدمائهم "[١٤٧] ، واتە : دایان پۆشن بەو خوێنەی كە پێوەیانە .

هەر سەبارەت بەم باسە فەرموودەی ترمان پێكەیشتووە لە ( جابر ) ، و ( أبو برزة ) ، و ( أنــس ) ەوە ﷺ ، وە بڕوانە بابەتی ( ٣٢ ) فەرموودەی یەكەم ، و سێیەم پەڕەی ( ) .

---

[١٤٥] أخرجه أبو داود (٥٩/٢) والترمذي (١٣٨/٢-١٣٩) وحسنه ، وابن سعد (ج ٣ق ١ص ٨) والحاكم (٣٦٥/١-٣٦٦) والسياق له وعنه البيهقي (١٠/٤-١١) وأحمد (١٢٨/٣) والزيادات له ، وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " ، ووافقه الذهبي ، وإنما هــو حسن فقط كما سبق في الثالث من المسألة (٣٢) ، (ص٥٣) .

قال شيخ الاسلام ابن تيمية رحمه الله : " معنى الحديث أنه كان يقسم الثوب الواحد بين الجماعة ، فيكفن كل واحد ببعضه للضرورة ، وإن لم يستر إلا بعض بدنه ، يدل عليه تمام الحديث أنه كان يسأل عن أكثرهم قرآنا فيقدمه في اللحد ، فلو أنهم في ثوب واحد جملة لسـأل عــن أفضلهم قبل ذل كي لا يؤدي إلى نقض التكفين وإعادته . ذكره في " عون المعبود " ( ٣ / ١٦٥ ) ، وهذا التفسير هو الصواب ، وأما قول من فسره على ظاهره فخطأ مخالف لسياق القصة كما بينه ابن تيمية ، وأبعد منه عن الصواب من قال : معنى ثوب واحد قبر واحــد ! لان هــذا منصوص عليه في الحديث فلا معنى لاعادته .

[١٤٦] اخرجه أحمد ( ٥ / ٤٣١ ) بهذا اللفظ .

[١٤٧] وكذلك أخرجه النسائي ( ١ / ٢٨٢ ) ، وعزاه الشوكاني ( ٤ / ٣٤ ) لأبي داود فوهم .

٣٩ ـ سوننەتیشە ژمارەی كفنەكانی یەك كفن بێت یان زیاتر ، زیاد لە سەر پۆشاكەكەی خۆی ، هەروەكو ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ ( مصعب بن عمیر ) ، و ( حمزة بن عبد المطلب ) دا ئەنجامی دا ، و باسەكەشیان لە بابەتی ( ٣٧ ، ٣٦ ، ٣٤ ) ، دوو بەسەرهاتی تریش هەر لەم بارەیەوە هاتووە :

**یەكەمیان :** لە ( شداد ) ی كوڕی ( الهاد ) ەوە دەگێڕێتەوە ، كە " أن رجلا من الأعراب ، جاء إلى النبي ﷺ فآمن به واتبعه ، ثم قال : أهاجر معك ، فأوصى به النبي ﷺ بعض أصحابه ، فلما كانت غزوة ( خيبر ) غنم النبي ﷺ ( فيها ) شيئا ، فقسم ، وقسم له ، فأعطى أصحابه ما قسم له ، وكان يرعى ظهرهم ، فلما جاءهم دفعوه إليه ، فقال : ما هذا ؟ قالوا : قال : قسمته لك ، قال : ما على هذا تبعتك ، ولكن اتبعتك على أن أرمي إلى ههنا ـ وأشار إلى حلقه ـ بسهم فأموت ، فأدخل الجنة ، فقال : إن تصدق الله يصدقك ، فلبثوا قليلا ، ثم نهضوا في قتال العدو ، فأتي به النبي ﷺ يحمل ، قد أصابه سهم حيث أشار ، فقال النبي ﷺ أهو هو ؟ قالوا : نعم ، قال : صدق الله فصدقه ، ثم كفنه النبي ﷺ في جبة النبي ﷺ ، ثم قدمه فصلى عليه ، فكان فيما ظهر من صلاته : اللهم هذا عبدك ، خرج مهاجرا في سبيلك ، فقتل شهيدا ، أنا شهيد على ذلك " [١٤٨] .

واتە : پیاوێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕی پێهێنا ، پاشان وتی : كۆچت لە گەڵدا بكەم ؟ پێغەمبەری خواش ئامانەتی دایە چەند كەسێك لە هاوەڵانی ، كە ڕۆژی خەیبەر بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك دەستكەوتی جەنگی دەستكەووت ، كە دابەشی كرد ، بەشی ئەویشی جیاكردەوە ، بەشەكەی ئەوی لە لای هاوەڵانی بۆ دانا . كە ئەو پیاوە شوانكارەی بۆ دەكردن . وە كە گەڕایەوە بۆ لایان بەشەكەیان پێدا ، وتی ئەمە چیە ؟ وتیان : بەشی دای ( یان : بەشم بۆ كردی ) ، وتی : من بۆ ئەمە شوێنی تۆ نەكەوتم ، بەڵكو من بۆ ئەوە شوێنت كەوتم كە تیرێك بدات لێرەمە . ئیشارەتی كرد بۆ قوڕگی . و بمرم ، و بڕۆمە بەهەشتەوە ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ئەگەر ڕاست بكەی لە گەڵ خوای خۆتدا خوای پەروەردگار ئاواتەكەت دێنێتە دی ، ماوەیەك مانەوە و هەستان بۆ جەنگ كردن لە گەڵ دوژمندا ، دواتر تەرمەكەیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، تیرێك لەو شوێنەی دابوو كە ئیشارەتی بۆ كرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەمە ئەو بوو ؟ فەرموویان بەڵێ ، فەرمووی : ڕاستی كرد لە گەڵ خوای خۆی خوای پەروەردگاریش ئاواتەكەی هێنایە دی ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە جوببەیەكی خۆیدا كفنی

---

[١٤٨] أخرجه النسائي (٢٧٧/١) والطحاوي في " (٢٩١/١) والحاكم (٥٩٥/٣ -٥٩٦) والبيهقي ( ٤ / ١٥ - ١٦ ) .

قلت : وإسناده صحيح ، رجاله كلهم على شرط مسلم ما عدا شداد بن الهاد لم يخرج له شيئا ، ولا ضير ، فإنه صحابي معروف ، وأما قول الشوكاني في " نيل الاوطار " (٣٧/٣) تبعا للنووي في " المجموع " ( ٥ / ٥٦٥ ) : إنه تابعي ! فوهم واضح فلا يغتر به .

کرد ، و پێشی خست و نوێژی لە سەر کرد ، وە ئەوەی کە لە نوێژەکەیدا گوێمان لێ بوو ئەوەبوو فەرمووی : ئەی پەروەردگارم ئەمە بەندەی خۆتە ، کۆچی کرد ودەرچوو لە پێناوی تۆ ، و شەهید کرا ، و منیش گەواهی دەرم لە سەر ئەو کارەی .

**دووەمیان :** لە ( زبیر ) ی کوڕی ( العوام ) ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " فكره النبي ﷺ أن تراهم ، فقال : المرأة المرأة ! قال : فتوسمت أنها أمي صفية ، فخرجت أسعى إليها ، فأدركتها قبل أن تنتهي إلى القتلى ، قال : فلدمت [١٤٩] في صدري ، وكانت امرأة جلدة ، قالت : إليك لا أرض لك ، فقلت : إن رسول ﷺ عزم عليك ، فوقفت ، وأخرجت ثوبين معها ، فقالت : هذان ثوبان جئت بهما لأخي حمزة ، فقد بلغني مقتله ، فكفنه فيهما ، قال : فجئنا بالثوبين لنكفن فيهما حمزة ، فإذا إلى جنبه رجل من الأنصار قتيل ، قد فعل به كما فعل بحمزة ، فوجدنا غضاضة وحياء أن نكفن حمزة في ثوبين ، والانصاري لاكفن له ، فقلنا : لحمزة ، ثوب ، وللأنصاري ثوب ، فقدر ناهما فكان أحدهما أكبر من الآخر ، فأقر عنا بينهما ، فكفنا كل واحد منهما في الثوب الذي صار له " [١٥٠] .

٤٠ ـ ئیحرام پۆشیش هەر لەو دوو پۆشاکەی خۆیدا کە تیایاندا مردووە کفن دەکرێت ، لە بەر ئەو فەرموودەی کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو ئیحرام پۆشەی کە وشترەکەی خستووبوویە خوارەوە ، فەرمووی : " ... وكفنوه في ثوبيه ( اللذين أحرم فيهما ) ... " [١٥١] ، واتە : وە کفنی بکەن لەو دوو پارچەیەی کە ئیحرامی پێ پۆشیبوون .

٤١ ـ وە چەند شتێکیش سوننەتە لە کەفەندا کە ئەمانەن :

**یەکەم :** سپێتی کفنەکە ، لە بەر ئەو فەرموودەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی : " البسوا من ثيابكم البياض ، فإنها خير ثيابكم ، وكفنوا فيها " [١٥٢] ، واتە : پۆشاکی سپی لە بەر بکەن ، چونکە باشترینی پۆشاکەکانتانە ، و مردوەکانیشتانی تێدا کفن بکەن .

**دووەم :** ژمارەی کفنەکان سێ دانە بێت ، لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە ( عائشة ) ـ ڕەزای خوای

---

[١٤٩] أي : ضربت ودفعت .

[١٥٠] أخرجه أحمد (١٤١٨) والسياق له بسند حسن ، والبيهقي (٣/ ٤٠١) وسنده صحيح .

[١٥١] وتقدم بتمامه في الفصل ( ٣ ) فقرة( د) ، ص ١٢ – ١٣ ) وهذه الزيادة رواها النسائي وكذا الطبراني في " المعجم الكبير " ( ق ١٦٥ / ٢) مر طريقين عن عمرو بن دينار عن ابن جبير عن ابن عباس . وهذا سند صحيح .

[١٥٢] أخرجه أبو داود (١٧٦/٢) والترمذي (١٣٢/٢) وصححه ، وابن ماجه (٤٤٩/١) والبيهقي (٢٤٥/٣) وأحمد (٣٤٢٦) ، والضياء في " المختارة " (٢/٢٢٩/٦٠) وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " ووافقه الذهبي وهو كما قالا . وله شاهد من حديث سمرة بن جندب .

أخرجه النسائي (١/ ٢٦٨) وابن الجارود (٢٦٠) والبيهقي (٤٠٢/٣– ٤٠٣) وغيرهم قلت : وسنده صحيح أيضا كما قال الحاكم والذهبي والحافظ في " فتح الباري " ( ٣ / ١٠٥ ) .

لێ بێت . دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : " إن رسول الله ﷺ كفن في ثلاثة أثواب يمانية بيض سحولية [١٥٣] ، من كرسف ، ليس فيهن قميص ، ولا عمامة ( أدرج فيها إدراجا ) " [١٥٤] ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ پارچە قوماشی لۆكەی سپی كە لە ناوچەی ( سحول ) ی یەمەنیدا دروست كراو ، كفن كرا ، نە قەمیسیان تێدا بوو ، نە عەمامە ، بەڵكو خرایە ناو پارچەكانەوە .

سێیەم : ئەگەر دەست كەوت یەكێك لەو كفنانە عابای ( حِبَرَة ) [١٥٥] بێت ، كە جۆرێك عابای یەمەنیە خەت خەتی گران بەهای پیاوانەیە ، لە بەر وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " إذا توفي أحدكم فوجد شيئا ، فليكفن في ثوب حِبَرَة " [١٥٦] .

واتە : ئەگەر یەكێك لە ئێوە مرد و توانای هەبوو ، با كفنەكەی لە عابای ( حِبَرَة ) بێت ، كە جۆرێك عابای یەمەنیە خەت خەتی گران بەهای پیاوانەیە .

---

(١٥٣) قال الإمام النووي : (( السَّحُولِيَّة بِفَتْحِ السِّين وَضَمّهَا ، وَالْفَتْح أَشْهَر ، وَهُوَ رِوَايَة الْأَكْثَرِينَ . قَالَ اِبْن الْأَعْرَابِيّ وَغَيْره : هِيَ ثِيَاب بِيض نَقِيَّة لَا تَكُون إِلَّا مِنْ الْقُطْن ، وَقَالَ اِبْن قُتَيْبَة : ثِيَاب بِيض ، وَلَمْ يَخُصّهَا بِالْقُطْنِ ، وَقَالَ آخَرُونَ : هِيَ مَنْسُوبَة إِلَى سَحُول قَرْيَة بِالْيَمَنِ تُعْمَل فِيهَا ، وَقَالَ الْأَزْهَرِيّ : السَّحُولِيَّة – بِالْفَتْحِ – مَنْسُوبَة إِلَى سَحُول مَدِينَة بِالْيَمَنِ ، يُحْمَل مِنْهَا هَذِهِ الثِّيَاب ، وَبِالضَّمِّ ثِيَاب بِيض ، وَقِيلَ : إِنَّ الْقَرْيَة أَيْضًا بِالضَّمِّ ، حَكَاهُ اِبْن الْأَثِير فِي النِّهَايَة )) (شرح النووي على مسلم : ج ٣ / ص ٣٥٨ ) .

قال ابن البطال : (( والسحولية : البيض ، والسحل : الثوب الأبيض ، وقيل : إن « سحول » قرية باليمن تصنع ثياب القطن ، وتنسب إليها ، و الكرسف : القطن )) ( شرح البخاري لابن بطال : ج ٥ / ص ٢٨٢ ) .

وقال الحافظ ابن حجر : (( وَهُوَ بِضَمِّ أَوَّله وَيُرْوَى بِفَتْحِهِ نِسْبَة إِلَى سَحُول قَرْيَة بِالْيَمَنِ ... ، وَالْكُرْسُف بِضَمِّ الْكَاف وَالْمُهْمَلَة بَيْنهمَا رَاء سَاكِنَة هُوَ الْقُطْن )) ( فتح الباري لابن حجر : ج ٤ / ص ٣٠٨ ) .

(١٥٤) أخرجه الستة ، وابن الجارود (٢٥٩) والبيهقي (٣٩٩/٣) وأحمد (٦/ ٤٠، ٩٣، ١١٨ ، ١٦٥ ، ١٩٢ ، ٢٠٣ ، ٢٢١ ، ٢٣١ ، ٢٦٤ ) والزيادة له .

(١٥٥) بكسر الحاء المهملة وفتح الموحدة ما كان من البرود مخططا .

(١٥٦) أخرجه أبو داود ( ٢ / ٦١ ) ومن طريقه البيهقي ( ٣ / ٤٠٣ ) ومن طريق وهب بن منبه عن جابر مرفوعا .

قلت : وهذا سند صحيح عندي ، وهو كذلك عند المزي وأما الحافظ فقال في " التلخيص " من وجد سعة ، فليكفن في ثوب حبرة " وسنده صحيح لولا عنعنة أبي الزبير .

اعلم أنه لا تعارض بين الحديث الاول في " البياض " : " وكفنوا فيها موتا كم " . لامكان التوفيق بينهما بوجه من وجوه الجمع الكثيرة المعلومة عند العلماء ، ويخطر في بالي الان منها وجهان :

الاول : أن تكون الحبرة بيضاء مخططة ، وهذا إذا كان الكفن ثوبا واحدا ، وأما إذا كان أكثر فالجمع أيسر وهو الوجه الاتي .

الثاني : أن يجعل كفن واحد حبرة ، وما بقي أبيض ، وبذلك يعمل بالحديثين معا . وبهذا قال الحنفية ، ودليلهم هذا الحديث ، وليس هو الحديث الذي عزاه الحافظ لابي داود عن جابر أنه عليه السلام كفن في ثوبين وبرد حبرة . وقال : إسناده حسن ، فإن هذا لم يستدلوا به بل لا وجود له عند أبي داود ، بل عنده عن عائشة في حديثها وهو الثاني قالت : أتي بالبرد لكنهم ردوه ولم يكفنوه فيه وسنده صحيح .

چوارەم : سێ جار بۆن خۆشكردنی ، لە بەر وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی : " إذا جمرتم [١٥٧] الميت ، فأجمروه ثلاثا " [١٥٨] .

واتە : ئەگەر مردووتان بۆن خۆشكرد ، ئەوا سێ جار بۆن خۆشیان بكەن .

ئەم حوكمە كەسێك ناگرێتەوە كە لە پۆشاك و كاتی ئیحرام پۆشیدا مردبێت ، لە بەر ئەو فەرموودەی كە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو ئیحرام پۆشەی كە وشترەكەی خستووبوویە خوارەوە ، فەرمووی : " ... ولا تطيبــوه ... " ، واتە : بۆن خۆشیشی مەكەن ، فەرموودەكەش بە تەواوی و تەخریجەكەشی لە بابەتی ( ١٧ ) ، و لە برگەی ( د ) لە پەڕەی (  ) دا باسی لێوە كراوە .

٤٢ ـ وە ناشبێت زیادڕەوی بكرێت لە نرخی كفنەكەدا ، وە ناشبێت لە سێ دانە زیاتر بێت ، چونكە ئەوە پێچەوانەی ئەو كفنەیە كە پێغەمبەری خوایان ﷺ تێدا كفن كرد ، و لە كاتێكدا زیندووەكان ئەولا ترن پێی ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " إن الله كره لكم ثلاثا : قيـل وقـال ، وإضاعة المال ، وكثرة السؤال " [١٥٩] .

واتە : خوای پەروەردگار سێ شتی بەخراپ داناوە بۆ ئێوە كە ئەنجامیان بدەن : وتی ، و بەفیڕۆدانی سامان و پارە ، و زۆر پرسیار كردنیش .

٤٣ ـ ئافرەتیش لە هەموو ئەوانەدا وەكو پیاو وایە ، چونكە هیچ بەڵگەیەك نیە جیاوازیان لە نێواندا بكات [١٦٠] .

---

[١٥٧] فيض القدير – (ج ١ / ص ٤٢١) : (( إذا جمرتم الميت ) المسلم أي بخرتموه ، يقال جمر ثوبه تجميرا أبخر والمجمرة بكسر الميم )) .

[١٥٨] أخرجه أحمد (٣/٣٣١) وابن أبي شيبة (٩٢/٤) وابن حبان في " صحيحه "(٧٥٢– موارد)والحاكم (٣٥٥/١)والبيهقي (٤٠٥/٣) قال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " ووافقه الذهبي،وهو كما قالا ، وصححه النووي أيضا في " المجموع " (١٩٦/٥) .

[١٥٩] أخرجه البخاري ( ٣ / ٢٦٦ ) ومسلم ( ٥ / ١٣١ ) وأحمد ( ٤ / ٢٤٦ ، ٢٤٩ ، ٢٥٠ ، ٢٥٤ ) من حديث المغيرة بن شـعبة ، وله شاهد من حديث أبي هريرة ، أخرجه مسلم .

ويعجبني بهذه المناسبة ما قاله العلامة أبو الطيب في " الروضة الندية " ( ١ / ١٦٥ ) " وليس تكثير الاكفان والمغالاة في أثمانها بمحمود ، فإنه لولا ورود الشرع به لكان من إضاعة المال ، لانه لا ينتفع به الميت ، ولا يعود نفعه على الحي ، ورحم الله أبا بكر الصديق حيث قـال : " إن الحي أحق بالجديد " ، لما قيل له عند تعيينه لثوب من أبوابه في كفنه : " إن هذا خلق " . والحديث الذي فيه أن النبي ﷺ كفـن في في سـبعة أثواب ، منكر تفرد به من وصف بسوء الحفظ فراجعه في " نصب الراية " ( ٢ / ٢٦١ – ٢٦٢ ) .

[١٦٠] وأما حديث ليلى بنت قائف الثقفية في تكفين ابنته ( ص ) في خمسة أثواب فلا يصح إسناده ، لان فيه نوح بن حكيم الثقفـي وهـو مجهول كما قال الحافظ ابن حجر وغيره وفيه علة أخرى بينها الزيلعي في " نصب الراية " ( ٢ / ٢٥٨ ) .

## ( ١٢ ) هەڵگرتنی جەنازە و شوێن كەوتنی ( حمل الجنازة واتباعها ) :

٤٣ . وە هـەڵگرتنی جەنازە و شـوێن كـەوتنی پێویسته ( واجـب ) ە ، و ئـەوەش یەكێكە لـە مافەكانی مردووی موسڵمان لەسەر موسڵمانان ، لـەو بارەشـەوە چـەند فەرموودەیـەك هـەن ، لێرەدا دووانێن باس دەكەم لەوانە :

یەكەم : ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا فەرموویەتی : " حق المسلم ( وفي رواية : يجب المسلم على أخيه ) خمس : رد السلام ، وعيادة المريض ، واتباع الجنائز ، وإجابة الـدعوة ، وتـشميت العاطس " [١٦١] ، واتە : مـافی موسڵمان لەسـەر موسڵمان ( وە لـە ڕیوایـەتێكی تـردا هـاتووە : پێنج شت واجبە لەسەر موسڵمان دەرهـەق براكەی ، ئـەوانیش : وەڵام دانـەوەی سـەلام ، و سەركێشی و سـەرلێدانی لـە كـاتی نەخۆشـیدا ، و شـوێن كـەوتنی جەنازەكـەی دوای مردنـی ، وەڵام دانـەوەی دەعوەت و میواندارییەكەی ، و ئەگەر پژمی و وتی : ( الحمد لله ) . پێی بڵێـت : ( يرحمك الله ) ، وە لـە ڕیوایـەتێكی تـردا هـاتووە فـەرمووی : شـەش شـتە : و ئەمـەی بـۆ زیـادكردن : ( وە ئەگـەر داوای ئامۆژگاری لێ كردیت ئامۆژگاری بكەیت ) .

دووەم : ئەو فەرموودەیەشی كە تێیدا ﷺ : " عودوا المريض ، واتبعوا الجنائز ، تذكركم الآخـرة " [١٦٢] ، واتـە : سـەركێشی و سـەردانی نـەخۆش بكـەن ، وشـوێنی جـەنازە بكـەون ، قیامـەتتان بـیر دەخاتەوە .

٤٤ . وشوێن كەوتنی جەنازەش دوو قۆناغە :

یەكەمیان : شوێن كەوتنی لە ماڵی مردووەكەوە تاكو نوێژی لەسەر دەكرێت .

دووەمیان : شوێن كەوتنی لەماڵی مردووەكەوە هەتاكو بەخاك سپاردن ودفن كردنی ( ناشتنی ) وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو پلەكەی بە كردەوە ئەنجام داوە .

---

[١٦١] أخرجه البخاري (٨٨/٣) والسياق له ، ومسلم (٣/٧) بالرواية الثانية وابن ماجه (٤٣٩/١) وابن الجارود (٢٦١) وأحمد (٥٤٠/٢،٤١٢،٣٧٢)، وقال في رواية له: " ست ". وزاد :" وإذا استنصحك فانصح له " ،وهي رواية لمسلم أيضا ،أخرجوه كلهم من حديث أبي هريرة ....وفي الباب عن البراء بن عازب عند الشيخين وغيرهما .

[١٦٢] أخرجه ابن أبي شيبة في " المصنف " ( ٤ / ٧٣ ) والبخاري في " الادب المفرد " ( ص ٧٥ ) وابن حبان في " صـحيحه " ( ٧٠٩ - موارد ) والطيالسي ( ١ / ٢٢٤ ) وأحمد ( ٣ / ٢٧ ، ٣٢ ، ٤٨ ) والبغوي في " شرح السنة " ( ١ / ١٦٦/ ١ ) مـن حـديث أبي سـعيد الخدري . قلت : وإسناده حسن . وله شاهد من حديث عوف بن مالك بدون الجملة الاخيرة . رواه الطبراني . راجع " المجمع " ( ٢/ ٢٩٩ ) .

( أبو سعيد الخدري ) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووی : " كنا مقدم النبي ﷺ ( يعني المدينة ) ، إذا حضر منا الميت آذنا النبي ﷺ ، فحضره واستغفر له ، حتى إذا قبض ، انصرف النبي ﷺ ومن معه حتى يدفن ، و ربما طال حبس ذلك على النبي ﷺ ، فلما خشينا مشقة ذلك عليه ، قال بعض القوم لبعض : لو كنا لا نؤذن النبي ﷺ بأحد حتى يقبض ، فإذا قبض آذناه ، فلم يكن عليه في ذلك مشقة ولا حبس ، ففعلنا ذلك ، وكنا نؤذنه بالميت بعد أن يموت ، فيأتيه فيصلي عليه ، فربما انصرف ، وربما مكث حتى يدفن الميت ، فكنا على ذلك حينا ، ثم قلنا لو لم يشخص النبي ﷺ ، وحملنا جنازتنا إليه حتى يصلي عليه عند بيته لكان ذلك أرفق به ، فكان ذلك الامر إلى اليوم " (١٦٣) .

واتە : لە سەرەتای گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مدینە ئەگەر مردوویەکمان لەسەرە مەرگدا بوایە ، داوامان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد کە ئامادەی ببێت ، و ئەویش ئامادەی دەبوو و داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکرد ، هەتاکو گیانی دەسپارد ، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دەگەڕانەوە ، هەتاکو بەخاك دەسپێردرا ، و جاری واش دەبوو مانەوەی پێغەمبەر ﷺ درێژەی دەکێشا ، و کاتێك کە ترساین ئەمە نارەحەتی لەسەر پێغەمبەر ﷺ دروست بکات ، چەند کەسێك وتیان : واباشتر نیە تاکو ئەو کەسانەمان گیان نەسپێرن داوا لە پێغەمبەر ﷺ نەکەین ئامادە بێت ؟ و ئەو کات زەحمەت نابێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و دوای ناخەین و دەستی ناگرین ، ئێمەش ئەوەمان کرد ڕوخسەتمان لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت کە مردووەکە بمردایەت ، ئەویش ئامادە دەبوو و نوێژی لەسەر دەکرد ، جاری واش هەبوو لەدوای نوێژ دەگەڕایەوە ، و جاری واش هەبوو دەمایەوە هەتاکو مردووەکە دەنێژرا ، زەمانێك لەسەر ئەم پەیڕەوە بووین ، دوای وتمان ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئامادە نەبێت و ئێمە جەنازەکە ببەین بۆ خزمەتی ولای ماڵەکەی خۆیدا نوێژی لەسەر بکات ئاسانترە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئیتر بەم شێوەیە بووین تاکو ئەمڕۆ .

٤٥ . وە بێگومان پلەوپایەی دووەمیان لە یەکەمیان باشتر وچاکترە لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : " من شهد الجنازة ( من بيتها ) ، ( وفي رواية : من اتبع جنازة مسلم إيمانا واحتسابا ) حتى يصلى عليها فله قيراط ، ومن شهد ها حتى تدفن ، ( وفي الرواية الأخرى : يفرغ منها ) فله قيراطان ( من الاجر ) ، قيل : ( يارسول الله ) وما القيراطان ؟ قال : مثل الجبلين العظيمين . ( وفي الرواية الأخرى : كل قيراط مثل أحد ) " (١٦٤) .

---

(١٦٣) أخرجه ابن حبان في صحيحه (٧٥٣-مورد) والحاكم (١/٣٥٣-٣٦٤-٣٦٥) وعنه البيهقي (٣/٧٤) وأحمد (٣/٦٦) بنحوه ، وقال الحاكم: "صحيح على شرط الشيخين "اوإنما هو صحيح فقط ،لان فيه سعيد بن عبيد بن السباق ،ولم يخرجا له شيئا.

(١٦٤) أخرجه البخاري ( ١ / ٨٩ - ٩٠ ، ٣ / ١٥٠ ، ١٥٤ ) ومسلم ( ٣ / ٥١ - ٥٢ ) وأبو داود ( ٢ / ٦٣ - ٦٤ ) والنسائي ( ١ / ٢٨٢ )

واتە : هەر كەسێك ئامادەی جەنازەیەك بێت ( لەماڵی مردووەكە ) لە ڕیوایەتێكدا : هەر كەسێك شوێنی جەنازەی موسڵمانێك بكەوێت ( باوەڕی پێ بێت و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بكات ) هەتاكو نوێژی لەسەر دەكرێت ئەوە قیراتێكی دەست دەكەوێت ، و هەر كەسێكیش ئامادەی بێت هەتاكو دەنێژرێت ( لە ڕیوایەتێكدا تردا : هەتاكو لە جەنازەكە دەبنەوە ) ئەوە دوو قیراتی بۆ هەیە ( لە پاداشت ) وترا : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو قیرات چیە ؟ فەرمووی : وەكو دوو كێوی زۆر گەورەیە ( لە ڕیوایەتێكی تردا : هەر قیراتێكی وەكو كێوی ئوحود وایە ) .

٤٦ . وە ئەم پاداشت وچاكەیەی كە لە شوێن كەوتنی جەنازەدایە تایبەتە بە پیاوان ، و ژنان

---

والترمذي ( ٢ / ١٥٠ ) وصححه ، وابن ماجه ( ١ / ٤٦٧ – ٤٦٨ ) وابن الجارود ( ٢٦١ ) والبيهقي ( ٣ / ٤١٢ – ٤١٣ ) والطيالسي ( ٢٥٨١ ) وأحمد ( ٢ / ٢٣٣ ، ٢٤٦ ، ٣٢٠ ، ٤٠١ ، ٤٥٨ ، ٤٧٠ ، ٤٧٤ ، ٤٩٣ ، ٥٢١ ، ٥٣١ ) من طرق كثيرة عن أبي هريرة ﷺ .

والرواية الثانية للبخاري والنسائي وأحمد . والزيادة الاولى لمسلم وأبي داود وغيرها ، والزيادتان الاخريان للنسائي .

وللحديث شواهد عن جماعة من الصحابة ﷺ .

الاول : عن ثوبان عند مسلم والطيالسي (٩٨٥) وأحمد (٥/٢٧٦– ٢٧٧،٢٨٢–٢٨٣–٢٨٤).

الثاني والثالث : عن البراء بن عازب لث :عن البراء بن عازب وعبد الله بن مغفل ،عند النسائي وأحمد (٤/٢٩٤،٨٦) .

الرابع :عن أبي سعيد الخدري . رواه أحمد (٣/٢٧،٩٧،٢٠) من طريقين عنه.وله شواهد أخرى ذكرها الحافظ في " الفتح " (٣/١٥٣) .

وە لە هەندێك لە ( شواهد ) ەكانی ئەم فەرمودەیە لە ( أبو هريرة ) ەوە هەندێك زیادەی سودبەخش هاتوون ، ڕەنگە باشتر وابێ باسبكرێن لەوانەش : " وكان ابن عمر يصلي عليها ، ثم ينصرف ، فلما بلغه حديث أبي هريرة قال :( أكثر علينا أبو هريـرة ، ( وفي رواية : فتعاظمه ) )،( فارسل خبابا إلى عائشة يسألها عن قول أبي هريرة ثم يرجع إليه فيخبره ما قالت ، وخذ ابن عمر قبضة من حصى المسجد يقلبها في يده حتى رجع إليه الرسول ، فقال :قالت عائشة:صدق أبو هريرة،فضرب ابن عمر بالحصى الذي كان في يده الارض ثم قال: )لقـد فرطنا في قراريط كثيرة،( فبلغ ذلك أبا هريرة فقال:إنه لم يكن يشغلني عن رسول الله ﷺ صفقة السوق،ولا غرس الودي ،إنما كنت ألزم النبي ﷺلكلمة يعلمنيها،وللقمة يطعمنيها )،(فقال له ابن عمر:أنت يا أبا هريرة كنت ألزمنا لرسول الله ﷺ وأعلمنا بحديثه ) ".

هذه الزيادات كلها لمسلم ،إلا الاخيرة ، فهي لاحمد (٢/٢– ٣ ، ٣٨٧ ) وكذا سعيد بن منصور بإسناد صحيح كما قال الحافظ في " الفتح " ، والتي قبلها للطيالسي وسندها صحيح على شرط مسلم ، والزيادة الثانية للشيخين ، والرواية الثانية فيها للترمذي وأحمد .

والزيادة الاخيرة صريحة بأن ابن عمر ﷺ اتصل عنه اسصل بنفسه بأبي هريرة،ويؤيده ما في رواية لمسلم وغيره بلفظ:فقال ابن عمر: أبا هر انظر ما تحدث عن رسول ﷺ،فقام إليه أبو هريرة حتى انطلق به إلى عائشة،فقال لها ، يا أم المؤمنين أنشدك بالله أسمعت رسول الله ﷺ يقول : ( فذكر الحديث ) ، فقالت : اللهم نعم ، فقال أبو هريرة : إنه لم يكن . . الخ . فظاهر هذا كله يخالف رواية أنه أرسل خبابا إلى ابن عمر . وجمع الحافظ ابن حجر بين الروايتين بأن الرسول لما رجع إلى ابن عمر يخبر عائشة بلغ ذلك أبا هريرة ، فمشى إلى ابن عمر فأسمعه ذلك مـن عائـشة مشافهة . ولابي هريرة ﷺ حديث آخر في فضل شهود الجنازة ، قال : قال رسول الله ﷺ : " من أصبح منكم اليوم صائما ؟ قال أبو بكر : أنا ، قال : من عاد منكم اليوم مريضا ؟ قال أبو بكر : أنا ، قال : من شهد منكم اليوم جنازة ؟ قال أبو بكر : أنا قال : من أطعم اليوم مسكينا ؟ قال أبو بكر : أنا ، قال ﷺ : ما اجتمعت هذه الخصال في رجل في يوم إلا دخل الجنة " . أخرجه مسلم في " صـحيحه " ( ٣ / ٩٢ ، ٧ / ١١٠ ) والبخاري في " الادب المفرد " ص ٧٥ .

ناگرێتەوە ، لەبەر نەهی كردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتان كە شوێنی جەنازە نەكەون ، نەهیەكەش لە جۆری نەهی تەنزیهیە ( واتە : بۆ حەرامێتی نیە ) چونكە ( أم عطیـــة ) - ڕەزای خوای لێ بێت . دەفەرموێت : " كنا ننهی ( وفي رواية : نهانا رسول الله ﷺ ) عن اتباع الجنائز ، ولم يعزم علينا " [١٦٥] .

واتـە : نـەهی مـان لێكرا ( لـە ڕیوایەتێكدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـەهی لێكردین ) كـە شـوێنی جەنازە بكەوین ، بەڵام زۆر جەختمان لەسەر نەكرا .

٤٧ . وە دروست نیە كە شوێنی جەنازە بكەوڕێت بەشتێك كە پێچەوانەی شەرع بێت ، وە دەقی شەرعیش لەسەر دووشت هاتووە : دەنگ بەرز كـردنەوە بەگریان ، وە شوێن كـــەوتنی بـــە ( بخور ) ، وە ئەوەش لەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : " لا تتبع الجنازة بصوت ولا نار " [١٦٦] ، واتـە : دوای جـەنازە مەكـەون بـەدەنگێك یـان بـەئاگر ) ( بـەدەنگ و بـەئاگر دوای جـەنازە مەكەون ) ، وە ئەو ڕیوایەتانەش كە ( شاهد ) ی ئەو فەرموودەیە بن ئەمانەن :

لە ( جابر ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ : " نهى أن يتبع الميت صوت أو نار " [١٦٧] ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە بە دەنگ یان ئاگر شوێنی جەنازە بكەوێت .

وە لە ( ابن عمر ) ەوە ﷺ فەرمووی : " نهى رسول الله ﷺ أن تتبع جنازة معها رانة " [١٦٨] ، واتـە : پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە كە دوای جەنازەیەك بكەوێت كە دەنگی لەگەڵ دابێت .

وە سەبارەت بە ( الآثار ) انەی كە لەو بارەیەوە هاتوون :

لە ( عمرو ) كوڕی ( العاص ) ﷺ دەگێڕنەوە كە لە وەسێتەكەیدا فەرموویەتی " فإذا أنا مت فـلا تصحبني نائحة ولا نار " [١٦٩] ، واتە : ئەگەر من مردم با شیوەن كار وئاگرم لە گەڵدا نەهێنرێت .

وە لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە لەكاتی سەرەمەرگیدا فەرموویەتی: " لا تضربوا علـي فسطاطا ، ولا تتبعوني بمجمر ( وفي رواية : بنار ) " [١٧٠] .

---

[١٦٥] أخرجه البخاري (٣٢٨/١-٣٢٩،٣-١٦٢/٣) ومسلم (٤٧/٣) والسياق له ،وأبو داود (٦٣/٢)وابن ماجـه (١/ ٤٨٧ ) وأحمـد (٤٠٨،٤٠٩/٦) وكذا البيهقي ( ٤ / ٧٧ ) والاسماعيلي والرواية الاخرى له ، وهي رواية للبخاري تعليقا .

[١٦٦] أخرجه أبو داود (٦٤/٢) وأحمد (٤٢٧،٥٢٨،٥٣٢/٢) من حديث أبي هريرة . وفي سنده من لم يسم ، لكنه يتقـوى بـشواهده المرفوعة ، وبعض الاثار الموقوفة .

[١٦٧] قال الهيثمي ( ٣ / ٢٩ ) : " رواه أبو يعلى ، وفيه من لاذكر له " .

[١٦٨] أخرجه ابن ماجه ( ١ / ٤٧٩ - ٤٨٠ ) وأحمد (٥٦٦٨)من طريقين عن مجاهد عنه . وهو حسن بمجموع الطريقين . وعن أبي موسى في النهي عن اتباع الميت بمجمر .وقد تقدم لفظه في المسألة(٢١)فقرة(ب)،( ص٨) .

[١٦٩] أخرجه مسلم ( ١ / ٧٨ ) وأحمد ( ٤ / ١٩٩ ) .

[١٧٠] رواه أحمد وغيره بسند صحيح كما يأتي بعد مسألة ، الحديث الثاني .

واتە : چادرم لەسەر هەڵمەدەن ، و بە ( بخـور ) ەوە دوام مەكەون ( وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : بە ئاگر ) شوێنم مەكەون .

٤٨ . دەنگ بەرز كردنەوە بە ( زیكر ) لە پێش جەنازە دەدرێتە پاڵ ئەوەی پێشوو لە حوكمدا ، چونكە داهێنراو و بیدعەیە ، وە لەبەر وتەی ( قیس ) ی كوڕی ( عبـاد ) كە فەرموویەتی : " كـان أصحاب النبي ﷺ يكرهون رفع الصوت عند الجنـائز " (١٧١) ، واتە : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ حەزیان نەدەكرد دەنگ بەرز بكرێتەوە لە لای جەنازەدا .

وە لەبەر ئەوەی تەشەبوهە ( خۆ چوواندنە ) بە خاچ پەرستان ( النـصارى ) ، كە ئەوان دەنگ بەرز دەكەنەوە بە هەندێك لە ئینجیلەكانیان و زیكرەكانیان كە بەدەنگێكی درێژكراوی ، و بە ئاواز و غەمناكیەوە دەیڵێن (١٧٢) .

وە لە ئەوەش ناشرینتر و خراپتر ئەوەیە تەرمەكە بەڕێبكرێت بە لێدانی ئاوازێكی مۆسیقی غەمبارانە و بە ئامێرە مۆسیقییەكان ، كە لە هەندێك وڵاتی ئیسلامیدا دەكرێت !! كە لاسایی كردنەوەی كافرانە ، خوا یارمەتی دەرمان بێت .

٤٩ . وە پێویستە پەلە بكرێت لە ڕۆیشتن و بەڕێبكردنی جەنازەكە ، بە ڕۆیشتنێك لە ( الرمل ) كەمتر بێت ، لەم بارەیەوە چەند فەرموودەیەك هەیە :

**یەكەم :** " أسرعوا بالجنازة ؛ فإن تك صالحة فخير تقدموها ، وإن تكن غير ذلك فشر تضعونه عن رقابكم " (١٧٣) ، واتە : پەلەبكەن لە بەڕێكردنی جەنازەدا ، چونكە ئەگەر پیاوچاك و بۆ خوا صوڵحاو بێت ، ئەوا چاكەیەكە و بەرەو پیری دەبن ، وە ئەگەر ئەوەش نەبێت ئەوا شەڕێكە لەكۆڵی خۆتانی دەكەنەوە .

دووەم : " إذا وضعت الجنـازة ، واحتملها الرجـال على أعناقهم ، فـإن كـانت صـالحة قالـت : قدموني ( قدموني ) ، وإن كانت غير صالحة قالت : يا ويلها أين يذهبون بها ؟! يسمع صـوتها كـل شـيء إلا

---

(١٧١) أخرجه البيهقي ( ٤ / ٧٤ ) بسند رجاله ثقات .

(١٧٢) قال النووي رحمه الله تعالى في " الا ذكر " ( ص ٢٠٣ ) : " واعلم أن الصواب والمختار وما كان عليه الـسلف رضـي الله عنـهم السكوت في حال السير مع الجنازة ، فلا يرفع صوت بقراءة ولا ذكر ولا غير ذلك . والحكمة فيه ظاهرة ، وهي أنه أسكن لخاطره واجمع لفكره فيما يتعلق بالجنازة ، وهو المطلوب في هذا الحال ، فهذا هو الحق ، ولا تغتر بكثرة من يخالفه ، فقد قال أبو علي الفضيل بن عياض رضي الله عنه ما معناه : " إلزم طرق الهدي ولا يضرك قلة السالكين ، وإياك وطرق الضلالة ولا تغتر بكثرة الهالكين " . وقـد روينا في سنن البيهقي ما يقتضي ما قلته ( يشير إلى قول قيس بن عباد ) . وأما ما يفعله الجهلة من القراءة على الجنازة بدمشق وغير ها من القراءة بالتمطيط وإخـراج الكـلام عـن مواضعه فحرام بإجماع العلماء ، وقد أو ضحت قبحه وغلظ تحريمه وفسق من تمكن من إنكاره فلم ينكره في كتاب " آداب القراءة " . والله المستعان " .

(١٧٣) أخرجه الشيخان ، والسياق لمسلم ، وأصحاب السنن الاربعة ، وصححه الترمذي وأحمد (٢/٢٨٠،٢٤٠، ٤٨٨) والبيهقـي (٤/ ٢١) من طرق عن أبي هريرة ، وله حديث آخر بنحو الآتي .

الإنسان ، ولو سمعه ( لـــ ) صعق " [١٧٤] .

واتە : ئەگەر جەنازە دانرا ، و پیاوان دایان بە شانیاندا و لە سەر گەردنیان دانا ، جا ئەگەر چاكەكار بێت دەڵێت : پەلە بكەن لە پێشخستنم ، وە ئەگەر چاكەكار نەبێت ( واتە : خراپەكار بێت ) دەڵێت : ئەی قوڕی بەسەر بۆ كوێی دەبەن ؟! هەموو شتێك دەنگەكەی دەبیستێت مرۆڤ نەبێت ، ئەگەر بیبیستێت لە ناودەچێت .

سێیەم : لە ( عبدالرحمن ) ی كوڕی ( جوشن ) ەوە فەرمووی : " كنت في جنازة عبدالرحمن بن سمرة ، فجعل زياد ورجال من مواليه يمشون على أعقابهم أمام السرير ، ثم يقولون : رويدا رويــدا بــارك الله فــيكم : فلحقهم أبو بكرة في بعض سكك المدينة فحمل عليهم بالبغلة ، وشد عليهم بالسوط ، وقال : خلوا ! والــذي أكرم وجه أبي القاسم ﷺ لقد رأيتنا على عهد رسول الله ﷺ لنكاد أن نرمل بها رملا " [١٧٥] .

واتە : لە گەڵ جەنازەكەی ( عبدالرحمن ) ی كوڕی ( سمرة ) بووم ، ( زیــاد ) و چەند پیاوێك لە خزمەتكارانی بەپشتاو پشت لەپێش جەنازەكەوە ڕێیان دەكرد ، و دەیانووت : لــەسەرخۆ بن لــەسەرخۆ خــوای پەروەردگار بەرەكەت بخاتە ژیانتانەوە ( بارك الله فيكم ) ، دوای ئەوە ( أبو بكرة ) بە شوێنیاندا ڕۆیشت لەیەكێك لەڕێچكەكانی مدینە بینیانی و بەسواری ئێسترەكەی گەشت پێیان وبە قامچی دەیدا لێیان ، ودەیووت : دووركەونەوە !! سوێند بێت بەو كەسەی ڕوومەتی ( أبو القاسم ) ی ﷺ پیرۆز ڕاگرتووە ، ئەگەر لەو سەردەمەی ئێمە ببایەی لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

[١٧٤] أخرجه البخاري (١٤٢/٣) والنسائي (٢٧٠/١) والبيهقي وأحمد (٤١،٥٨/٣) عن أبي سعيد الخدري ﷺ .

والزيادة للنسائي ، وللبيهقي منهما الأولى ، ولأحمد الأخرى.

ويشهد للزيادة الاولى حديث أبي هريرة أنه قال حين حضره الموت : " لا تضربوا علي فسطاطا،ولا تتبعوني بمجمر،وأسر عوا بي،فإني سمعت رسول الله ﷺ يقول : " إذا وضع الرجل الصالح على سريره ، قال : قدموني... " الحديث نحوه ، دون قوله يسمع صوتها ... أخرجه النسائي وابن حبان في صحيحه ( ٧٦٤ ) والبيهقي والطيالسي ( رقم ٢٣٣٦ ) وأحمد (٢٩٢/٢ ، ٢٧٤ ،٥٠٠ ) بإسناد صحيح على شرط مسلم .

واتە : چادرم لەسەر هەڵنەدەن ، وبە ( بخور ) دوام نەكەون ، پەلەم پێ بكەن ، بەڕاستی گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ( ئەگەر پیاوی چاكەكار لەسەر جێگەكەی دانرا ، دەڵێت : بەرەو پێشم ببەن ... ) فەرموودەكە وەكو ئەوەی پێشترە ، بەبێ ئەوەی بڕگەی ( هەموو شتێك گوێی لێ دەبێت ... ) .

[١٧٥] اخرجه أبو داود ( ٢ / ٦٥ ) والنسائي ( ١ / ٢٧١ ) والطحاوي ( ١ / ٢٧٦ ) والحاكم ( ١ / ٢٥٥ ) والبيهقــي ( ٤ / ٢٢ ) والطيالسي ( ٨٨٣ ) وأحمد ( ٥ / ٣٦ – ٣٨ ) قال الحاكم : " صحيح " . ووافقه الذهبي ، ومن قبله النووي في " المجموع " ( ٥ / ٢٧٢ ) وقال فيه ( ٥ / ٢٧١ ) : " واتفق العلماء على استحباب الاسراع بالجنازة إلا أن يخاف من الاسراع انفجار الميت أو تغيره ونحوه فيتــأني " . قلت : ظاهر الامر الوجوب ، وبه قال ابن حزم ( ٥ / ١٥٤ – ١٥٥ ) ، ولم نجد دليلا يصرفه إلى الاستحباب ، فوقفنا عنده . وقا لابن القيم في" زاد المعاد ":" وأما دبيب الناس اليوم خطوة فبدعة مكروهة ، مخالفة للسنة ، ومتضمنة للتشبه بأهل الكتاب اليهود ".

دەمانت بینی چۆن بەخێرا جەنازەكەمان دەبرد .

٥٠ . وە خەڵكی پیادە دەتوانێت لە پێش جەنازە و پاشی ولای ڕاست و لای چەپیەوە ڕێبكات ، بەمەرجێك لـە نزیك جەنازەكـەوە بێـت ، جگـە لـە سـوار نـەبێت.دەبێت لەپشتێەوە ڕێ بكات لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ كـە فـەرموویەتی : " الراكب ( يسير ) خلف الجنازة ، و الماشي حيث شاء منها ، ( خلفها وأمامها ، وعن يمينها ، وعن يسارها ، قريبا منها ) ، والطفل يصلى عليه ، ( و يـدعى لوالديـه بالمغفرة والرحمة ) " [١٧٦] ، واتە : سوار لەپشتی جەنازەكە ڕێ دەكات ، و پیادەش لـەو شوێنەی كە خـۆی دەیـەوێت لای جەنازەكـە ( لـە پـشتیەوە ، و لـە پێـشیەوە ، و لـە لای ڕاسـتیەوە ، و لـە لای چـەپیەوە ، نزیـك جەنازەكـە و منـداڵیش نوێـژی لەسـەر دەكرێـت ، ( و داوای لـێ خۆشـبوون و ڕەحمەت بۆ دایك و باوكی دەكرێت ) .

٥١ . وە ڕێكردن لە پێش جەنازە و لە پاشیەوە جێگر و سەلمێندراوە لـە كردەوەی پێغەمبـەری خوا ﷺ هەروەك ( أنس ) ی كوڕی ( مالك ) ﷺ دەفـەرموێ : " أن رسول الله ﷺ و أبا بكـر و عمـر كانوا يمشون أمام الجنازة وخلفها " [١٧٧] ، واتـە : پێغەمبـەری خـوا ﷺ و ( أبـو بكر ) و ( عـمر ) یـش لـە پێش جەنازەوە و لـە پاشیەوە ڕێیان دەكرد .

٥٢ . بـەڵام باشـتر وایـە لـەدوای جـەنازەوە ڕێ بكرێـت ، چـونكە ئەمـە داخـوازی فـەرموودەی پێغەمبەری خوایـە ﷺ كە فەرموویـەتی : " واتبعـو الجنـائز " وە ئەو فەرموودانـەی كە لـە مانـای

---

[١٧٦] أخرجه أبو داود (٢/٦٥) والنسائي (١/٢٧٥-٢٧٦) والترمذي (٢/١٤٤) وابن ماجه ( ١ /٤٥١، ٤٥٨) والطحاوي (١/٢٧٨) وابن حبان في " صحيحه " ( ٧٦٩ ) والبيهقي ( ٨٤ ، ٢٥ ) والطيالسي (٧٠١- ٧٠٢ ) وأحمـد ( ٤ / ٢٤٧ ، ٢٤٨ - ٢٤٩ ، ٢٤٩ ، ٢٥٢ ) من حديث المغيرة بن شعبة ، وقال الترمذي : " حديث حسن صحيح " .

وقال الحاكم : " صحيح على شرط البخاري ".ووافقه الذهبي .وهو كما قالا .والسياق للنسائي وأحمد في رواية .

والزيادات الثلاث لابي داود والحاكم والطيالسي ، ولاحمد الاوليان منها ، وللبيهقي الثالثة . وقال أبو داود وابن حبان :" السقط " بدل " الطفل "وهـو رواية للحاكم والبيهقي وأحمد، وعزاها الحافظ في " التلخيص " (١٤٧/٥) للترمذي أيضا ، وهو وهم فإنما لفظه عنده كلفظ الجماعة .

قلت : وأما ما في " الجوهر النقي " (٢٥/٤) : " وفي مصنف عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاووس عن أبيه قال : " ما مشى رسول الله حتى مـات ، إلا خلف الجنازة " . وهذا سند صحيح على شرط الجماعة " . فأقول : كيف وهو مرسل : فإن طاووسا تابعي وقد أرسله ، والمرسل ليس حجة عندهم ، وقـد عارضه حديث أنس الصحيح ، وأعله الشوكاني (٦٢/٤) ايضا بالارسال ، ولكنه قال : " لم أقف عليه في شئ من كتب الحديث " .

[١٧٧] أخرجه الطحاوي ( ١ / ٢٧٨ ) من طريقين عن يونس بن يزيد عن ابن شهاب عن . قلت : وهذا سند صحيح على شرط الشيخين .

قلت : وأما ما في " الجوهر النقي " (٢٥/٤) : " وفي مصنف عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاووس عن أبيه قال : " ما مشى رسـول الله حتى مات ، إلا خلف الجنازة " . وهذا سند صحيح على شرط الجماعة " . فأقول : كيف وهو مرسل : فإن طاووسا تابعي وقد أرسله ، والمرسل ليس حجة عندهم ، وقد عارضه حديث أنس الصحيح ، وأعله الشوكاني (٦٢/٤) ايضا بالارسال ، ولكنه قال : " لم أقف عليه في شئ من كتب الحديث " .

ئەمەدایـە کـە لەبابـەتی ( ٤٣ ) ی سـەرەتای ئـەم باسـە باسـکراوە ، وە ئـەوەش پتـەوکاری پاڵپـشتی ئەمە بێت وتەی ( علي ) یە ﷺ کە دەفەرمووێ : " المشي خلفها أفضل مـــــن المشي أمامهـــا ، کفــضل صلاة الرجــل في جــماعة على صلاته فــذا " (١٧٨) .

واتە : ڕێ کردن لە پاشەوەی جەنازە باشترە لــە ڕێکردن لە پشتیەوە ، وەکو نوێژی پیاوێك بە ( جەماعەت ) چۆن باشترە لە نوێژەکەی بەتەنها .

٥٣ . وە سـوار بـوونیش دروسـتە بەمـەرجێك لـەدوای جەنازەکـەوە ڕێ بکـات ، ئـەوەش لەبـەر فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویـەتی : " الراکب يـــسير خلــف الجنـــازة ... " ، واتـە : سـوار لەدوای جەنازەوە ڕێ دەکات ... هتد ، وە ئەم فەرموودەیەش بەتەواوی باس کراوە لە بابـەتی ( ٥٠ ) دا ، بەڵام بە پیادە ڕۆشتن باشترە لە سواری ، چونکە ئەمە زانراوە لە پێغەمبەری خـواوە ﷺ ، وە هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە کە بۆمان بگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـوا ﷺ بـە سـواری دوای جـەنازە کەوتبێت ، بەڵکو ( ثوبان ) ﷺ فەرموویەتی : " إن رسول الله ﷺ أتي بدابة وهو مــع الجنـــازة فـــأبى أن يركبها ، فلما انصرف أتي بدابة فركب ، فقيل له ؟ فقال : إن الملائكة كانت تمشي فلم أكُ لاركب وهم يمشون ، فلما ذهبوا ركبت " (١٧٩) .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵێکیان بۆ هێنا کاتێك کە لـە گـەڵ جەنازەیەکدا بوو بۆ ئـەوەی سواری بێـت ، بـەڵام ڕازی نـەبوو کـە سـواری بێـت ، وە لـە کـاتی گەڕانەوەیدا ئاژەڵێکیـان بۆ هێنـا و سواری بـوو ، پێیان فەرموو ئەو کارەت لەبەر چی بوو ؟ ئەویش فەرمووی : لــەوکاتەدا فریشتەکان ( ملائكة ) بـــە پیـادە دەڕۆشـتن ، حـــەزم نـــەدەکرد سـوارابم و ئـەوانیش بەپیادە بـڕۆن ! وە کاتێك

---

(١٧٨) أخرجه ابن أبي شيبة في " المصنف " ( ٤ / ١٠١ ) والطحاوي ( ١ / ٢٧٩ ) والبيهقي ( ٤ / ٢٥ ) وأحمد ( ٧٥٤ ) وكذا ابن حزم في " المحلى " ( ٥ / ١٦٥ ) وسعيد بن منصور من طريقين عنه ، قال الحافظ ( ٣ / ١٤٣ ) في أحدهما : " وإسناده حسن ، وهو موقوف لــه حكم المرفوع ، لكن حكى الاثرم عن أحمد أنه تكلم في إسناده " . قلت : لكنه يتقوى بالطريق الاخر .

تنبيه : قال الشوكاني عقب كلمته السابقة : " وحكى في البحر عن الثوري أنه قال : الراكب يمشي خلفها ، والماشي أما مها . ويدل لما قاله حديث المغير ة المقدم أن النبي ﷺ قال : " الراكب خلف الجنازة ، والماشي أما مها قريبا منها عن يمينها أو عن يسارها . أخرجه أصحاب السنن وصححه ابن حبان والحاكم ، وهذا مذهب قوي ... " . قلت : كلا فإن الحديث بهذا اللفظ رواه أحمد من طريق المبارك بن فضالة ، وفيه ضعف وقد زاد غيره فقال : " خلفها وأمامها ... " كما تقدمت الاشارة إليها ، وقد رواها المبارك أيضا عند الطيالسي ، فوجب الاخذ بها ، وهي نص في التخيير لا في تفضيل التقدم عليها ، ومن الغريب أن هذه الزيادة ذكرها صاحب المنتقى في المكان الذي أشار إليه الشوكاني نفسه بقوله آنفا " المتقدم " ثم هو ذهل عنها .

(١٧٩) أخرجه أبو داود ( ٢ / ٦٤ - ٦٥ ) والحاكم ( ١ / ٣٥٥ ) والبيهقي ( ٤ / ٢٣ ) وقال الحاكم : " صحيح على شرط الشيخين " . ووافقه الذهبي وهو كما قالا .

ئەوان ڕۆیشتن ئەو کات منیش سوار بووم .

٥٤ . بەڵام سوار بوون لەدوای تەواوبوونی بەخاك سپاردنی جەنازەکە و لە کاتی گەڕانەوەدا دروستە بەبێ کەراهەت ، ئەوەش لەبەر فەرموودەکەی ( ثوبان ) کە پێشتر باس کرا ، هاوشێوەی ئەو فەرمودەیەش فەرمووده‌کەی ( جـابر ) ی کوڕی ( سمرة ) یە ﷺ کە دەفەرمووێت : " صلی رسول الله ﷺ علی ابن الدحداح ( ونحن شهود ) ، ( وفي رواية : خرج علی جنازة ابن الدحـداح ( ماشـيا ) ) ، ثم أتي بفرس عري ، فعقله رجل فركبه ( حين انصرف ) ، فجعل يتوقص به [١٨٠] ، ونحن نتبعه نسعی خلفـه ، ( وفي روايـة : حولـه ) قـال : فقـال رجـل مـن القوم : إن النبي ﷺ قـال : كم مـن عـذق معلـق أو مدلی في الجنة لابن الدحداح " [١٨١] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر ( ابن الدحـداح ) کرد و ئێمەش ئامادە بووین و لە ڕیوایەتێکدا هاتووە ( بەپیادە ) دەرچوو بۆ سەر جەنازەکەی ( ابن الدحداح ) ، دواتر ئەسپێکی بێ زینیان بۆ هێنا ، پیاوێك بەستیەوە و سواری بوو ( لەکاتی گەڕانەوە ) و بەئەسپەکە ڕێی دەکرد و هەنگاوەکانی نزیك بوون لەیەکتر ، و ئێمەش لە دوایەوە بەخێرایی ڕێمان دەکرد ( لە ڕیوایەتێکدا هاتووە : لە چوار دەوری ) ڕاوی دەڵێت : پیاوێك لە ناو خەڵکەکە وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : چەندەها خورمای هەڵواسراو یان نزیك کراوە هەن لە بەهەشتدا بۆ ( ابن دحداح ) .

٥٥ . بەڵام هەڵگرتنی جەنازە بە عەرەبانە یان ئۆتۆمبیلی تایبەت کراو بە جەنازە ، و ئەوانەی کە دوای جەنازەکە کەوتوون ئەوانیش بە ئۆتۆمبیل بەدوایدا ڕێ بکەن ، ئەم شێوەیە بە هیچ

---

[١٨٠] أي يثب ويقـارب الخطـو .

[١٨١] أخرجه مسلم (٢/ ٦٠-٦١) والسياق له،وأبو داود (٢/ ٦٥) والنسائي (١/ ٢٨٤) والترمذي (٢/ ١٣٨ ) وصححه ، والبيهقي ( ٤ / ٢٢ - ٢٣ ) والطيالسي ( ٧٦٠ - ٧٦١ ) وأحمد (٥/ ٩٨ -١٠٢،٩٩) من طرق عن سماك بن حرب عنه. والرواية الثانيـة للنسـائي ، والزيادة فيها للترمذي في إحدی روايتيه ،ومعناها للطيالسي . والرواية الثالثة لابي داود والترمذي ، ولمسلم والبيهقي وأحمد في روايـة لهـم . والزيادة الاولی للنسائي والاخری لابي داود .

وهي نص في أنه ﷺ ركب انصرافه من الجنازة ، وقد خفي هذا علی أبي الطيب صديق حسن خان فاستدل في " الروضة " ( ١ / ١٧٣ ) علی أن المشيع للجنازة مخير بين أن يمشي أمامها أو خلفها بهذا الحديث فقال : إن الصحابة كانوا يمشون حول جنازة ابن الدحداح ! وهذا خطأ من وجهين : الاول : أنه ليس في الحديث ما ذكره ، بل هو صريح في أنهم كانوا يمشون حول النبي ﷺ ، ولا تلازم بين الامرين كما هو ظاهر . الثاني : أن ذلك كاف عند الانصراف من الجنازة كما سبق ، ولعل سبب الوهم رواية عمربن موسی بن الوجيه عن سماك به بلفظ : " رأيـت رسول الله ﷺ مع جنازة ثابت بن الدحداح علی فرس أغر محجل تحته ، ليس عليه سرج ، مع الناس وهم حوله قال : فنزل رسـول الله ﷺ فصلی عليه ثم جلس حتی فرغ منه ، ثم قام فقعد علی فرسه ثم انطلق يسير حوله الرجال " أخرجه أحمد ( ٥ / ٩٩ ) ، فهذا صريح في الركوب أثناء تشييعها أيضا ،ولكنه بهذا السياق باطل لان عمر ابن موسی هذا كان يضع الحديث فلا يحتج به عند الموافقة فكيف عند المخالفة !

جۆرێك دروست نیە ، ئەویش لەبەر چەند شتێك :

**یەكەم :** ئەمە لەعادەت و خوڕەوشتی بێ باوەڕانە ، و لە شەرعیشدا هاتووە كە دروست نیە لاساییان بكرێتەوە تێیدا ، و لەم بارەیەوە فەرموودەیەكی زۆر زۆرمان هەیە و هەموویم باس كردووە و ( تخرج ) كردوون لە كتێبەكەم كە ناوی ( حجاب المرأة المسلمة فی الكتاب والسنة ) هەیە هەندێكیان بەفەرمان ( أمر ) و هاندان هاتوون بۆ پێچەوانەوە بوونیان لە پەرستشەكانیان و جل و بەرگەكانیان و داب و نەریتەكانیان ، وە هەندێكی تریان بەكردەوەی خۆی ﷺ كە پێچەوانەیان بووەتەوە ، جا هەر كەسێك بیەوێت بیخوێنێتەوە با بگەڕێتەوە بۆ كتێبی ناوبراو [١٨٢] .

**دووەم :** ئەمە داهێنراوێكە لە پەرستشدا ، لەگەڵ ئەوەشدا دژیەك و پێچەوانەی سوننەتی كرداری پێغەمبەرە ﷺ لەهەڵگرتنی جەنازە ، وەهەر داهێنراوێكیش وەهابێت ، ئەوا گومڕاییە بە كۆڕای زانایان .

**سێیەم :** ئەو مەبەستە لەدەست دەدات كە لە هەڵگرتن و شوێن كەوتن و بەڕێكردنی جەنازەدا هەیە ، كە بیرخستنەوەی قیامەتە ، هەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەكەی پێشتر لە سەرەتایی ئەم بەشەدا ساغی دەكاتەوە بەدەقی : " ... واتبعوا الجنائز تذكركم الاخرة " ، واتە : ... وە شوێنی جەنازە بكەون قیامەتتان بیر دەخاتەوە .

**دەڵێم :** بەڕاستی هەڵگرتن وشوێن كەوتنی جەنازە بەو شێوەیە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو مەبەستە پیرۆزە بە یەكجاری یان بەشێكی زۆری لەدەست خەڵكی ببات ، هەروەكو ئاشكرایە و شاراوە نیە لەلای هەموو خاون دید و چاوڕوونییەك كە هەڵگرتنی جەنازە لەسەر شان ، و بینینی شوێن كەوتوان و هەڵگرانی جەنازەكە لەسەر شانیان ، كاریگەرترە لە بەجێهێنانی بیركردنەوە و پەند وەرگرتن لە هەڵگرتنی جەنازە بەو شێوەیەی كە پێشتر باس كرا ، وە هیچ زیادە ڕەوی كار نیم ئەگەر بڵێم : ئەوەی كەوای لە ئەوروپییەكان كردووە بەعەرەبانە و ئۆتۆمبیل جەنازە هەڵگرن ترسانیانە لە مردن و ئەوەی كە مردن بیردەخاتەوە ، ئەوەش بە هۆی زاڵبوونی دونیا ( المادیة ) بەسەریاندا و باوەڕ نەبوونیان بە دوا ڕۆژ !

**چوارەم :** وە ئەو شێوە بەڕێكردنە هۆیەكی بەهێزە بۆ كەم بونەوەی ئەوانەی كە دەیانەوێت شوێنی جەنازەكە بكەون و ئەو پاداشتەیان دەست بكەوێت كە لە پێشتردا باسكرا لە بابەتی ( ٤٥ ) و لەم بەشەدا ، چونكە هەموو كەسێك ناتوانێت ئۆتۆمبیلێك بەكرێ بگرێت بۆ ئەوەی شوێنی جەنازەكە بكەوێت .

---

[١٨٢] وقد قام بطبعه " المكتب الاسلامي " ثانية ، وفيها إضافات لم ترد في الطبعة السابقة .

**پێنجەم :** بەڕاستی ئەم شێوەیە بەهیچ جۆرێك نە لە دوور و نەش لە نزیکەوە ناگونجێت لە گەڵ شەریعەتی پاك و بێگەرد و ئاسانی ئیسلامدا ، کە ناسراوە بەوەی کە دوورە لە شتی ڕواڵەتی و ڕەسمیەت ، چ جا لەم ئیشە ترسناکەدا : کە مردنە !! وە بە ڕاستی دەڵێم : ئەگەر لەم داهێنراوە هیچ شتێکی لەسەر نەبوایە جگە لەم سەرپێچیە ، ئەوا بەس بوو بۆ ڕەت کردنەوەی ، چ جای ئەوەی کە ئەو هەموو سەر پێچی و خراپانەی بخرێتە سەر ، کە باس کران و ئەوانەش کە لەیادم نین !

٥٦ . هەستان بۆ جەنازەش حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە ، و ئەویش دوو جۆرە :

ا . هەستانی کەسێکی دانیشتوو بۆی ئەگەر جەنازەکەی بەلادا تێپەڕ بوو .

ب . وە هەستان و وەستانی شوێن کەوتوانی جەنازەکە تا ئەو کاتەی دەگەنە لای گۆڕەکە ، تاکو دادەنرێتە سەر زەوی ، و بەڵگەش لە سەر ئەمە فەرموودەکەی ( علـــي ) ە ﷺ ، و چەند گۆیەکی ( لفظ ) یکی هەیە :

**یەکەم :** " قام رسول الله ﷺ للجنازة فقمنا،ثم جلس فجلسنا " [183] .

واتە : پێغەمبەر ی خوا ﷺ لە سەرەتادا هەستا بۆ جەنازە ئێمەش هەستاین ، و دوای ئەوە دادەنیشت لە کاتی تێپەڕبوونی جەنازە و ئێمەش دادەنیشتین .

**دووەم :** " كان يقوم في الجنائز ، ثم جلس بعد " [184] .

واتە : پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا بۆ جەنازە ، بەڵام دواتر دادەنیشت .

**سێیەم :** لەڕێگەی ( واقد ) ی کوڕی ( عمر ) ی کوڕی ( سعد ) ی کوری ( معاذ ) کە دەفەرمووێت : " شهدت جنازة في بني سلمة ، فقمت ، فقال لي نافع بن جبير : اجلس فإني سأخبرك في هذا بثبت ثنى مسعود بن الحكم الزرقي أنه سمع علي بن أبي طالب ﷺ برحبة الكوفة وهو يقول : " كان رسول الله ﷺ أمرنا بالقيام في الجنازة ، ثم جلس بعد ذلك ، وأمرنا بالجلوس " [185] ، واتـە : ئـامـادەی جەنازەیەك بووم لـە هۆزی ( بني سلمة ) و هەستـام ، لـەو کاتەدا ( نافع ) ی کوڕی ( جبير ) پێی وتم : دانیشە دوایی هەواڵێکی ڕاستت لەو بارەیەوە بۆ دەگێڕمەوە لە ( مسعود ) ی کوڕی ( الحكم الزرقـي ) ەوە کە پێی وتم : کە ئەو گوێی لە ( علي ) کوڕی ( أبو طالب ) بووە ﷺ لە کوفەدا دەیفەرموو : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتادا فەرمانی پێ کردین کە هەستین بۆ جەنازە ، و دواتر خۆی دانیشت ، و فەرمانی پێ کردین کە دانیشین ( واتە : لە کاتی بینینی جەنازەدا هەڵنەستین ) .

---

[183] اخرجه مسلم (٣/ ٥٩) وابن ماجه (١/ ٤٦٨) والطحاوي (١/٣٨٣) والطيالسي ( ١٥٠ ) وأحمد رقم ( ٦٣١ ، ١٠٩٤ ، ١١٦٧ ) .

[184] رواه مالك ( ١ / ٣٣٢ ) وعنه الشافعي في " الام " ( ١ / ٢٤٧ ) وأبو داود ( ٢ / ٦٤ ) .

[185] اخرجه الشافعي وأحمد (٦٢٧) والطحاوي (١/٢٨٢) وابن حبان في " صحيحه " هذا الوجه بلفظ آخر وهو .

چوارەم : " قام رسول الله ﷺ مع الجنائز حتى توضع ، وقام الناس معه ، ثم قعد بعد ذلك ، وأمرهم بالقعود " ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ جەنازەدا دەوەستا تاکو دەخرایە سەر زەوی ، دوای ئەوە دادەنیشت ، و فەرمانی بە دانیشتن پێ کردین .

پێنجەم : لە رێگەی ( إسماعيل ) ی کوڕی ( مسعود ) ی [١٨٦] کوڕی ( الحكم الزرقي ) و ئەویش لە باوکیەوە وتی : " شهدت جنازة بالعراق ، فرأيت رجالا قياما ينتظرون أن توضع ، ورأيت علي ابن أبي طالب ﷺ يشير إليهم أن اجلسوا ، فإن النبي ﷺ قد أمرنا بالجلوس بعد القيام " [١٨٧] .

واتە : ئامادەی جەنازەیەك بووم لە عێراق ، و چەند پیاوێکم بینی بەپێوە وەستابوون چاوەڕوان بوون جەنازەکە دابنرێت و ( علي ) ی کوڕی ( أبو طالب ) م بینی ﷺ ئاماژەی بۆ کردن کە دانیشن ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە دانیشتن ، و دوای ئەوەی کە فەرمانی پێکردبووین کە هەستان .

٥٧ . وە سوننەتیشە بۆ ئەو کەسەی کە جەنازەکە هەڵدەکرێت دەست نوێژ بگرێتەوە ، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : " من غسل ميتا فليغتسل ، ومن حمله فليتوضأ " [١٨٨] ، واتە : هەر کەسێك مردوویەکی شۆرد باخۆی بشوا و هەر کەسێکیش هەڵی گرت با دەستنوێژ بگرێتەوە .

## ( ١٣ ) نوێژکردن لە سەر تەرمی مردوو ( الصلاة على الجنازة ) :

٥٧ ـ حوکمی نوێژکردن لە سەر مردووی موسڵمان فەرزی کیفایەیە ، لە بەر فرمان پێکردنی پێغەمبەر ﷺ بەو کارە ، لە چەند فەرموودەیەك ، کە لێرەدا فەرموودەی ( زيد ) ی کوڕی ( خالد الجهني ) کە دەگێڕێتەوە : " أن رجلا من أصحاب النبي ﷺ توفي يوم خيبر ، فذكروا ذلك لرسول الله ﷺ فقال : " صلوا على صاحبكم " ، فتغيرت وجوه الناس لذلك ، فقال : " إن صاحبكم غل في سبيل الله " ،

---

[١٨٦] وقع في الاصل " اسماعيل بن الحكم بن مسعود " والصواب ما أثبت ، وكأنه انقلب على الطابع ، أو بعض النساخ .

[١٨٧] اخرجه الطحاوي ( ١ / ٢٨٢ ) بسند حسن .

قلت : هذا اللفظ والذي قبله صريحان في أن القيام لها حتى توضع داخل في النهي ، وأنه منسوخ ، فقول صديق حسن خان في " الروضة " ( ١ / ١٧٦ ) بعد أن قرر منسوخية القيام لها إذا مرت : " وأما قيام الناس خلفها حتى توضع على حتى توضع على الارض فمحكم لم ينسخ " . فهذا خطأ بين ، لمخالفته لما ذكرنا من اللفظين ، والظاهر أنه لم يقف عليهما .

[١٨٨] وهو حديث صحيح ،كما تقدم بيانه في المسألة ( ٣١ ) .

ففتشنا متاعه فوجدنا خرزا من خرز اليهود لا يساوي درهمين ! " [١٨٩] .

واتە : یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا كۆچی دوایی كرد ، خەبەری مردنەكەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش فەرمووی : نوێژ بكەن لە سەر هاوڕێكەتان ، ڕوومەتی خەڵكەكە گۆڕا لە بیستنی ئەو وتەیە ! پاشان فەمووی : ئەم هاوڕێیەتان لە كاتی جیهادكردن و تێكۆشانی شتێكی لە دەسكەوتی شەر بردووە پێش ئەوەی بەش بكرێت ، دەڵێت : ئێمەش لە ناو شت و مەكەكەیدا گەڕاین بینیمان دوو مووروی ( خـــرز ) ی تێدایە لە مووروی جوولەكەكان پێش دابەشكردنی بردوونیەتی ، بەهای دوو درهەمی نەدەهینا .

٥٨ - ئەوانەش ئەم حوكمە نایانگرێتەوە ، دوو كەسن ، كە واجب نیە لە سەر یان نوێژ بكرێت :

یەكەم : ئەو منداڵە كە نەگەشتۆتە تەمەنی باڵغ بوون ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ كە ( إبراهيم ) ی كوڕی وەفاتی كرد نوێژ لە سەر نەكردوو ، هەروەكو ( عائـــشة ) - ڕەزای خوای لێ بێت . بۆمان دەگێرێتەوە ، و دەفەموویێت : " مات إبراهيم بن النبي ﷺ وهو ابن ثمانية عشر شهرا ،فلم يصل عليه رسول الله ﷺ " [١٩٠] .

واتە : ( إبراهيم ) ی كوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد لە تەمەنی هەژدە مانگیدا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ لە سەر نەكردوو .

دووەم : شەهید ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر شەهیدانی ئوحد و جگە لەوانیش نەكردووە ، لەو بارەیەوە سێ فـــەرموودە هـــاتووە ، لـــە پێشتر و لـــە بابەتی ( ٣٢ ) دا ، لە پەڕەی ( ..... ) دا باسكراوون .

بەلام لە گەڵ ئەوەشدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە نابێت نوێژیان لە سەر بكرێت ، بەڵكو

---

[١٨٩] أخرجه مالك في " الموطأ " (١٤/٢) وأبو داود (٤٢٥/١) والنسائي ( ١/ ٢٧٨) وابـــن ماجـــه (١٩٧/٢) وأحمـــد ( ١١٤/٤-١٩٢/٥) بإسناد صحيح ، وقال الحاكم : " صحيح على شرطهما " ، وفيه نظر بينته في " التعليقات الجياد على زاد المعاد " .

وفي الباب عن أبي قتادة ويأتي حديثه في المسألة الاية ( ص٨٢ ) وعن أبي هريرة فيها ، ( ص٨٤ ) .

[١٩٠] .اخرجه أبو داود (١٦٦/٢) ومن طريقه حزم ( ٥ / ١٥٨ ) وأحمد ( ٦ / ٢٦٧ ) وإسناده حسن ، كما قال الحافظ في " الاصابة " ، وقال ابن حزم : " هذا خبر صحيح "

قلت : والصواب ما قاله الحافظ ، فقد ذكر ابن القيم في " زاد المعاد " ( ١ / ٢٠٣ ) عن الامام أحمد أنه قال : " هذا حـــديث منكـــر " ، ولعله يعني " حديث فرد " فإن هذا منقول عنه في بعض الاحاديث المعروفة الصحة . واعلم أنه لا يخدج في ثبوت الحديث أنه روي عنه صلى الله عليه وسلم أنه صلى على ابنه ابراهيم . لان ذلك لم يصح عنه وإن جاء من طرق ، فهي كلها معلولة اما بالارسال ، وإما بالضعف الـــشديد ، كما تراه مفصلا في " نصب الراية " ( ٢ / ٢٧٩ - ٢٨٠ ) ، وقد روى أحمد ( ٣ / ٢٨١ ) عن أنس أنه سئل : صلى رسول الله ﷺ علـــى ابنه ابراهيم ؟ قال : لا أدري . وسنده صحيح . ولو كان صلى عليه ، لم يخف ذلك على أنس إن شاء الله ، وقد خدمه عشر سنين .

دەتوانرێت بووترێت سوننەتە نەك واجب ، هەروەكو لە بابەتی داهاتوودا چەند فەرموودەیەك لە سەر ئەم باسە دەهێنینەوە .

٥٩ ـ وە دەتوانرێت ، و شەرعییە نوێژ لە سەر ئەمانەی خوارەوە بكرێت كە باسیان دەكەین :

**یەكەم :** منداڵ ، یا منداڵی لە بارچووش بێت ( السقط : **لەبارچـوو** : ئەو منداڵەیە كە لە باری دایكی دەچێت پێش تەواو بوونی ) ، لەو بارەشەوە دوو فەرموودەمان پێ گەیشتووە :

**فەرموودەی یەكەم :** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " ... والطفل ( وفي رواية : السقط ) يصلى عليه ، ويدعى لوالديه بالمغفرة والرحمة " (١٩١) .

واتە : منداڵ ( لە ڕیوایەتێكی تردا : لە بارچوو ) نوێژی لە سەر دەكرێت ، و دوعای خێریش بۆ باوك و دایكی دەكرێت ، بە لێخۆش بوون ، و ڕەحم لێكردنیان .

**فەرموودەی دووەم :** لە ( عائـشة ) ەوە . ڕەزای خوای لێ بێت . دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أتي رسول الله ﷺ بصبي من صبيان الانصار ، فصلى عليه " ، قالت عائشة : فقلت : طوبى لهذا ، عـصفور مـن عصافير الجنة ، لم يعمل سوءاً ، ولم يدركه . قال ﷺ : " أو غير ذلك يا عائشة ! خلق الله عزوجل الجنة ، وخلق لها أهلا ، وخلقهم ، في أصلاب آبائهم ، وخلق النار وخلق لها أهلا ، وخلقهم في أصلاب آبائهم " (١٩٢) .

واتـە : تـەرمی منداڵێكیان لـە منداڵانی پشتیوانان هێنا بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش نوێژی لە سەر كرد ، دایكە ( عائشة ) . ڕەزای خوای لێ بێت . دەفەرمووێت : وتم : خۆش بەختی بۆ ئەم منداڵە ، باڵندەیەكە لە باڵندەكانی بەهەشت ، هیچ تاوانی نەكردووە ، نەشگەشتە ئەو تەمەنەی كە تاوانی لە سەر بنووسرێت ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی : ناتوانی شتێكی تر بڵێیت جگە لەوە خوای پەروەردگار بەهەشتی درووست كردووە و ئەهلی بەهەشتیشی درووست كردووە ، هەر لە پشتی باوكیان بوون خوای پەروەردگار دەیزانی كامانەن ، وە دۆزەخیشی دروست كردووە ، وئەهلی دۆزەخیشی دروست كردووە ، وهەر لە پشتی باوكیاندا بوون خوای پەروەردگار دەیزانی كامانەن .

ئاشكراشە منداڵی لە بارچوو لە كاتێكدا نوێژی لە سەر دەكرێت كە ڕووحی تێ كرا بێت ،

---

(١٩١) رواه أبو داود والنسائي وغيرهما بسند صحيح،وقد سبق بتمامه في المسألة (٥٠)

(١٩٢) اخرجه مسلم (٨/٥٥) والنسائي (١/٢٧٦) وأحمد (٦/٢٠٨) واللفظا للنسائي، وإسناده صحيح،رجاله كلهم ثقات رجال مسلم، غير شيخه عمرو بن منصور ، وهو ثقة ثبت .

قال النووي رحمه الله تعالى : " أجمع من يعتقد بن من علماء المسلمين على أن من ما من أطفال المسلمين فهو من أهل الجنة ، والجواب عن هذا لاحديث أنه لعله نهاها عن المسارعة إل يالقطع من غير دليل ، أو قال ذلك قبل أن يعلم أن أطفال المسلمين في الجنة " .

وأجاب السندي في حاشيته على النسائي بجواب آخر خلاصته : أنه إنما أنكر عليها الجزم بالجنة لطفل معين . قال : ولا يـصبح الجـزم في مخصوص لان إيمان الأبوين تحقيقا غيب ، وهو المناط عند الله تعالى .

ئەوەش دوای تەواوكردنی چوار مانگەیەتی ، پاشان مردبێت ، بەڵام ئەگەر پێش ئەوە لە بار بچێت ، ئاشكرایە كە لەو كاتەدا بە مردوو ناژمێردرێت ، و نوێژی لە سەر ناكرێت ، بەڵگەی ئەوەش فەرموودەی ( عبدالله ) ی كوڕی ( مسعود ) ە كـە فەرموودەیەكی ( مرفوع ) ە ، و تێدا دەفەمووێت : " أن خلق أحدكم يجمع في بطن أمه أربعين يوما ، ثم يكون علقة مثل ذلك ، ثم يكون مضغة مثل ذلـك ، ثم يبعث إليه ملكا ... ينفخ فيه الروح " (١٩٣) .

واتە : خوای پەروەردگار كە دروستی كردوون لە سكی دایكانتان بەو بار ودۆخانەدا تێتان دەپەڕێنێت ، پاشان فریشتەیەكتان بۆ لا دەنێرێت ... و ڕوحتان دەكاتە بەر .

وە هەندێكیان بەمەرجیان داناوە كە لەبار چووەكە بەزیندووی لە دایك ببێ پاشان بمرێت ، لە بەر ئەم فەرموودەیە : " إذا استهل السقط صلي عليه وورث " .

بەڵام فەرموودەكە ( ضـعيف ) ە ، نابێت بكرێت بـە بەڵگە ، هەروەكو زانـایان ئـەوەیان ڕوون كردووەتەوە (١٩٤) .

دووەم : شەهید ، لەوبارەشە فەرموودەیەكی زۆرمان پێ گەیشتووە ، كە لێرەدا هەندێكیان دەهێنینەوە :

**فەرموودەی یەكەم :** لە ( شداد ) ی كوڕی ( الهاد ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن رجـلا مـن الأعراب جاء إلى النبي ﷺ آمن به واتبعه ، ثم قال : أهاجر معك ... فلبثوا قليلا ، ثم نهضوا في قتال العدو ، فأتي به النبي ﷺ " ... ثم كفنه النبي ﷺ في جبته ، ثم قدمه فصلى عليه ... " (١٩٥) ، واتە : پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە جوببەیەكدا كفنی كرد ، و پێشی خست و نوێژی لە سەر كرد .

**فەرموودەی دووەم :** لە ( عبدالله ) ی كوڕی ( الزبير ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن رسـول الله ﷺ أمر يوم أحد بحمزة فسجي ببردة ، ثم صلى عليه فكبر تسع تكبيرات ، ثم أتي بالقتلى يـصفون ، ويـصلي عليهم . وعليه معهم " (١٩٦) .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ( أحد ) فەرمانی كرد بە عابایەك دابپۆشرێت ، پاشان نۆ

---

(١٩٣) متفق عليه .

(١٩٤) انظر " نصب الراية " ( ٢ / ٢٧٧ ) و " التلخيص " ( ٥ / ١٤٦ – ١٤٧ ) و " المجموع " ( ٥ / ٢٥٥ ) ، وكتابي " نقد التـاج الجامع للاصول الخمسة " (رقم ٢٩٣) ، وإنما صح الحديث بدون ذكر الصلاة فيه ، كما حققته في " إرواء الغليل " (١٧٠٤) يسر الله طبعه .

(١٩٥) أخرجه النسائي وغيره بسند صحيح ، وقد مضى بتمامه المسألة (٣٩) (ص ٦١) .

(١٩٦) أخرجه الطحاوي في " معاني الآثار " ( ١/ ٢٩٠) وإسناده حسن . رجاله كلهم ثقات معروفون ، وابن اسحاق قد صرح بالتحديث . وله شواهد كثيرة ذكرت بعضها في " التعليقات الجياد " في المسألة( ٧٥ ) .

تەكبیرە ( الله أكبر ) ی كرد لە سەری لە نوێژەكەیدا ، پاشان شەهیدانی تریان هێنا و ڕیزیان كردن لە بەر دەستی پێغەمبەر ﷺ و نوێژی لەسەر كردن ، و ئەویشیانی لە گەڵدا بوو .

**فەرموودەی سێیەم :** لە ( أنس ) ی كوڕی ( مالك ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن النبي ﷺ مر بحمزة وقد مثل به ــ وأيضا ــ على أحد من الشهداء غيره . يعني شهداء أحد " (١٩٧) .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای حەمزەدا تێپەڕ بوو بینی هەتك كراوە . واتە گوێ و لووت و لێوەكانی بڕا بوون . هەروەها دای بەلای هەندێكی تر. جگە لەودا . لە شەهیدانی جەنگی ( أحـد ) هەر بەو شێوەیەی ئەو هەتك كرابوون .

**فەرمووودەی چوارەم :** لە ( عقبة ) ی كوڕی ( عامر الجهني ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن الـنبي ﷺ خرج يوما فصلى على أهل أحد صلاته على الميت [ بعد ثمان سنين ] [ كالمودع للأحياء والأموات ] ، ثم انصرف إلى المنبر [ فحمد الله وأثنى ] عليه ! فقال : إني فرط لكم ، وأنا شهيد عليكم ، [ وإن موعدكم الحوض ] وإني والله لأنظر إلى حوضي الآن ، [ وإن عرضه كما بين أيلة إلى الجحفة ] ، وإني أعطيت مفاتيح خزائن الأرض ، أو مفاتيح الأرض وإني والله ما أخاف عليكم أن تشركوا بعدي ولكن أخاف عليكم [ الدنيا ] أن تتنافسوا فيها [ وتقتتلوا فتهلكوا هلك من كان قبلكم ] قال : فكانت آخر نظرة نظرها إلى رسول الله ﷺ ] " (١٩٨) .

واتە : ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتە دەرەوە و لە سەر شەهیدانی ( أحد ) و جارێكی تر نوێژی كرد دوای تێپەڕ بوونی هەشت ساڵ . وەكو ماڵئاوی كردنێك لە زیندوان و مردوان .

---

(١٩٧) أخرجه أبو داود بسند حسن ، وهو مختصر حديثه المتقدم المسألة (٣٧) . (ص٥٧- ٥٨) .

لعله يعني الصلاة على غيره استقلالا ، فلا ينبغي الصلاة على غيره مقرونا معه كما في الحديث الذي قبله ، ولا يعارض هـذان الحـديثان بحديث جابر المتقدم أنه صلى الله عليه وسلم لم يصل على شهداء أحد لأنه ناف ، والمثبت مقدم على النافي ، وانظر التفصيل في " نيل الأوطار "

(١٩٨) أخرجه البخاري ( ٣ / ٦٤ - ٧ / ٢٧٩ - ٢٨٠ و ٣٠٢ ) ومسلم ( ٧ / ٦٧ ) وأحمد ( ٤ ١٤٩ ، ١٥٣ ، ١٥٤ ) ، والسياق للبخاري ، والزيادة الأولى والثانية والسادسة والسابعة له ، ولمسلم الثانية والخامسة وما وراءها ولأحمد الأولى إلى الرابعة . رواه البيهقي ( ٤ / ١٤ ) وعنده الزيادات كلها إلا الثالثة والخامسة . وأخرجه الطحاوي ( ١ / ٢٩٠ ) وكذا النسائي ( ١ / ٢٧٧ ) والـدارقطني ( ص ١٩٧ ) مختصرا ، وعند الدارقطني الزيادة الأولى .

قد يقول قائل : لقد ثبت في هذه الأحاديث مشروعية الصلاة على الشهداء ، والأصل أنها واجبة فلماذا لا يقال بالوجوب ! قلت : لما سبق ذكره في المسألة ( ٥٨ ) . ونزيد على ذلك هنا فنقول : لقد استشهد كثير من الصحابة في غزوة بدر وغيرها ، ولم ينقل أن النبي ﷺ ، صـلى عليهم ولو فعل لنقلوه عنه . فدل ذلك أن الصلاة عليهم غير واجبة . ولذلك قال ابن القيم في " تهذيب السنن " ( ٤ / ٢٩٥ ) : ( والصواب في المسألة أنه مخير بين الصلاة عليهم وتركها لمجيء . الآثار بكل واحد من الأمرين وهذا إحدى الروايات عن الامام أحمد ، وهي الأليق بأصـوله ومذهبه " قلت : ولاشك أن الصلاة عليهم أفضل من الترك إذا تيسرت لأنها دعاء وعبادة .

پاشان دەڕواتە سەر مینبەر و شوکر و ستایشی خوای پەروەردگار دەکات ! دەفەرمووێت : من پێشتان دەکەوم ، و گەواهیشتان لە سەر دەدەم ، شوێنی پەیمانمان سەر حەوزی کەوسەر دەبێت ، سوێند بێت بە خوای پەروەردگار من ئێستا تەماشای حەوزکەم دەکەم ، پانی ئەو حەوزە وەکو دووری نێوان ( أيلة ) ، و ( الجحفة ) هیە ، وە ئەوەش بزانن کە من کلیلی هەموو خەزێنەکانی زەویم پێ بەخشراوە ، یان کلیلی زەویم پێ بەخشراوە ، وە سوێند بێت بە خوای پەروەردگار من لەوە ناترسم کە دوای خۆم تووشی هاوەڵبڕیاردان بن ، بەڵکو لەوە دەترسم کە دونیا کارتان لێبکات ، بکەونە پێشبڕکێ کردنی یەکتر تیایدا ، و بەو هۆیەوە بکەونە یەکتر کوشتن و تووشی لەناوچوون بن وەکو لەناوچوونی ئوممەتانی پێش خۆتان ، دەڵێت : ئەوە دوا تێڕوانینی من بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .

**سێیەم :** هەر کەسێك بە هۆی ئەنجامدانی سنوورێك لە سنورە شەرعیەکان گیان لە دەست بدات ، لە بەر فەرموودەی ( عمران ) ی کوڕی ( حصين ) رضي الله عنه کە بۆمان دەگێڕێتەوە : " أن امرأة من جهينة أتت نبي الله ﷺ وهي حبلى من الزنى ، فقالت : يا نبي الله أصبت حدا فأقمه علي ، فدعا نبي الله ﷺ وليها ، فقال : أحسن إليها ، فإذا وضعت فأتني بها ، ففعل ، فأمر بها نبي الله ﷺ فشكت عليها ثيابها ، ثم أمر بها فرجمت ، ثم صلى عليها ، فقال له عمر : تصلي عليها يا نبي الله وقد زنت ؟ فقال : لقد تابت توبة لو قسمت بين سبعين من أهل المدينة لوسعتهم ، وهل وجدت توبة أفضل من أن جاءت بنفسها لله تعالى ؟ " [(١٩٩)] .

واتە : ئافرەتێك لە عەشیرەتی ( جهينة ) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سك پڕ بوو لە تاوانی زیناکردن ، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوانێکم کردووە شایستەی ئەوەم کە حەدی خوای پەروەردگارم لە سەر ئەنجام بدەی ، پێغەمبەری خواش ﷺ سەرپەرشتیار و وەلی ئەو ئافرەتەی بانگ کرد و پێی فەرموو : چاکەکاربە لە گەڵیدا ، تاکو منداڵی دەبێت ، بیهێنەوە بۆ لام ، ئەویش ئەوەی ئەنجامدا ، و دواتر هێنای بۆ لای ، و پێغەمبەری خواش ﷺ جلەکەی پێوە توند کرد ، فرمانی کرد بەرد باران بکرێت ، پاشان هێنای و نوێژی لە سەر کرد ، ( عمر ) لەو کاتەدا فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر دەکەیت لە کاتێکدا کە دەزانی زیناشی کردووە ؟! ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : ئەو ئافرەتە تۆبەیەکی کردووە ئەگەر بێتوو دابەش بکرێت بە سەر حەفتا کەسی خەڵکی مەدینەدا ئەوا هەموویانی دەگرتەوە ، ئەی ( عمر ) تۆ تۆبەیەکت لەو تۆبەیە باشتر بینیوە کە خۆی بەپێی خۆی ، و لەبەر خوای پەروەردگار هات .

**چوارەم :** کەسانی تاوانبار و فاجر کە بەردەوام لە تاواندا بوونە ، وەك ئەوانەی کە وازیان لە

---

(١٩٩) أخرجه مسلم (١٢١/٥) وأبو داود (٢٣٣/٢) والنسائي (٢٧٨/١) والترمذي (٣٢٥/٢) وصححه، والدارمي (١٨٠/٢) والبيهقي (١٨/٤و١٩) . ورواه ابن ماجه (١١٦/٢و١١٧) مختصرا .

نوێژ هێناوە ، یان زەکاتیان نەداوە ، بەڵام دانیان بە واجبێتیاندا ناوە ، وە ئەوانەش کە داوێن پیسن و کرداری زینا ئەنجام دەدەن ، و بەردەوام مەی دەخۆنەوە ، یان هاوشێوەی ئەم تاوانانە ، ئا ئەم جۆرە کەسانە نوێژیان لە سەر دەکرێت ، بەڵام پێویستە لە سەر زانایان ، و خاوەن زانست و ئایینەکان واز بێنن لە نوێژکردن لە سەریان ، بۆ ئەوەی ببن بە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی هاوشێوەی خۆیان ، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی ئەنجام داوە ، لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەکمان پێ گەیشتووە ، لەوانەش :

**فەرموودەی یەکەم :** لە ( قتادة ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە : " كان رسول الله ﷺ إذا دعي لجنازة سأل عنها ، فان أثني عليها خيرا قام فصلى عليها ، وإن أثني عليها غير ذلك ، قال لأهلها : شأنكم بها ، ولم يصل عليها " [٢٠٠] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بانگ بکرایە بۆ نوێژکردن لە سەر جەنازەیەك ، پرسیاری سەبارەت بە جەنازەکە دەکرد ، جا ئەگەر بە باشە باسی بکرایە نوێژی لە سەر دەکرد ، و ئەگەر بە غەیری ئەوە . واتە : بە خراپە . باس بکرایە ، بە کەس و کاری دەفەرموو : بیبەن بزان خۆتان چی لێ دەکەن ئیشی خۆتانە ، و نوێژی لە سەر نەدەکرد .

**فەرموودەی دووەم :** لە ( جابر ) ی کوڕی ( سمرة ) ەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە : " مرض رجل ، فصيح عليه ، فجاء جاره إلى رسول الله ﷺ فقال : إنه قد مات ، قال : وما يدريك ؟ قال : أنا رأيته ، قال رسول الله : إنه لم يمت ، قال : فرجع فصيح عليه ، فقالت امرأته ، انطلق إلى رسول الله ﷺ " فأخبره فقال الرجل : اللهم العنه ! قال : ثم انطلق الرجل فرآه قد نحر نفسه بمشقص ، فانطلق النبي ﷺ فأخبره أنه مات ، فقال ما يدريك ؟ قال : رأيته ينحر نفسه بمشقص معه ! قال : أنت رأيته ؟ قال : نعم ، قال : إذا لا أصلي عليه " [٢٠١] .

واتە : پیاوێك نەخۆش کەوت و ناڕەحەت بوو ، کەس و کاری هات و هاواریان لە سەر کرد ، پیاوێکی دراوسێی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی : ئەو پیاوە مرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە چیەوە دەزانی مردووە ؟ وتی : خۆم بینیم ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

---

[٢٠٠] اخرجه أحمد (٥/٣٠٠،٣٩٩، ٣٠١) والحاكم (١/ ٣٦) وقال: " صحيح على شرط الشيخين "،ووافقه الذهبي. وهو كما قالا .

[٢٠١] اخرجه بهذا التمام أبو داود ( ٢ / ٦٥ ) باسناد صحيح على شرط مسلم . وأخرجه . مسلم (٣/٦٦) مختصرا ، وكذا النسائي (١/٢٧٩) والترمذي (٢/١٦١) وابن ماجه ( ١/٤٦٥) والحاكم (١/٣٦٤) والبيهقي (٤/١٩) والطيالسي(٧٧٩) وأحمد ( ٥/٨٧و ٩١و ٩٢و ٩٤،٩٦ – ٩٧و١٠٢و١٠٧) وقال الترمذي :" هذا حديث حسن ، وقد اختلف أهل العلم في هذا زرارة فقال بعضهم : يصلي على كل من صلى للقبلة ، وعلى قاتل النفس وهو قول سفيان الثوري وإسحاق " وقال أحمد : لا يصلي الامام على قاتل النفس ، ويصلي عليه غير الامام " وقال شيخ الاسلام ابن تيمية في " الاختيارات " ( ص ٥٢) :" ومن امتنع من الصلاة على أحدهم ( يعني القاتل والناس والمدين الذي ليس له وفاء ) زجرا لأمثاله عن مثل فعله كان حسنا ، ولو امتنع في الظاهر ، ودعا له في الباطن ،ليجمع بين المصلحتين كان أولى من تفويت إحداهما " .

نەخێر نەمردووە ، دەڵێت : پیاوەكە گەڕایەوە ، و جارێكی تر كەس و كاری هات و هاواریان كرد لە سەری ، خێزانەكەی پـێی وت : بڕۆرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هـەواڵی پێبدە ، پیاوەكە وتی : دەك لەعنەتی خوای لە سەر بێت ! دەڵێت : پاشان كە پیاوەكە چووە سەری بینی بە سەری تیرێك یان بە تیرێك خۆی سەر بڕیوە ، پاشان چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی پـێ دا كە مردووە ، ئەویش فەرمووی : تۆ بە چیەوە دەزانی مردووە ؟ وتی : بینیم بەو سەرە تیرە یان بەو تیرەی كە پـێی بوو خۆی سەر بڕی ! فەرمووی : تۆ خۆت بینیت ؟ وتی : بەڵی ، فەرمووی : كەواتە منیش نوێژی لە سەر ناكەم .

**فەرموودەی سێیەم :** ئەو فەرموودەیەی كە ( زید ) ی كوڕی ( خالد ) ﷺ بۆمـان دەگێڕێتـەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێـژی لە سەر كەسێك نەكرد كە دزی لە دەسكەوتی جەنگ كردبوو پێش دابەش كردنی ( الغال ) ، و بە هـاوەڵانی فـەرمووی : " صلوا على صاحبكم ... إن صاحبكم غل في سبيل الله ! " (٢٠٢) ، واتـە : نوێـژ بكـەن لـە سـەر هاوڕێكـەتان ... هاوڕێكـەتان دزی كـردووە لـە دەستكەوتەكانی جەنگ پێش دابەش كردنی .

**پێنجـەم :** ئـەو قـەرزارەی كـە لـە دوای خـۆی ئەوەنـدە پـارەی بـەجێ نەهێـشتووە بتوانرێـت قـەرزەكانی پـێ ببـژێردرێت ، یـان بدرێتـەوە ، ئـەم جۆرە كەسانە نوێـژیان لە سەر دەكرێـت ، بـەڵام سـەبارەت بـە وازهێنـانی پێغەمبـەر ﷺ لـە نوێـژكردن لـە سـەری ، ئـەوە لـە سـەرەتادا بـوو ، لـەو بارەشەوە چەند فەرموودەیەكمان پێگەیشتووە :

**فەرموودەی یەكەم :** لە ( سلمة ) ەی كوڕی ( الأكوع ) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە كە فەرموویـەتی : " كنا جلوسا عند النبي ﷺ إذ أتي بجنازة فقالوا : صل عليها ، فقال : هل عليه دين ؟ قالوا : لا ، قال : فهل ترك شيئا ؟ قالوا : لا ، فصلى عليه . ثم أتي بجنازة أخرى فقالوا : يارسول الله صل عليها ، قال : هل عليه دين ؟ قيل : نعم ، قال فهل ترك شيئا ؟ قالوا : ثلاثة دنانير [ قال : فقال بأصابعه ثلاث كيات ] ، فصلى عليها . ثم أتي بالثالثة ، فقالوا : صل عليه ، قال : هل ترك شيئا ؟ قالوا : لا ، قال : هل عليه دين ؟ قالوا : ثلاثة دنانير ، قال : صـلوا على صاحبكم ، قال [ رجل من الأنصار يقال له ، أبو قتادة : صل عليه يارسول الله وعلي دينه " (٢٠٣) .

واتـە : لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا ﷺ دانیشتبووین ، لـەو كاتـەدا جەنازەیـەكیان هێنـا بۆ ئەوەی نوێـژی لـە سـەر بكـات ، و پێیـان فـەرموو : ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نوێـژی لـە سـەر بكـە ، ئـەویش پرسـی : ئایـا قـەرزی لەسـەرە ؟ وتیـان : نـەخێر ، فـەرمووی : ئایـا هیـچی لـە دوای خـۆی

---

(٢٠٢) اخرجه أصحاب السنن بسند صحيح على ما سبق بيانه عند المسألة (٥٧) .

(٢٠٣) اخرجه البخاري (٣٦٨/٣، ٣٦٩و٣٧٤) وأحمد (٤٧/٤، ٥٠) والزيادة له . وروى منه النسائي (٢٧٨/١) القصة الثالثة .

بەجێهێشتووە ؟ وتیان : نەخێر ، پاشان جەنازەیەكی تریان هێنا ، و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر بكە ، ئەویش فەرمووی : ئایا قەرزی لە سەرە ؟ وتیان : بەڵێ ، ئایا هیچی لە دوای خۆی بە جێهێشتووە ؟ وتیان : سێ دینار ، ئەویش بە پەنجەكانی وتی سێ ( كیات ) ، و نوێژی لە سەر كرد ، پاشان سێیەم كەسیان هێنا ، و پێیان فەرموو : نوێژی لە سەر بكە ، فەرمووی : ئایا هیچی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە ؟ وتیان : نەخێر ، فەرمووی : ئەی هیچ قەرزی لە سەرە ؟ وتیان : بەڵێ سێ دیناری لە سەرە ، فەرمووی : كەوابوو ئێوە نوێژ لە سەر هاوڕێكەتان بكەن ، من نوێژی لە سەر ناكەم ، پیاوێك لە پشتیوانان كە پێی دەووترا ( أبو قتادة ) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر بكە سێ دینارەكەی لە سەر من . واتە : من دەیاندەمەوە ، وەدەیانبژێرم . .

**فەرموودەی دووەم :** لە ( أبو قتادة ) ەوە ﷺ كە بەسەرهاتێك هاوشێوەی بەسەرهات سێیەمی فەرموودەكەی ( سلمة ) ەی كوڕی ( الأكوع ) ەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و تێیدا هاتووە : " أرأيت إن قضيت عنه أتصلي عليه ؟ قال : إن قضيت عنه بالوفاء صليت عليه ، قال : فذهب أبو قتادة فقضى عنه ، فقال : أوفيت ما عليه ؟ قال نعم ، فدعا رسول الله ﷺ فصلى عليه " (٢٠٤) .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەبینیت ئەگەر قەرزەكەی ببژێرم ، نوێژی لە سەر دەكەی ؟ فەرمووی : ئەگەر پەیمانی ئەوە بدەی كە قەرزەكەی ببژێریت ئەوا نوێژی لە سەر دەكەم ، دەڵێت : ( أبو قتادة ) ەش وەفای بە پەیمانەكەی كرد و قەرزەكەی بۆ بژارد ، و پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرموو : قەرزەكەت بۆ بژارد ؟ وتی : بەڵێ ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی بیهێنن بۆ ئەوەی نوێژی لە سەر بكەم ، و ئەوانیش هێنایان ، و نوێژی لە سەر كرد .

**فەرموودەی سێیەم :** لە ( جابر ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە هاوشێوەی هەمان بەسەرهاتمان بۆ دەگێڕێەوە ، و لە كۆتاییەكەیدا دەفەرموێت : " فلما فتح الله على رسوله قال : أنا أولى بكل مؤمن من نفسه ، ومن ترك دَيْنَاً فعلي قضاؤه ، ومن ترك مالا فلورثته " (٢٠٥) .

واتە : دوای ئەوەی كە خوای پەروەردگار خێر و خێراتێكی زۆری ڕشت بە سەر پێغەمبەرەكەیدا ، فەرمووی : من لە هەموو كەسێك بە پێشترم بە مردووی بڕوادار تەنانەت لە خۆشی ، جا ئەگەر هەر كەسێك مرد و قەرزاریەكی لە سەر بوو ، ئەوا لە سەر منە كە بۆی ببژێرم ،

---

(٢٠٤) أخرجه النسائي (١/٣٧٨) والترمذي (٢/١٦١) والدارمي (٢/٢٦٣) وابن ماجه (٢/٧٥) وأحمد (٥/٣١١،٣٠٤،٣٠٢،٣٠١،٢٩٧) والسياق له وإسناده صحيح على شرط مسلم ،وليس عند الآخرين ذهاب أبي قتادة ووفاءه للدين ثم صلاة النبي ﷺ .

(٢٠٥) رواه أبو داود (٢/٨٥) والنسائي (١/٢٧٨) بإسناد صحيح على شرط الشيخين وله طريق أخرى عن جابر بزيادة أخرى ، وقد تقدم .

وە ئەو كەسەش كە میراتێك بەجێ دەهێڵێ ئەوا بۆ میراتگرانێتی .

**فەرموودەی چوارەم :** لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " أن رسول الله ﷺ كان يؤتى بالرجل الميت عليه الدين ، فيسأل : هل ترك لدينه من قضاء ؟ فإن حدث أنه ترك وفاء صلى عليه ، و إلا فلا : قال : صلوا على صاحبكم ، فلما فتح الله عليه الفتوح قال : أنا أولى بالمؤمنين من أنفسهم [ في الدنيا و الآخرة ، اقرؤوا إن شئتم : ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ ( سورة الأحزاب : ٦ ) ، فمن توفي وعليه دين [ ولم يترك وفاء ] فعلي قضاؤه ، ومن ترك مالا فهو لورثته " (٢٠٦) .

واتە : پێغەمبەری خوا لە سەرەتادا كە كەسێكی مردوویان بهێنایە و قەرزار بوایە پرسیاری ئەوەی دەكرد كە ئایا هیچی لە دوای خۆی بە جێهێشتووە بۆ بژاردنی قەرزەكەی ؟ جا ئەگەر پێیان بووتایە ئەوەندەی بەجێ هێشتووە بۆ بژاردنی قەرزەكەی نوێژی لە سەر دەكردن ، وە ئەگینا نوێژی لە سەر نەدەكرد ، و دەیفەرموو : نوێژ بكەن لە سەر هاوڕێكەتان ، بەڵام دوای ئەوەی كە خوای پەروەردگار خێر و خێراتێكی زۆری ڕشت بە سەر پێغەمبەرەكەیدا ، فەرمووی : من لە هەموو كەسێك لە پێشترم بە مردووی بڕوادار تەنانەت لە خۆشی ، لە دونیا و دواڕۆژیشدا ، ئەگەر بەڵگەی ئەوەشتان دەوێت ئەو ئایەتە بخوێننەوە كە خوای پەروەردگار تێیدا فەرموویەتی : ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە خودی بڕواداران پێشتر و ئەولاترە بۆیان ، جا ئەگەر هەر كەسێك مرد و قەرزاریەكی لە سەر بوو ، ئەوەندەشی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو كە قەرزەكەی پێ ببژێردرێت ، ئەوا لە سەر منە كە بۆی ببژێرم ، وە ئەو كەسەش كە میراتێك بەجێ دەهێڵێ ئەوا بۆ میراتگرانێتی .

**شەشەم :** لە پێش بەخاك سپاردنی نوێژی لە سەر بكات ، یان هەندێكیان نوێژی لە سەر كردبێت ، و هەندێكیان نە ، ئەوا دەتوانن لە گۆڕەكەیدا نوێژی لە سەر بكەن ، بەمەرجێك پێشنوێژ لەو كەسانە بێت . لە شێوازی دووەمدا . كە نوێژیان لە سەر نەكردووە ، لەو بارەیەشەوە چەند فەرموودەیەك هەن :

---

(٢٠٦) أخرجه البخاري (٤/٣٧٦-٩/٤٢٥) ومسلم(٥/ ٦٢) والنسائي(١/٣٧٩) وابن ماجه(٢/٧٧) والطيالسي (٢٣٣٨) وأحمد (٢/٣٩٩و٤٥٣) ، والسياق المسلم،والزيادتان للبخاري ،ولأحمد الأولى منهما .

واخرج منه ما هو من كلامه الترمذي (٣/١٧٨) وصححه ، والدارمي (٢/٢٦٣) والطيالسي (٢٥٢٤) وأحمد (٢/٢٨٧، ٣١٨ ، ٣٣٤ ،٣٣٥،٣٥٦ ، ٣٩٩ ، ٤٥٠، ٤٦٤،٥٢٧) بنحوه ، وهو رواية مسلم وكذا البخاري بالفاظ متقاربة . (٨/٤٢٠و١٢/٧،٢٢،٤٠) من طرق كثيرة عن أبي هريرة .

وقال أبو بشر يونس بن حبيب راوي مسند الطيالسي عقب الحديث : " سمعت أبا الوليد ــ يعني الطيالسي ــ يقول:بهذا نسخ تلك الأحاديث التي جاءت على الذي عليه الدين " .

**فەرموودەی یەكەم :** لـە ( عبدالله ) ەی كـوڕی ( عبـاس ) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە كـە فەرموویـەتی : " مات رجل ـــ وكان رسول الله ﷺ يعوده ـــ فدفنوه بالليل ، فلما أصبح أعلموه ، فقال : مـا مـنعكم أن تعلموني ؟ قالوا : كان الليل ، وكانت الظلمة ، فكرهنا أن نشق عليك ، فأتى قبره فصلى عليه ، [ قال : فأمنا ، وصفنا خلفه ] ، [ وأنا فيهم ] ، [ وكبر أربعا ] " (٢٠٧) .

**واتە : پیاوێك كۆچی دوای كرد . كەسێك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەكرد لە كاتی نەخۆشیەكەیدا . و هەر بە شەو بەخاكیان سپارد ، وە كە ڕۆژ بوویەوە هەواڵیان پێدا ، فەرمووی : چی ڕێگر بوو لەوەی كە هەواڵی مردنیم پێ بگەیەنن ؟ وتیان : شەو بوو ، تاریكەش بوو ، پێمان خۆش نەبوو نارەحەتیت بخەینە سەر ، دوای ئەوە ڕۆشتە سەر گۆڕەكەی ، دەڵێت : كردینی بە سێ ڕیز لە پاش خۆیەوە و پێشنوێژی بۆ كردین ، منیشیان تێدا بوو ، و چوار ( الله أكبر ) ی لە سەر كرد .**

**فەرموودەی دووەم :** لـە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنـەوە كـە فەرموویـەتی : " أن امرأة سوداء كانت تقم ( وفي رواية تلتقط الخرق والعيدان من ) المسجد ، فماتت ، ففقدها النبي ﷺ ، فسأل عنها بعد أيام ، فقيل له إنها ماتت ، فقال : هلا كنتم آذنتموني ؟ ( قالوا : ماتت من الليل ودفنت ، وكرهنا أن نوقظك ) ، ( قـال : فكأنهم صغروا أمرها . فقال دلوني على قبرها فدلوه ، ( فأتى قبرها فصلى عليها ) ثم قال : [ قال ثابت ( أحـد رواة الحديث ) : عند ذاك أو في حديث آخر ] : إن هذه القبور مملوءة ظلمة على أهلها ، وإن الله عـز وجـل منورها لهم بصلاتي عليهم " (٢٠٨) .

---

(٢٠٧) أخرجه البخاري (٣/٩١-٩٢) وابن ماجه (١/٢٦٦) والسياق له ، ورواه مسلم (٥/٥٣-٥٦) مختصرا وكذا النسـائي(١/٢٨٤) والترمذي (٨/١٤٢) وابن الجارود في " المنتقى " (٢٦٦) والبيهقـي (٣/٤٦،٤٥) والطيالـسي (٢٦٨٧) وأحمـد(رقـم٢٥٥٤،١٩٦٢، ٣١٣٤)،والزيادة الأولى لهم "وللبخاري وفي رواية (٣/١٥٩،١٤٧،١٤٦)والزيادتان الأخيرتان له وللبيهقي ، ولمسلم والنسائي الأخيرة .

(٢٠٨) أخرجه البخاري (١/٤٤٠،٤٣٩،٤٣٨-٣/١٥٩) ومسلم (٣/٥٦) وأبو داود (٢/٦٨)وابن ماجه (١/ ٤٦٥) والبيهقي (٤/٤٧) والسياق لهما،والطيالسي (٢٤٤٦) وأحمد (٢/٣٥٣، ٣٨٨/٤٠٦) من طريق ثابت البناني عن أبي رافع عنه .

وإنما آثرت السياق المذكور لأن رواية لم ترد في أن الميت امرأة ، بينما تردد الراوي عند الآخرين في كونه امرأة أو رجلا ، والشك فيه من ثابت أو من أبي رافع كما جزم به الحافظ بن حجر ، وترجح عندنا أنه امرأة من وجوه :

الاول : أن اليقين مقدم على الشك .

الثاني : أن في رواية للبخاري بلفظ: "أن امرأة أو رجلا كانت تقم المسجد، ولا أراه إلا امرأة ".فقد ترجح عند الراوي أنه امرأة .

الثالث : إن الحديث ورد من طريق أخر عن أبي هريرة لم يشك الا روي فيها:ولفظها : " فقد النبي امرأة سوداء كانـت تلـتقط الخـرق والعيدان من المسجد ، فقال : أين فلانة ؟ قالوا : ماتت ". وذكر الحديث هكذا ساقه البيهقي (٢/ ٤٤٠-٤/٣٢) من طريق العلاء بن عبـد الرحمن عن أبيه عنه . وهكذا أخرجه ابي خزيمة في " صحيحه " كما في " الفتح " .

والزيادة الأولى للبيهقي وابن خزيمة ، وشطرها الأول لأحمد ، والثانية لمسلم والبيهقي في رواية وللبخاري معناها ، ولأبي داود " والمسندين" الشطر الثاني منها ،والزيادة الثالثة للبيهقي والرابعة له في رواية ولمسلم وكذا أحمد ، وعنده الزيادة من قول ثابت ، وهي عند البيهقي أيضا .

واتە : ئافرەتێكی ڕەش پێست هەبوو خزمەتی مزگەوتی دەكرد ( لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە : پارچە شت و چڵە داری لە ناو مزگەوتەكە كۆ دەكردەوە ، پاشان مرد ، پێغەمبەری خواش ماوەیەك نەیبینی ، پاش چەند ڕۆژێك پرسیاری سەبارەت بەو ئافرەتە كرد ؟ لە وەڵامدا پێی وترا : ئەو ئافرەتە مرد ، ئەویش فەرمووی : ئەی بۆچی ئەو كاتە هەواڵتان پێ نەدام ؟ وتیان : لە شەودا مرد و هەر لە شەویشدا بەخاك سپێردرا ، و حەزمان لێ نەبوو كە خەبەردارت كەینەوە ، دەڵێت : هەروەك بڵێت : باسەكەیان بەبێ نرخی هێنایەوە ، ئەویش فەرمووی : گۆڕەكەیم پێ پیشان بدەن ، ئەویش هاتە سەر گۆڕەكە و نوێژی لە سەر كرد ، و پاشان فەرمووی ( ثابـت ) دەڵێت . كە یەكێكە لە گێڕەرەوانی فەرموودەكە . لەم فەرموودەیەدا یان لە فەرموودەیەكی تردا ) : ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریكی بە سەر خاوەنەكانیانەوە ، وە خوای پەروەردگاریش بە نوێژەكانی من لە سەریان ڕووناكی دەكاتەوە بۆیان .

**فەرموودەی سێیەم :** لە ( یزید ) ی كوڕی ( ثابت ) ەوە ﷺ كە لە ( زید ) گەورەتر بوو ، دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " خرجنا مع النبي ﷺ [ ذات يوم ] فلما ورد البقيع " فإذا هو بقبر جديد ، فسأل عنـه " فقالوا : فلانة ( مولاة بني فلان ) ، قال : فعرفها وقال : ألا آذنتموني بها ؟ قالوا : [ ماتت ظهـرا ، و ] كنـت قائلا صائما فكرهنا أن نؤذيك ، قال : فلا تفعلوا ، لا أعرفن ، ما مات منكم ميت ما كنت بـين أظهـركم إلا اذنتموني به ، فإن صلاتي عليه رحمه " ، ثم أتى القبر ، فصففنا خلفه فكبر عليه أربعا " [٢٠٩] .

واتە : ڕۆژێكیان لە گەڵ پێغەمبەری خوادا دەرچووین ، لەو كاتەی كە ڕۆشتە سەر بەقیع . كە گۆڕستانی موسڵمانان بوو . بینی قەبرێكی تازە هەیە ، ئەویش پرسیاری كرد سەبارەت بەو قەبرە تازەیە ، وتیان : فلانە ئافرەتی خزمەتكاری فلانە بنەماڵەیە ، دەڵێت : پێغەمبەری خواش ناسیەوە ، و فەرمووی : ئەی بۆ منتان ئاگادار نەكردەوە بۆی ؟ وتیان ئەی پێغەمبەری خوا كاتی نیوەڕۆ مرد تۆ ئەو كاتە خەوتبوویت و بە ڕۆژووش بوویت ، حەزمان لێ نەبوو ناڕەحەتت بكەین ، فەرمووی : بۆ جارێكی تر وا مەكەن ، ( لا أعرفن ، ما مات منكم ميت ما كنت بين أظهركم إلا اذنتموني به ) ، چونكە

---

وقد رجح الحافظ تبعا للبيهقي أن الزيادة الرابعة مدرجة في الحديث وأنها من مراسيل ثابت . وخالفهما ابن التركماني ، فذهب إلى أنها مسندة من رواية أبي رافع عن أبي هريرة " لأنه كذلك في صحيح مسلم ، لكن قول ثابت هذا يؤيد ما ذهب إليه الأولان . ويقويه أن الحديث ورد من رواية ابن عباس أيضا وليس فيه هذه الزيادة أخرجه الطبراني في " المعجم الكبير " (٢/١٢٨/٣) .

نعم ثبتت هذه الزيادة أو معناها مسندة في حديث آخر وهو ( الحديث الثالث في المتن ) .

[٢٠٩] أخرجه النسائي ( ١/ ٢٨٤ ) وابن ماجه ( ١ / ٤٦٥ ، ٤٦٦ ) وابن حبان في صحيحه ( ٧٥٩ - موارد ) والبيهقي ( ٤ / ٤٨ ) ، والسياق لابن ماجه ، والزيادات للنسائي ، وإسناده عند الجميع صحيح على شرط مسلم .

نوێژی من لە سەر ئەوان ڕەحمەتە بۆیان ، پاشان هاتە سەر گۆڕەکەی و ئێمەی بە دوای خۆیدا ڕیزکرد و چوار تەکبیرەی لە سەر کرد .

**فەرموودەی چوارەم :** لە هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە : " أن رســـول الله ﷺ كان يعود مرضى مساكين المسلمين وضعفائهم : ويتبع جنائزهم ولا يصلي عليهم غيره ، وأن امرأة مسكينة من أهل العوالي طال سقمها ، فكان رسول الله ﷺ سأل عنها من حضرها من جيرانها " وأمرهم أن لا يـــدفنوها إن حدث بها حدث فيصلي عليها ، فتوفيت تلك المرأة ليلا واحتملوها فأتوا بها مع الجنائز أو قال : موضع الجنائز عند مسجد رسول الله ﷺ [٢١٠] ليصلي عليها رسول الله ﷺ كما أمرهم فوجدوه قد نام بعد صلاة العشاء " فكرهوا أن يهجدوا [٢١١] رسول الله ﷺ من نومه فصلوا عليها . ثم انطلقوا بها ، فلما أصبح رســـول الله ﷺ سأل عنها من حضره من جيرانها ، فأخبروه خبرها ، وإنهم كرهوا أن يهجدوا رسول الله ﷺ لها ، فقال لهم رسول الله ﷺ : ولم فعلتم ؟ انطلقوا ، فانطلقوا مع رسول الله ﷺ حتى قاموا على قبرها ، فصفوا وراء رسول الله ﷺ كما يصف للصلاة على الجنازة ، فصلى عليها رسول الله ﷺ ، وكبر أربعا كما يكبر على الجنائز " [٢١٢] .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو سەردانی نەخۆشی هەژار و لاوازی موسڵمانانی دەکرد ، و شوێنی جەنازەشیان دەکەوت و کەسیش نوێژی لە سەر نەدەکرد جگە لەو نەبێت ، وە جارێکیان یەکێك لە ئافرەتانی ناوچە بەرزاییەکانی دەوروبەری مەدینە نەخۆشیەکی درێژە خایەن نەخۆش دەکەوێت ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەموو جارێ کە دراوسێیەکانی دەهاتنە خزمەت پرسیاری ئەو ئافرەتەی لێ دەکردن ، وە فەرمانی پێ کردن کە ئەگەر شتێك بەسەر ئەو ئافرەتەدا هات بەخاکی نەسپێرن تاکو ئەوی لێ ئاگادار نەکەنەوە ، بۆ ئەوەی نوێژی لە سەر بکات ، پاش ماوەیەك شەوێك لە شەوەکان ئەو ئافرتە مرد و خزم و کەس و کاری هەڵیان گرت و بردیان بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ جەنازەکانی تردا ، یان دەڵێت : بۆ شوێنی جەنازە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا بۆ ﷺ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر بکات هەروەکو فەرمانی پێکردوون ، بەڵام بینیان هەر دوای نوێژی عیشا نووستووە ، بۆیە پێیان خۆش نەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخەبەر بکەنەوە لە خەوەکەی ، و خۆیان نوێژیان لە سەر کرد ، و پاشان بەرێیان کرد ، وسبەینێ کە ڕۆژ بوویەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لەو دراوسێیانەی کرد کە هاتنە خزمەتی سەبارەت بەو ئافرەتە ، و ئەوانیشیان هەواڵی ئەو ئافرەتەیان پێدا ، کە ئەوان

---

[٢١٠] هو شرقي المسجد النبوي ، وهو اليوم الارض الممتدة مع طول المسجد من من الشمال إلي الجنوب بجانب باب النساء .

[٢١١] ثم يوقضوا وهو من الاضداد .

[٢١٢] أخرجه البيهقي(٤/٤٨)بإسناد صحيح، والنسائي (١/٢٨٠ ،٢٨١) مختصرا .

حەزیان نەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەوەکەی خەبەردار بکەن بۆ ئەو ئافرەتە ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموون : ئەی بۆ ئەوەتان کرد ؟ هەستن بڕۆین ، ئەوانیش هەستان لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ تاکو گەشتنە سەر گۆڕەکەی ، و بەدوای پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕیزبوون هەروەکو چۆن لە نوێژی جەنازەدا بە دوایدا ڕیز دەبوون ، و پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی لە سەر کرد و چوار تەکبیرەی لە سەر کرد هەروەکو چۆن لە سەر جەنازە ئەنجامی دەدا .

**حەوتەم :** ئەو کەسەی کە لە وڵاتێکدا بمرێت کەس نەبێت نوێژی لە سەر بکات ، ئەوا کۆمەڵێك لە موسڵمانان دەتوانن نوێژی غایبی لە سەر بکەن ، لە بەر نوێژ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر نەجاشی ، ئەو نوێژەش کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گێڕاویانەتەوە ، هەندێکیان بە درێژتر لەوانی تر دەیگێڕنەوە ، منیش لێرەدا هەموو فەموودەکانیانم سەبارەت بەو نوێژە کۆکردووەتەوە ، پاشان بە یەك ( سیاق ) گێڕاومنەتەوە بۆ نزیك کردنەوەی سوودی فەرموودەکە ، شێوەی بنەوای فەرموودەکە هی ( أبو هريرة ) ەیە ﷺ کە دەفەرمووێت : " إن رسـول الله ﷺ نعى للناس [ وهو بالمدينة ] النجاشي [ أصحمه ] [ صاحب الحبشة ] في اليوم الذي مات فيه : [ قال : إن أخا قد مات ( وفي رواية : مات اليوم عبد لله صالح ) [ بغير أرضكم ] [ فقوموا فصلوا عليه ] ، [ قالوا : من هو ؟ قال النجاشي ] [ وقال : استغفروا لأخيكم ] ، قال : فخرج بهم إلى المصلى ( وفي رواية : البقيع ) [ ثم تقدم فصفوا خلفه ] [ صفين ] ، [ قال : فصففنا خلفه كما يصف على الميت وصلينا عليه كما يصلى على الميت ] [ وما تحسب الجنازة إلا موضوعة بين يديه ] [ قال : فأمنا وصلى عليه ] ، وكبر ( عليه ) أربع تكبيرات " [٢١٣] .

---

[٢١٣] أخرجه البخاري (٣/١٤٥،٩٠، ١٥٧،١٥٥) ومسلم (٣/٥٤) واللفظ له وأبو داود (٢/٦٩،٦٨) والنسائي (١/٢٨٠،٢٦٥) وابن ماجه (١/٤٦٧) والبيهقي (٤/٤٩)والطيالسي (٢٣٠٠) وأحمد (٢/٣٤٨،٢٨٩،٢٨٠،٢٤١، ٥٢٩،٤٧٩،٤٣٩،٤٣٨) من طرق عن أبي هريرة .والزيادة الأولى للنسائي وأحمد ، والثانية للبخاري والثالثة لابن ماجة،والسابعة للشيخين والنسائي وأحمد،والعاشرة ، الشطر الثاني منها لأحمد وهي عنده بتمامها عن غير أبي هريرة كما يأتي ، والزيادة الأخيرة لمسلم . وروى منه الترمذي (٢/١٤٠) وصححه أن النبي ﷺ صلى على النجاشي فكبر أربعا وهو رواية للطيالسي (٢٢٩٦) .

١ ـ ثم أخرجه البخاري ( ٣ / ١٤٥ ، ١٤٦ ) ومسلم والنسائي والبيهقي والطيالسي في ( ١٦٨١ ) وأحمد ( ٣ / ٢٩٥ ، ٣١٩ ، ٣٥٥ ، ٣٦١ ، ٣٦٣ ، ٣٦٩ ، ٤٠٠ ) من طرق حديث جابر رضي الله عنه .والزيادة الثانية والثالثة والرابعة للشيخين وأحمد،وله الخامسة والسادسة، ولمسلم والنسائي التاسعة ، وللنسائي الجملة الأولى من الزيادة العاشرة . والزيادة الثانية عشر لمسلم وأحمد .

٢ ـ ثم أخرجه مسلم والنسائي والترمذي (٢/١٤٩) وصححه ابن ماجه وابن حبان والبيهقي والطيالسي (٧٤٩) وأحمد (٤/٤٣٩،٤٣١،٤٣٣ ،٤٤٦،٤٤١)عن عمران وفيه الزيادة الرابعة عندهم جميعا،والعاشرة عند الطيالسي والنسائي والترمذي وأحمد،وعنده التي بعدها وكذا ابن حبان .

٣ ـ ثم أخرجه ابن ماجه والطيالسي (١٠٦٨) وأحمد (٤/٧) عن حذيفة بن أسير وفيه عندهم الزيادة الرابعة والخامسة . وكذا عندهم

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی ( أصمحة ) نەجاشی کە پاشای حەبەشە بوو دا بە خەڵك لە مەدینە ، لەو ڕۆژەی کە تێیدا مرد ، فەرمووی : برایەك مردووە ، یان : ئەمڕۆ بەندەیەکی صاڵحانی خوای پەروەردگار مردوە ، لە خاکێك کە خاکی ئێوە نیە ، جا هەستن نوێژی لە سەر بکەن ، ئەوانیش وتیان : کێیە ؟ لەوەڵامدا فەرمووی : نەجاشیە ، و فەرمووی : داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ براکەتان ، ڕاوی دەڵێت : پاشان دەریکردین بۆ موصەلاّ ( نوێژگە ) وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە : دەریکردین بۆ بەقیع ـ کە قەبرستانی موسڵمانان بوو ـ پاشان پێشکەوتوو و ئەوانیش بە دوایدا ڕیزبوون و بوون بە دوو ڕیزەوە ، ڕاوی دەڵێت : ئێمەش بە دوایدا ڕیز بووین هەروەکو چۆن لە سەر مردوو ڕیز دەبووین ، و نوێژمان لە سەر کرد هەروەکو چۆن نوێژ لە سەر مردوو دەکرێت ، هەروەکو بڵێت تەرمەکەی لە بەر دەستدا دانرابێت ، وە دەڵێت : پێغەمبەری خواش ﷺ پێشنوێژی بۆ کردین و نوێژی لە سەر کرد ، و چوار تەکبیرەی لە سەر کرد .

ئەوەش بزانە کە ئەو فەرموودانەی کە سەبارەت بە نوێژکردن باسمان کردووە لە سەر ( غایب ) هەر ئەوەیە کە فەرموودەکە جگە لەوە هەڵناگرێت ، بۆیە دەبینیت برێك لە زانایانی مەزهەبەکان پێشمان کەوتوون بۆ ئەم وشەیە ، لێرەشدا پوختەی وتەی ( ابن القیم ) ت بۆ دەگێڕمەوە کە لەم بارەیەوە فەرموویەتی لە ( زاد المعاد : ١ / ٢٠٥ ، ٢٠٦ ) : (( ولم يكن من هديه ﷺ وسنته الصلاة على كل ميت غائب ، فقد مات خلق كثير من المسلمين وهو غيب ، فلم يصل عليهم ، وصح عنه أنه صلى على النجاشي صلاته على الميت ، فاختلف في ذلك على ثلاثة طرق :

١ ـ أن هذا تشريع وسنة للأمة الصلاة على كل غائب وهذا قول الشافعي وأحمد .

٢ ـ وقال أبو حنيفة ومالك : هذا خاص به ، وليس ذلك لغيره .

---

السادسة : إلا الطيالسي .

٤ ـ ثم رواه ابن ماجه وأحمد (٤/٦٤-٥/٣٧٦) عن مجمع بن حارثة الانصاري وقال البوصيري في " الزوائد " . " إسناده صحيح " ، ورواه ثقات ".وفيه الزيادة الرابعة "وعن ابن ماجه التاسعة.

٥ ـ ثم رواه الترمذي وابن ماجه عن عبد الله . بن عمر مثل حديث أبو هريرة المختصر عند الترمذي . وإسناده صحيح أيضا

٦ ـ ثم أخرجه أحمد (٤/٢٦٤-٢٦٣) عن جرير بن عبد الله مرفوعا بلفظ " إن أخاكم النجاشي قد مات فاستغفروا له . وإسناده حسن .

قلت : في هذه الأحاديث دليل من وجوه لاتخفى على أن النجاشي أصحمة كان مسلما ، ويؤيد ذلك أنه جاء النص الصريح عنه بتصديقه بنبوته ﷺ ، فقال إبو موسى الأشعري رضي الله عنه : " أمرنا رسول الله ﷺ أن ننطلق إلى أرض النجاشي - فذكر القصة وفيها - وقال النجاشي : أشهد أنه رسول الله ، وأنه الذي بشر به عيسى بن مريم ، ولولا ما أنا فيه من الملك لأتيته حتى أحمل نعليه " . اخرجه أبو داود والبيهقي باسناد صحيح كما قال البيهقي فيما نقله العراقي في " تخريج الأحياء " ( ٢ / ٢٠٠ ) وله " شاهد من حديث أبن مسعود . أخرجه الطيالسي ( ٣٤٦ ) ، وله شواهد أخرى في مسند أحمد ( ٥ / ٢٩٠ و ٢٩٢ ) .

٣ ـــ وقال شيخ الاسلام ابن تيمية : الصواب أن الغائب إن مات ببلد لم يصل عليه فيه ، صلي عليه صلاة الغائب كما صلى النبي ﷺ على النجاشي لأنه مات بين الكفار ، ولم يصل عليه وإن صلي عليه حيث مـات لم صل عليه صلاة الغائب ، لأن الفرض سقط بصلاة المسلمين عليه ، والنبي ﷺ صلى على الغائب وتركه كمـا وفعله وتركه سنة . وهذا له موضع والله أعلم ، والأقوال ثلاثة في مذهب أحمد ، وأصحها هذا التفصيل )) .

واتە : لە عادەت و سوننەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ نەبووە كە نوێـژ لە سەر هـەموو مردوويەكى ئامادە نەبوو بكات ، هەروەك دەبينين خەڵكێكى زۆر لـە موسڵمانان مـردوون ، و ئـەويش ئامادەيـان نەبووە ، كەچى نوێژيشى لە سەر نەكردوون ، لە گەڵ ئەوەشدا بـە ( صـــحيح ) ى پێمـان گەشتوە و سەلمێندراوە كە نوێژى لـە سـەر نەجاشـى كـردووە هـەروەك چۆن نوێـژى لـە سـەر مـردوو كـردووە ، بۆيە زانايان لەو باسەدا جياوازيان هەيە لە سەر سێ بۆچوون :

١ . ئەمـە شـەرع كردنـە و سـوننەتە بـۆ ئوممەتەكـەى كـە نوێـژ لـە سـەر هـەموو مردوويـەكى ئامادەنەبوو بكەن ، و ئەمەش وتەى پێشەوايان ( الشافعي ) و ( أحمد ) ە .

٢ . وە پێشەوايان ( أبو حنيفة ) و ( مالك ) فەرموويانە : ئـەوە تايبەتـە بـە خۆيـەوە ، بۆيـە نابێـت كەسى تر لاساى بكاتەوە .

٣ . وە شێخى پايەبەرزى ئيسلام ( ابن تيمية ) فەرموويەتى : وتەى هەڵبژاردە و ڕاسـت ئەوەيانـە كـە بووترێـت : مـردووى ئامـادە نـەبوو ئەگـەر لـە شـارێكدا مـرد و كـەس نوێـژى لـە سـەر نـەكرد لـەو شـارەدا ، ئـەوا نوێـژى غـايبى لـە سـەر دەكرێـت ، هـەروەكو چـۆن پێغەمبـەرى خـوا نوێـژى لـە سـەر نەجاشى كرد ، چونكە لە نێو بێ باوەڕاندا مرد ، و كەس نوێژى لە سەر نەكرد ، بەڵام ئەگەر مـرد و نوێژى لە سەر كرا لـەو شارەدا ، ئـەوا نوێـژى غـايبى لـە سـەر ناكرێـت ، چونكـە ئـەو فـەرزە لـە سـەر موسڵمانان كەوتووە بە نوێژكردنى ئەو موسڵمانانە لە سەرى ، پێغەمبـەرى خـواش نوێـژى كـردووە و نەيشيكردووە و وازى لێهێناوە ، هەروەكو چۆن وازلێهێنان و كردنى سوننەتە ، ئەمـەش شـوێنى خۆى هەيە ، خواى پەروەردگاريش زاناترە ، وە سێ وتەكـەش لـە مەزهـەبى پێشـەوا ( أحمد ) دا . بـە ڕەحمەت بێت . هەن ، باشترينيشيان ئەم ( تفصيل ) ەيە كە باسمان كرد .

وە دەڵێم ( ئـەلبانى ) : واختار هذا بنص ، المحققين من الشافعية ، فقال الخطابي في " معالم السنن " ما نصه : قلت : النجاشي رجل مسلم قد آمن برسول الله ﷺ وصدقه على نبوته . " إلا أنه كان يكتم إيمانه والمسلم إذا مات وجب على المسلمين أن يصلوا عليه : إلا أنه كان بين ظهراني أهل ، الكفر ، ولم يكن بحضرته من يقوم بحقه في الصلاة عليه ، فلزم رسول الله ﷺ أن يفعل ذلك ، إذ هو نبيه ووليه وأحق الناس به . فهذا ـــ والله أعلم ـــ هو السبب الذي دعاه إلى الصلاة عليه بظاهر الغيب .

فعلى هذا إذا مات المسلم ببلد من البلدان ، وقد قضى حقه في الصلاة عليه ، فانه لا يصلي عليه من كان في بلد آخر غائبا عنه ، فإن علم أنه لم يصل عليه لعائق أو مانع عذر كأن السنة أن يصلى عليه ولا يترك ذلك لبعد المسافة .

فأذا ، صلوا عليه أستقبلوا القبلة ، ولم يتوجهوا إلى بلد الميت إن كان في غير جهة القبلة . وقد ذهب بعض العلماء الى كراهة الميت الغائب ، وزعموا أن النبي ﷺ كان مخصوصا بهذا الفعل ، إذ كان في حكم المشاهد للنجاشي . لما روي : في بعض الأخبار " أنه " قد سويت له أعلام الأرض ، حتى كان يبصر مكانه " [٢١٤] وهذا تأويل فاسد لأن رسول الله ﷺ إذا فعل شيئا من أفعال الشريعة ، كان علينا . متابعته والايتساء به ، والتخصيص لا يعلم ألا بدليل . ومما يبين ذلك أنه ﷺ خرج بالناس إلى المصلى فصف بهم ، فصلوا معه ، فعلم أن هذا التأويل فاسد ، والله أعلم .

وقد استحسن الروياني ــ هو شافعي أيضا ــ ما ذهب إليه الخطابي " وهو مذهب أبي داود أيضا فإنه ترجم للحديث في " سننه " بقوله " باب في الصلاة على المسلم يموت في بلاد الشرك " : واختار ذلك من المتأخرين العلامة المحقق الشيخ صالح المقبلي كما في " نيل الأوطار " (٤/ ٤٣) واستدل لذلك بالزيادة التي وقعت في بعض طرق الحديث : " إن أخاكم قد مات بغير أرضكم ، فقوما فصلوا عليه " وسندها على شرط الشيخين .

ومما يؤيد عدم مشروعية الصلاة على كل غائب أنه لما مات الخلفاء الراشدون وغيرهم لم يصل أحد من المسلمين عليهم صلاة الغائب . ولو فعلوا لتواتر النقل بذلك عنهم . فقابل هذا . بما عليه كثير من المسلمين اليوم من الصلاة على كل غائب لاسيما إذا كان له ذكر وصيت ، ولو من الناحية السياسية فقط ولا يعرف بصلاح أو خدمة للاسلام " ولو كان مات في الحرم المكي وصلى عليه الآلاف المؤلفة في موسم الحج صلاة الحاضر ، قابل ما ذكرنا بمثل هذه الصلاة تعلم يقينا أنها من البدع التي لا يمتري فيها عالم بسننه ﷺ ومذهب السلف رضي في الله عنهم .

٦٠ ـ وە نوێژكردن لە سەر بێ باوەڕان و دوو ڕووان [٢١٥] ، و داوای لێخۆشبوون ، ( ترحم ) كردن حەرامە وقەدەغە كراوە ، ئەوەش لە بەر وتەی خوای پەروەردگار كە فەرموویەتی : ﴿ وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ ( سورة التوبة : ٨٤ ) .

وە سەبارەت بە هۆكاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە كە ( عبدالله ) ی كوڕی ( عمر ) ، و باوكی دەیگێڕنەوە ، و دەفەموون كە : " لما مات عبد الله بن أبي سلول دعي له رسول الله ﷺ ليصلي

---

[٢١٤] وذكر النووي في " المجموع " ( ٥ / ٢٥٣ ) أن هذا الخبر من الخيالات ! ثم ذكر حديث العلاء بن زيدل في طي الأرض للنبي ﷺ ، حتى ذهب فصلى على معاوية في تبوك وقال أنه حديث ضعيف ضعفة الحفاظ منهم البخاري والبيهقي .

[٢١٥] هم الذين يبطنون الكفر ويظهرون الاسلام ، وإنما يتبين كفرهم . بما يترشح من كلامتهم من الغمز في بعض أحكام الشريعة وأشتهجانها ، وزعمهم أنها مخالفة للعقل والذوق ! وقد أشار إلى هذه الحقيقة ربنا تبارك في قوله :(أم حسب الذين في قلوبهم مرض أن لن يخرج الله أضغانهم .ولو نشاء لأريناكهم فلعرفتهم بسيماهم ولتعرفنهم في لحن القول ، والله يعلم أعمالكم )،وامثال هؤلاء المنافقين كثير في عصرنا الحاضر،والله المستعان .

عليه ، فلما قام رسول الله ﷺ وثبت إليه [ حتى قمت في صدره ] ، [ فأخذت بثوبه ] فقلت : يارسول الله أتصلي على [ عدو الله ] ابن أبي وقد قال يوم كذا وكذا وكذا !؟ أعدد عليه قوله [٢١٦] [ أليس ـ قد نهاك الله أن تصلي على المنافقين فقال : ] ﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ﴾ ] فتبسم رسول الله ﷺ وقال : أخر عني يا عمر ! فلما أكثرت عليه قال : إني خيرت فاخترت . [ قد قيل لي : ﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ﴾ لو أعلم أني إن زدت على السبعين غفر له لزدت عليها ، [ قال : إنه منافق ] [٢١٧] قال : فصلى عليه رسول الله ، ﷺ [٢١٨] [ وصلينا معه ].[ ومشى ﷺ معه فقام على قبره حتى فرغ منه ] ثم انصرف فلم يمكث إلا يسيرا حتى نزلت الآيتان من براءة : ﴿ وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ... ﴾ إلى : ﴿ ... وَهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ ، [ قال : ( فما صلى رسول الله ﷺ بعده على منافق ولا قام على قبره حتى قبضه الله ) ، قال : فعجبت بعد من جرأتي على رسول الله ﷺ يومئذ ] والله ورسوله أعلم " [٢١٩] .

**واتە : کاتێك کە ( عبدالله ) ی کوڕی ( أبي سلول ) مرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ کرا بۆ ئەوەی کە نوێژی لە سەر بکات ، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی لە سەر بکات ، منیش دەرپەڕیم تاکو بەرامبەری وەستام ، جلەکەیم گرت و وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ لە سەر دوژمنی خوا ( ابن أبي ) دەکەی کە لە ڕۆژی ئەوەدا ئەوە و ئەوەی وتووە ؟! دەڵێ : وتەکانیم بۆ**

---

[٢١٦] يشير بذلك إلى مثل قوله : ( ولا تنفقوا على من عند رسول لى الله حتى ينفضوا ) وقوله ( ليخرجن الاعز منها الاذل ) .

[٢١٧] قال الحافظ ابن حجر رحمه الله في " فتح الباري " (٨/ ٢٧٠ ) : " إنما جزم عمر أنه منافق جريا على ما يطلع من أحواله ، وإنما لم يأخذ النبي ﷺ بقوله : وصلي بقوله : وصلي عليه إجراء له علي ظاهر حكم الاسلام ، واصتصحابا لظاهر الحكم ، ولما فيه من إكرام ولده الذي تحققت صلاحيته ومصلحة الأستئلاف لقومه ودفع المفسدة ، وكان النبي ﷺ أول الأمر يصبر على أذى المشركين ويعفو ويصفح ، ثم أمر بقتال لمشركين ، فاستمر صفحه وعفوه عمن يظهر الاسلام ولو كان باطنه على خلاف ذلك لمصلحة الاستئلاف وعدم التنفير عنه ، ولذلك قال : " لا يتحدث الناس أن محمدا يقتل أصحابه " ، فلما حصل الفتح ، ودخل المشركون في الاسلام ، وقل أهل الكفر وذلوا ، أمر بمجاهرة المنافقين وحملهم على حكم مر الحق ، ولاسيما وقد كان ذلك قبل نزول النهي الصريح عن الصلاة على المنافقين وغير ذلك مما أمر فيه . بمجاهرتهم وبهذا التقرير يندفع الاشكال عما وقع في هذه القصة بحمد الله تعالى " .

[٢١٨] قلت : وإنما . صلى عليه بعدما أدخل في حفرته واخرج منها بامره ﷺ ، وألبسه قميصه كما سيأتي في المسألة (٩٤ ) .

[٢١٩] اخرجه البخاري ( ٣ / ١٧٧ – ٨ / ٢٧٠ ) والنسائي ( ١ / ٢٧٩ ) والترمذي ( ٣ / ١١٧ ، ١١٨ ) واحمد ( رقم ٩٥ ) عن عمر والزيادة الأولى والثالثة والخامسة والاثمنة والاتسعة لأحمد والترمذي وصححه والزيادات الأخرى للبخاري إلا السادسة فهي لمسلم " وللبخاري من حديث ابن عمر والزيادة الثانية للطبري كما في " الفتح " .

ثم أخرجه البخاري(٨/٢٨٦ج ٢٧٠–١٠/٢١٨)ومسلم (٧/١١٦–٨/١٢٠، ١٢١) والنسائي(١/٢٦٩) والترمذي ( ٣/١١٩،١١٨) وابن ماجه (١/٤٦٥،٤٦٤)والبيهقي (٣/٤٠٢) ،–أحمد (٤٦٨٠) من حديث ابن عمر وفيه من الزيادة الثانية والسادسة .

دەژمارد ، یان بە پێغەمبەری خوای وت ﷺ : ئایا خوای پەروەردگار نەهی لێ نەکردوویت کە نوێژ لە سەر دوو ڕوان بکەیت ؟ و ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ﴾ پێغەمبەری خواش ﷺ لەو کاتەدا بزگە پێکەنینێکی بۆ کرد ، و فەرمووی : ئەی ( عمر ) ﷺ دوورکەوە لێم ! بەڵام کە من زۆر بۆم دووبارە کردەوە ، فەرمووی : خوای پەروەردگار داویەتی بە دەستی خۆم کامەیان هەڵبژێرم ، منیش نوێژکردنم لە سەریان هەڵبژارد ، خوای پەروەردگار پێی فەرمووم : ﴿ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ﴾ ، وە ئەگەر بشزانم کە ئەگەر زیاد لە حەفتا جاریش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەم خوای پەروەردگار لێیان خۆش دەبێت بۆیان زیاد لە سەر حەفتا جارەکەش دەیکەم ، ( عمر ) ﷺ وتی : ئەو دوو ڕووە ، دەڵێت : بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر کرد و ئێمەش لە گەڵیا نوێژمان لە سەر کرد ، و دواتر کەوتە ڕێ تاکو لە سەر گۆڕەکەی وەستا ، تاکو لێبوونەوە ، پاشان گەڕایەوە و زۆری پێ نەچوو ، ئەو دوو ئایەتەی سورەتی ( براءة ) هاتنە خوارەوە ، ﴿ وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ دەڵێت : دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر هیچ دووڕوویەك نەکرد ، و لە سەر گۆڕی کەسیان نەدەوەستا ، تاکو خوای پەروەردگار بردیەوە ، دەڵێت : پاشان خۆم سەرسوڕمانم دەهات لە بوێری خۆم بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا ، خوای پەروەردگار و پێغەمبەرکەشی زاناترن .

وە لە ( المسيب ) ی کوڕی ( حزن ) ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " لما حضرت أبا طالب الوفاة جاءه رسول الله فوجد عنده : أبا جهل ، وعبد الله ابن أبي أمية ، والمغيرة ، فقال رسول الله ﷺ : يا عم إنك أعظم الناس علي حقا ، وأحسنهم عندي يدا . ولأنت أعظم علي حقا من والدي ، فـ [ لا إله إلا الله ، كلمة أشهد لك بها عند الله ، فقال أبو جهل وعبدالله بن أمية : يا أبا طالب . أترغب عن ملة عبدالمطلب ؟! فلم يزل رسول الله ﷺ يعرضها عليه ويعيد [ ان ] [220] له تلك المقالة ، حتى قال أبو طالب آخر ماكلمهم : هو على ملة عبدالمطلب وأبى أن يقول : لا إله إلا الله [ قال : لولا أن تعيرني قريش — يقولون : إن ما حمله على ذلك الجزع — لأقررت بها عينك ! ( فقال رسول الله ﷺ : أما والله لأستغفرن لك ما لم أنه عنك ( فأخذ المسلمون يستغفرون لموتاهم الذين ماتوا وهم مشركون ، فأنزل الله عز وجل : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴾ ، وأنزل الله في أبي طالب " فقال رسول الله ﷺ : ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ !! " [221] .

---

[220] اي ابو جهل وابن ابي امية .

[221] اخرجه البخاري (٣/١٧٣-٧/١٥٤- ٨/٢٧٤، ٤١٠ ، ٤١١ ) ومسلم والنسائي ( ١/ ٢٨٦) وأحمد ( ٥/ ٤٣٣) وابن جرير في تفسيره

واته : كاتێك كە ( أبو طالب ) ی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای و بینی ( أبو جهل ) ، و ( عبدالله ) ی كوڕی ( أبو أمية ) ، و ( المغـيرة )ی لە لایە ، پێغەمبەری خوا فەرمووی : ئەی مام تۆ لە هەموو كەس زیاتر مافت بە سەر منەوەیە ، و لە هەمووشیان دەستی بالاترت هەبووە ، بگرە تۆ لە باوكیشم زیاتر مافت بەسەرمەوە هەیە ، بۆیە بڵێ ( لا إله إلا الله ) بۆ ئەوەی گەواهیت بۆ بدەم لە لای خوای پەروەردگار لە سەر ئەو وشەیە ، لەو كاتەدا ( أبو جهل ) ، و ( عبدالله ) ی كوڕی ( أمية ) پێیان وت : ئەی ( أبـو طالـب ) واز دەهێنی لە ئایینی ( عبدالمطلب ) ؟!

وە لە ( علي ) ﷺ هوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " سمعت رجلا يستغفر لأبويه وهما مـشركان ، فقلت : تستغفر لأبويك وهما مشركان !؟ فقال : [ أليس قد استغفر إبراهيم وهو مشرك ؟ قال : فذكرت ذلك للنبي ﷺ !؟ فنزلت : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَـا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ [٢٢٢] لِأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴾ " [٢٢٣] .

واتـە : گـوێم لێبـوو موسـڵمانێك داوای لێخۆشـبوونی بـۆ بـاوك و دایكـی بـێ بـاوەڕی دەكـرد ، منیش پێم وت : داوای لێخۆشبوون بۆ باوك و دایكی بێ باوەڕت دەكەی ؟! لە وەڵامدا وتی : ئەی

---

(١١/ ٢٧) والسياق له وكذا مسلم ، والزيادة الثانية له في بعض الأصول كما ذكره الحافظ عن القرطبي ويشهد لها رواية البخاري وغيره بمعناها .

ووردت القصة من حديث أبي هريرة باختصار عند مسلم والترمذي ( ٤ / ١٥٩ ) وحسنه ، وعندهما الزيادة الثالثـة ، والحـاكم ( ٢ / ٣٣٥ و ٣٣٦ ) وصححه ووافقه الذي ، وله الزيادة الأولى ، وهي عند ابن جرير أيضا من حديث سعيد بن المسيب مرسلا ، ولكنه في حكم الموصول . لأنه هو الذي روى الحديث عن المسيب ابن حزن وهو والده .

ووردت أيضا من حديث جابر . أخرجه الحاكم أيضا وصححه ووافقه الذهبي .وفيه الزيادة الرابعة وهي عند ابن جرير مرسلا عن مجاهـد وعن عمرو بن دينار.

[٢٢٢] قلت : وهذا الاستغفار إنما هو ما حكاه الله تعالى في أواخر سورة أبراهيم عنه : ( ربنا أغفر ولوالدي وللمؤمنين يوم يقوم الحساب ) ، وقد ذكر المفسرن أن هذا الدعاء منه بعد وفاة أبيه وبعد هجرته إلى مكة كي يشهد بذلك سياق الآيات التي وردت في اخرها الأية المذكورة ، وعلى ذلك فيبني أن يكون التبين المذكور في آية الاستغفار إنما كان بعد وفاة أبيه أيضا وكان ذلك بإعلام الله تعالى إياه .

وقد أخرج ابن أبي حاتم بسند صحيح كما قال السيوطي في " الفتاوى " (٤١٩/٢) عن ابن عباس قال : ما زال أبراهيم يستغفر لأبيه حتى مات فلما مات تبين له أنه عدو الله فلم يستغفر له " .

[٢٢٣] اخرجه النسائي (٢٨/١١) والترمذي (١٢٠/٤) وحسنه ابن جرير (٢٨/١١)، والحاكم (٣٣٥/٢)وأحمد (١٠٨٥،٧٧١) والسياق له وإسناده حسن " وقال الحاكم "صحيح الاسناد" .ووافقه الذهبي .

في هذا الحديث أن سبب نزول الأية غير السبب المذكور في الحديث الذي قبله ، ولا تعارض بينهما لجواز تعدد سبب النزول كما وقع ذلك في غير آية ، وقد أيد هذا الحافظ في " الفتح " ( ٨ / ٤١٢ ) .

ئەوە نیە پێغەمبەر ( إبراهیم ) داوای لێخۆشبوونی كردووە بۆ باوكی بێ باوەڕی ؟ دەڵێت : ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە ؟! لەو كاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴾ .

پێشەوا ( النووي ) . بـه ڕەحمەت بێت . لـە ( المجموع : ٥ / ١٤٤ ، ٢٥٨ ) دا فـەرموویەتی : (( الصلاة على الكافر ، والدعاء له بالمغفرة حرام ، بنص القرآن والإجماع )) [٢٢٤] .

واتە : نوێژكردن لـە سەر بێ باوەڕ ، و پاڕانەوە بۆی بە لێخۆش بوون حەرام و قەدەغەیە بە دەقی قورئانی پیرۆز و كۆڕای زانایان .

٦١ ـ وە كردنی نوێژی مردوو بە جەماعەت واجب و پێویستە ، هەر وەكو چۆن لە نوێژەكانی تردا واجب و پێویستە ، بە بەڵگەی :

یەكەم : بەردەوام بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەر ئەنجامدانی ئەم نوێژە بە جەماعەت .

دووەم : ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێدا فەرموویەتی : " صلوا كمـا رأيتمـوني أصلي " [٢٢٥] .

(( ولا يعكر على ما ذكرنا صلاة الصحابة على النبي ﷺ فرادى لم يؤمهم أحد ، لأنها قضية خاصـة ، لا يدرى وجهها ، فلا يجوز من أجلها أن نترك ما واضب عليه ﷺ طيلة حياته المباركة ، لا سيما والقضية المذكورة لم ترد بإسناد صحيح تقوم به الحجة ، وإن كانت رويت من طرق يقوي بعضها [٢٢٦] فإن أمكن الجمع بينها وبين ما ذكرنا من هديه ﷺ في التجميع في الجنازة فبها ، وإلا فهديه هو المقدم " لأنه أثبت وأهدى )) .

---

[٢٢٤] قلت : ومن ذلك تعلم خطأ بعض المسلمين اليوم من الترحم والترضي على بعض الكفار ويكثر ذلك من بعض أصـحاب الجرائـد والمجلات ، ولقد سمعت أحد رؤساء العرب المعروفين بالتدين يترحم على ( ستالين ) الشيوعي الذي هو ومذهبه من أشد والد الاعداء على الدين ! وذلك في كلمة ألقاها الرئيس المشار إليه بمناسبة وفاة المذكور ، أذيعت بالراديو ! ولا عجب من هذا هذا فقد يخفى على مثل هـذا الحكـم ، ولكن العجب من بعض الدعاة الاسلاميين أن في مثل ذلك حيث قال في رسالة له : " رحم الله برناردشو ... " . وأخبرني بعض الثقات عن أحد المشايخ أنه كان يصلي على من مات من الاسماعيلية مع اعتقاده أنهم غير مسلمين . لأنهم لا يرون الصلاة ولا الحج ويبدون البشر ! ومع ذلك يصلي عليهم نفاقا ومداهنة لهم . فإلى الله المشتكي وهو المستعان .

[٢٢٥] أخرجه البخاري .

[٢٢٦] أخرج البيهقي في سننه ( ٤ / ٣٠ ) منها حديثين ، وأحدهما عن ابن ماجه ( ١ / ٤٩٨ ، ٥٠٠ ) ، وروى أحمد ( ٥ / ٨١ ) حديثا ثالثا وسكت عليه الحافظ في " التلخيص " ( ٥ / ١٨٧ ) ، ورجاله ثقات رجال مسلم غير أبي عسيم ، قال البغوي : " لا أدري له صحبة أم لا " ، وفي الباب أحاديث إخرى ، أخرجها الحاظ في الباب المذكور ثم قال : " قال ابن دحية : الصحيح أن المسلمين صلوا عليه أفرادا ، لا يؤمهم أحد ، وبه جزم الشافعي ، قال : وذلك لعظم رسول الله ﷺ ـ بأبي هو وامي ـ وتنافسهم في أن لا يتولى الامامة في الصلاة عليه واحد والله أعلم .

وە پێشەوا ( النـــووي ) یش ئەو زیادەیـەی كـردووە بـە بەڵگـە بـۆ سوننەتیەتی خوێندنـەوەی سورەتێكی كورت ، بەڵام لە فەرموودەكە هیچ بەڵگەیەك نیە لە سەر كورتێتی سورەتەكە ، لەوانەشە بەڵگەی ئەوەش ئەوە بێت كە لە پێشدا باسكرا ، كە باس لە پەلەكردن دەكات لە بەرێكردنی جەنازە بۆ گۆڕەكەی ، خوای پەروەردگاریش زاناترە .

٧٩ ـ وە بەبێ دەنگی دەیخوێنێتەوە ، لە بەر فەرموودەی ( أبو أمامــة ) ەی كـوڕی ( ســـهل ) كـە فەرموویـەتی : " السنة في الصلاة على الجنازة : أن يقرأ في التكبيرة الأولى بأم القرآن مخافتة ، ثم يكبر ثلاثــا ، والتسليم عند الآخرة " [٢٦٧] .

واتـە : شێوازی سوننەتی لـە نـوێژی جەنازەدا ئـەوەیـە كـە : دوای تەكبیرەی ئیحرام سـورەتی ( الفاتحة = أم القــرآن ) بـە بـێ دەنگـی بخوێندرێتـەوە ، پاشـان سـێ تـەكبیرەی تـر بكـات ، لـە دوای تەكبیرەی كۆتاییشیان سەلام بدرێتەوە .

٨٠ ـ پاشـان ( الله أكـــبر ) دەكـات ، و پاشـان صـەڵاوات دەدات لـە سـەر پێغەمبـەر ﷺ لـە بـەر

---

وهي مطلقة لا يمكن اشتراط ذلك الشرط فيها أيضا ! وعندهم عجيبة أخرى ! وهي قولهم " أن قراء سبحانك – بعد التكبيرة الاولى من ســـنن الصلاة على الجنازة " ! مع أنه لا أصل لذلك في السنة كما تقدم التنبيه على ذلك في الحاشية ( ص ١١٩ ) ، فقد جمعوا بين إثبات مالا أصل له في السنة وإنكار مشروعية ما ورد فيها ! ! فإن قلت : قد قال المحقق ابن الهمام في " فتح القدير " ( ١ / ٤٥٩ ) : " قالوا : لا يقرأ الفاتحة ، إلا أن يقرأها بنية الثناء ، ولم تثبت القراءة عن رسول الله ﷺ " . فأقول : وهذا القول من مثل هذا المحقق أعجب من كل ما سبق ، فـإن ثبـوت القراءة عنه ﷺ مما لا يخفى على مثله مع وروده في " صحيح البخاري " وغيره مما سبق بيانه ، ولذلك فإنه يغلب على الظن أنه يشير بذلك إلى أن الحديث لا ينهض دليلا على إثبات القراءة لقوله فيه " سنة " بناء على الخلاف الذي سبق أن ذكرناه ، فإن كان الامر كما فهـــذه عجيبـــة أخرى ، فإن مذهبه أو قول الصحابي سنة في حكم المسند المرفوع إلى النبي ﷺ ، كما تقدم نقله من كتابه " التحير " ، وقد جروا على ذلك في فروعهم ، فخذ مثلا على ذلك المسألة الاتية . قال في " الهداية " . " إذا حملوا الميت على السرير أخذوا بقوائمه الاربعة ، بذلك وردت السنة ، وقال الشافعي : السنة أن فقال ابن الهمام في صدد الرد على ما نسبوه إلى الشافعي :

" قد صح عن رسول الله ﷺ خلاف ما ذهبوا إليه " . ثم ساق من طريق أبي عبيدة عن أبيه عبد الله بن مسعود قال : " من اتبع الجنـــازة فليأخذ بجوانب السرير كلها فإنه من السنة " . رواه ابن ماجه ( ١ / ٤٥١ ) والبيهقي ( ٤ ١٩ – ٢٠ ) ، قال ابن همام : " فوجب الحكم بأن هذا هو السنة ، وإن خلافه إن تحقق من بعض السلف فلعارض " . فانظر كيف جعل قول ابن مسعود " من السنة " في حكم المرفوع ، ولم يجعل قول ابن عباس كذلك ! فهل مصدر هذا التناقض السهو أم التعصب للمذهب عفانا الله منه ؟ ! وهذا على فرض صحة ذلك عن ابن مسعود ، فكيف وهو غير صحيح ، لانه منقطع ، أبو عبيدة لم يدرك أباه كما في " الجوهر النقي " للتركماني الحنفي ولذلك أعرضت عن إيراد هذه السنة المزعومة في كتابنا هذا ، كما أعرضنا عن مقابلها المنسوب للشافعي لعدم وروده .

ثم إن الزيادة الاولى في الحديث قد رواها أبو يعلى ايضا في " مسنده " كما في " المجموع " للنووي (٢٣٤/٥) وقال : " إسناده صـــحيح ".وأقره الحافظ في " التلخيص "(١٦٥/٥) .

[٢٦٧] خرجه النسائي وغيره بسند صحيح كما تقدم في المسألة (٧٤) الحديث الخامس من الفقرة (أ) ، (١١١) .

فەرموودەی ( أبو أمامة ) ە كە لە پێشدا باس كرا كە تێدا هاتووە كە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان ڕاگەیاند بوو كە : " أن السنة في الصلاة على الجنازة أن يكبر الإمـام ، ثم يقـرأ بفاتحـة الكتاب بعد التكبيرة الأولى سرا في نفسه ، ثم يصلي على النبي ﷺ ، ويخلص الـدعاء للجنـازة في التكبيرات ( الثلاث ) ، لا يقرأ في شيء منهم ، ثم يسلم سرا في نفسه ( حين ينصرف ( عن يمينه ) ، والسنـة أن يفعـل من وراءه مثلمـا فعل إمامـه " [٢٦٨] .

واتە : شێوازی سوننەتی لە نوێژی جەنازەدا ئەوەیە كە : پێشنوێژ تەكبیرەی ئیحرامی لە سەر بكات ، پاشان سورەتی ( الفاتحـة ) دوای تەكبیرەی یەكەم بخوێنێت ، بە بێ دەنگی و بۆ خۆی بخوێنێتەوە ، پاشان صەڵاوات بدات لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، پاشان لە سێ تەكبیرەكەی تردا بۆ مردووەكە بپاڕێتەوە ، بێ ئەوەی كە هیچ قورئانێكیان لە نێواندا بخوێنێتەوە ، پاشان بە بێ دەنگی لە دوای تەكبیرەی كۆتاییشدا سەلام دەداتەوە بەلای ڕاستدا لەو كاتەی كە لە نوێژەكەی دەبێتەوە ، سوننەتیش ئەوەیە كە ئەوانەی بە دوایدا نوێژ دەكەن هەروەكو ئەوە بكەن كە پێشنوێژەكەیان كردوویەتی .

وە سەبارەت بە شێوازی صەڵاوات دانەكە لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەنازەدا ، هیچ شێوازێكی دیای كراوم نەبینیوە لە هیچێك لە فەرموودە ( صـحیح ) ەكاندا [٢٦٩] ، واش دەردەكەوێت كە نوێژی جەنازە شێوازێكی تایبەتی نەبێت ، بەڵكو یەكێك لەو شێوازانەی تێدا دەووترێت كە لە نوێژە فەرزەكاندا جێگیر ، و سەلمێنراوە [٢٧٠] .

٨١ ـ پاشان ( الله أكبر ) ەكانی تر دەكات ، لە نێوانیانیشدا بۆ مردووەكە دەپاڕێتەوە ، لە بەر

---

[٢٦٨] أخرجه الشافعي في" الام (١/٢٣٩-٢٤٠) ومن طريقه البيهقي(٤/٣٩)وابن الجارود(٢٦٥)عن الزهري عن أبي أمامة وقال الزهري في آخره : " حدثني محمد الفهري عن الضحاك بن قيس أنه قال مثل قول أبي أمامة " . قال الشافعي رحمه الله:" وأصحاب النبي ﷺ لا يقـولن بالسنة والحق إلا لسنة رسول الله ﷺ إن شاء الله تعالى". وأخرجه الحاكم (١/٣٦٠) وعنه البيهقي إلا أنه قال :" أخبرني رجال من أصـحاب النبي ﷺ " . والباقي نحوه ، وفيه الزيادتان . وزاد في إسناده الثاني " حبيب بن مسلمة " كما تقدم في رواية الطحاوي في المسألة المشار إليه آنفا (٧٤) .

ثم زاد الحاكم :" قال الزهري :حدثني بذلك أبو أمامة وابن المسيب يسمع فلم ينكر ذلك عليه " وقال : " صحيح على شـرط الـشيخين "ووافقه الذهبي وهو كما قالا . وظاهر قوله بعد أن ذكر القراءة " ثم يصلي على النبي ﷺ إنما تكون بعد التكبيرة الثانية لاقبلها ، لانه لو كان ها لم تقع في التكبيرات بل قبلها ، كما هو واضح ، وبه قالت الحنفية والشافعية وغيرهم ، خلافا لابن حزم ( ٥/١٢٩) والشوكاني ( ٣/٥٣) .

[٢٦٩] روى عن ابن مسعود صيغة قريبة من الصلاة الابراهيمية ، لكن سندها ضعيف جدا ، فلا يشتغل به ، وقد ساقها السخاوي في " القول البديع " ص ( ١٥٣ - ١٥٤ ) وابن القيم في " جلاء الافهام " ، وقال ( ٢٥٥ ) : " فالمستحب أن يصلي عليه ﷺ في الجنازة كمـا يـصلي عليه في التشهد لان النبي ﷺ علم ذلك أصحابه لما سألوه عن كيفية الصلاة عليه " .

[٢٧٠] وهي سبع صيغ أوردها في " صفة صلاة النبي ﷺ " . وقد طبعه المكتب الاسلامي ، الطبعة الثالثة وفيها زيادات هامة . ثم طبع الطبعة الرابعة .

فەرموودەی پێشووی ( أبو أمامة ) كە پێش كەمێك باس كرا ، لە گەڵ ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی : " إذا صليتم على الميت ، فأخلصوا له الدعاء " [٢٧١] ، واتە : ئەگەر نوێژتان لە سەر مردوو كرد ، لە نێوان تەكبیرەكاندا بۆ مردووەكە بپاڕێنەوە .

٨٢ ـ وە تیایاندا دەپاڕێتەوە بەو پاڕانەوەی كە جێگر و سەلمێنراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ( ... ) دەیفەرموو : " اللهم اغفر له وارحمه ، وعافه واعف عنه ، وأكرم نزله ، ووسع مدخله ، واغسله بالماء والثلج والبرد ، ونقه من الخطايا كما نقيت ( وفي رواية : كما ينقي الثوب الأبيض من الدنس ، وأبدله دارا خيرا من داره ، وأهلا خيرا من أهله ، وزوجا ( وفي رواية : زوجة ) خيرا من زوجه ، وأدخله الجنة ، وأعذه من عذاب القبر ،ومن عذاب النار ، قال : فتمنيت أن أكون أنا ذلك الميت" [٢٧٢] .

دووەم : لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : كە پێغەمبەری خوا ﷺ : كە نوێژی لە سەر جەنازەیەك بكردایە دەیفەرموو " اللهم اغفر لحينا وميتنا ، وشاهدنا وغائبنا ، وصغيرنا وكبيرنا ، وذكرنا وأنثانا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الاسلام ، ومن توفيته منا فتوفه على الايمان ، اللهم لا تحرمنا أجره ، ولا تضلنا بعده " [٢٧٣] .

---

[٢٧١] أخرجه أبو داود (٢/٦٨) وابن ماجه (١/٤٥٦)وابن حبان في " صحيحه " و (٧٥٤-موارد) والبيهقي (٤/٤٠) من حديث أبي هريرة وصرح ابن اسحاق بالتحديث عند ابن حبان .

قال السندي : أي خصوه بالدعاء ، وقال المناوي : " إي ادعوا له بإخلاص وحضور قلب ، لان المقصود بهذه الصلاة إنما هو الاستغفار والشفاعة للميت ، وإنما يرجي قبولها عند توفر الاخلاص والابتهال ، ولهذا شرع في الصلاة عليه من الدعاء ما لم يشرع مثله في الدعاء للحي ، قال ابن القيم : هذا يبطل قول من زعم أن الميت لا ينتفع بالدعاء " . قلت : وفي رواية الحاكم من حديث أبي أمامة المتقدم " ويخلص الصلاة في التكبيرات الثلاث " فالصلاة هنا بمعنى الدعاء بدليل الرواية الاولى " ويخلص الدعاء " لان أصل معنى الصلاة في اللغة الدعاء ، فمن غرائب التفسير ما في " القول البديع " ( ص ١٥٢ ) " ويخلص الصلاة أي يرفع صوته في صلاته بالتكبيرات الثلاث " .

[٢٧٢] أخرجه مسلم (٣/٥٩-٦٠) والنسائي (١/٢٧١) وابن ماجه (١/٤٢٥٦) وابن الجارود (٢٦٤- ٢٦٥) والبيهقي (٤/٤٠) والطيالسي (٩٩٩) وأحمد (٦/٢٣و٢٨) والسياق لمسلم ، والرواية الثانية له في رواية ، وهي لسائرهم إلا أحمد ، وله والبيهقي الرواية الثالثة .

وفي رواية ابن ماجه والطيالسي أن الميت كان رجلا من الانصار،لكن في سندها فرج بن فضالة وهو ضعيف عن عصمة بن راشد وهو مجهول .

والحديث أخرجه الترمذي (٢/١٤١) مختصرا وقال : " حديث حسن صحيح ، وقال محمد بن اسماعيل - يعني البخاري - أصح شيء في هذا الباب هذا الحديث " .

[٢٧٣] أخرجه ابن ماجه (١/٤٥٦) والبيهقي (٤/٤١) من طريق محمد بن إبراهيم التيمي عن أبي سلمة عنه .

وأبو داود (٢/٦٨) والترمذي (٢/١٤١) وابن حبان في صحيحه (٧٥٧-موارد) والحاكم (١/ ٣٥٨) والبيهقي أيضا وأحمد (٢/٣٦٨)من طريق يحيى بن أبي كثير عن أبي سلمة به نحوه ، دون قوله " اللهم لا تحرمنا... " فهي عند أبي داود وحده ،وصرح يحيى بالتحديث عند الحاكم ثم قال : " صحيح على شرط الشيخين ".ووافقه الذهبي ، وهو كما قالا،وأعل بما لا يقدح .

وليحيى فيه إسناد ان آخران ،عند أحمد (٤/١٧٠،٣٠٨) والبيهقي . وللحديث شاهد من حديث ابن عباس نحوه . رواه الطبراني في " الكبير " .

**سێیەم : لە ( واثلة ) ی كوڕی ( الأسقع ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی : جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر پیاوێكی موسڵماندا كرد گوێم لێ بوو دەیفەرموو :** " اللهم إن فلان ابن فلان في ذمتك وحبل جوارك ، فقه فتنة القبر ، وعذاب النار ، وأنت أهل الوفاء والحق ، فاغفر له وارحمه ، إنك الغفور الرحيم " (٢٧٤) .

**چوارەم : لە ( يزيد ) ی كوڕی ( ركانة ) ەی كوڕی ( المطلب ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ كە هەڵبسایە بۆ نوێژكردن لە سەر جەنازەیەك ( تەرمێك ) دەیفەرموو :** " اللهم عبدك وابن أمتك احتاج إلى رحمتك ، وأنت غني عن عذابه ، إن كان محسنا فزد في حسناته ، إن كان مسيئا فتجاوز عنه " ثم يدعوا ما شاء الله أن يدعو " (٢٧٥) .

**٨٣ - پاڕانەوە لە نێوان ( الله أكبر ) ی كۆتایی ، و سەلامدانەوە ڕێپێدراوە لە شەرعدا ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی ( أبو يعفور ) لە ( عبدالله ) ی كوڕی ( أبو أوفى ) وە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت :** " شهدته وكبر على جنازة أربعا ، ثم قام ساعة ـ يعني ـ يدعوا ، ثم قال : أتروني كنت أكبر خمسا ؟ قالوا : لا ، قال : إن رسول الله ﷺ كان يكبر أربعا " (٢٧٦) .

---

(٢٧٤) أخرجه أبو داود(٦٨/٢)وابن ماجه (٤٥٦/١) وابن حبان في صحيحه (٧٥٨) وأحمد(٤٧١/٣) بإسناد صحيح إن شاء الله تعالى ،وقد أورده ابن القيم فيما حفظ من دعائه ﷺ ، وسكت عليه النووي في " المجموع " .

(٢٧٥) أخرجه الحاكم (٣٥٩/١) وقال : "إسناده صحيح ،ويزيد بن ركانة وأبو ركانة صحابيان ".ووافقه الذهبي ، ورواه الطبراني في " الكبير" بالزيادة كما في " المجمع "(٣٤/٣٣/٤)وابن قانع كما في " الاصابة ".

وله شاهد من طريق سعيد المقبري أنه سأل أبا هريرة :كيف تصلي على الجنازة فقال : أنا لعمر الله اخبرك ،أتبعها من أهلها ،فإذا وضعت كبرت وحمدت الله ،وصليت على نبيه ،ثم اقول: اللهم إنه عبدك وابن عبدك وابن أمتك:كان يشهد أن لا إله ألا أنت،وأن محمدا عبدك ورسولك، وأنت أعلم به ،اللهم إن كان محسنا فزد في حسناته،وإن كان مسيئا فتجاوز عن سيئاته ،اللهم لا تحرمنا أجرة،ولا تفتنا بعده " ( أخرجه مالك(١-٢٢٧)وعنه محمد بن الحسن(١٦٤-١٦٥) وإسماعيل القاضي في " فضل الصلاة ﷺ " رقم ٥ (٩٣) ٢٧وسنده موقوف صحيح جدا ، وقد ساق الهيثمي منه الدعاء مرفوعا من حديث أبي هريرة وقال :رواه أبو يعلى ورجاله ورجال الصحيح " . وقد تقدم بلفظ آخر فيه الجملة الاخيرة منه ،وهو النوع( الثاني ) ( ص ١٢٤ ).

(٢٧٦) أخرجه البيهقي (٤-٣٥) بسند صحيح. ثم أخرجه هو (٤٢،٤٣/٤) وابن ماجة (٤٥٧/١)والحاكم (١/ ٣٦٠) وأحمد (٤-٣٨٣) من طريق إبراهيم الهجري عن ابن أبي أوفي به ، إلا أنه أنه رفعه إلى النبي ﷺ ( ، وزاد بعد قوله:إن رسول الله ﷺ كان يكبر أربعا : ثم يمكث ساعة فيقول ما شاء الله أن يقول ، ثم سلم " وقال الحاكم :

" هذا حديث صحيح ، وابراهيم لم ينقه عليه بحجة " . قلت : بلي ، ولذلك تعقبه الذهبي بقوله : قلت ضعفوا ابراهيم " .

قلت : وذلك لسوء حفظه ، وقد أشار إلى ذلك الحافظ بقوله في " التقريب " لين الحديث ، رفع موقوفات " .

فوائد : الاولى : قال الحافظ في " التلخيص " ( ١٨٢٥ ) : " قال بعض العلماء اختلاف الاحاديث في الدعاء على الجنازة محمول على أنه كان يدعو على ميت بدعاء ، وعلى آخر بغيره ، والذي أمر به أصل الدعاء " . الثانية : قال الشوكاني في " نيل الاوطار " ( ٤ ٥٥ ) : " إذا

واتە : ( عبدالله ) ی كوڕی ( أبو أوفى ) بینی چوار تەكبیرەی لە سەر جەنازەیەك كرد ، پاشان چەند ساتێك وەستا . واتە : بۆی دەپاڕایەوە . پاشان وتی : ئایا واتان دەزانی پێنج تەكبیرەی لە سەر دەكەم ؟ وتیان : نەخێر ، ئەویش وتی : پێغەمبەری خوا ﷺ چوار تەكبیرەی دەكرد .

٨٤ - پاشان دوو سەلام دەتاوە هەروەكو سەلامدانەوەی لە نوێژە فەرزەكاندا ، یەكێكیان بەلای ڕاستیدا ، و ئەویتریان بەلای چەپدا ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی ( عبد الله ) ی كوڕی ( مسعود ) ﷺ كە فەرموویەتی : " ثلاث خلال كان رسول الله ﷺ يفعلهن تركهن الناس ، إحداهن التسليم على الجنـــازة مثل التسليم في الصلاة " [٢٧٧] .

---

كان المصلي عليه طفلا استحب أن يقول المصلي : اللهم اجعله لنا سلفا وفرطا وأجرا ، روى ذلك البيهقي من حديث أبي هريرة ، وروى مثله سفيان في " الجامعة " عن الحسن " .

قلت : حديث أبي هريرة عند البيهقي إسناده حسن ، ولا بأس في العمل به في مثل هذا الموضع ، وإن كان موقوفا ، إذا لم يتخذ سنه ، بحيث يؤدي ذلك الى الظن إنه عن النبي ﷺ ، والذي أختاره أن يدعو في الصلاة على الطفل بالنوع ( الثاني ) لقوله فيه : " وصغيرنا . . . اللهم لا تحرمنا أجره ، ولا تضلنا بعده " . وقد ذهب الامام أحمد إلى استحباب الدعاء في هذا الموطن ، كما رواه أبو داود في " المسائل " ( ١٥٣ ) عنه ، وهو مذهب الشافعية ، واستدل لهم النووي في " المجموع " ( ٥/ ٢٣٩ ) بحديث الهجري المذكور أعلاه ، ، والاستدلال بما قبله أقوى ، وهو حجة على الحنفية حيث قالوا : " ثم يكبر الرابعة ويسلم من غير ذكر بينهما " . الثالثة : وذهبت الشافعية أيضا الى وجوب مطلــق الــدعاء ، للميت لحديث أبي هريرة المتقدم : " . . فأخلصوا له الدعاء " . وهذا حق ، ولكنهم خصوه بالتكبيرة الثالثة واعترف النووي بانه مجرد دعوى فقال ( ٥ / ٢٣٦ ) : " ومحل هذا الدعا التكبيرة الثالثة ، وهو واجب فيها ، لا يجزي في غيرها بلا خلاف ، وليس لتخصيصه بها دليل واضح ، واتفقوا على أنه لا يتعين لها دعاء " . قلت : لكن إيثار ما تقدم من أدعيته ﷺ على ما استحسنه بعض الناس ، مما لا ينبغي أن يتردد فيه مسلم ، فان خير الهدى هدى محمد ﷺ . ولذلك قال الشوكاني ( ٤ / ٥٥ ) : " واعلم أنه قد وقع في كتب الفقه ذكر أدعيه غير المأثورة عنه ﷺ والتمسك بالثابت عنه أولى " . قلت : بل اعتقد أنه واجب على من كان على علم بما ورد عنه ﷺ ، فالعدول عنه حينئذ يخشي أن يحق فيــه قول الله تبارك وتعالى : ( أتستبدلون الذي هو ادني بالذي هو خير ) .

[٢٧٧] أخرجه البيهقي (٤٣/٤) بإسناد حسن ، وقال النووي (٢٣٩/٥) :"إسناد جيد" وفي " مجمع الزوائد " (٣٤/٣): " رواه الطبراني في " الكبير "ورجاله ثقات" .

وللحديث شاهد، يرويه شريك عن إبراهيم الهجري قال: "أمنا عبد الله بن أبي أوفى على جنازة ابنته فمكث ساعة، حتى ظننا أنه سيكبر خمسا ثم سلم عن يمينه وعن شماله،فلما انصرف قلنا له : ما هذا ؟ قال : إني لاأزيدكم على مارأيت رسول الله ﷺ يصنع ، أو هكذا صنع رسول الله ﷺ . أخرجه البيهقي (٤٣/٤) وسنده ضعيف من أجل الهجري كم تقدم في المسألة السابقة وقد صح عنه من طريق أخرى بعضه مرفوعـــا ، وبعضه موقوفا ، كما ذكرنا هناك ، وروى أحمد في " مسائل أبي داود عنه " (١٥٣)عن عطاء بن السائب قال :

" رأيت ابن أبي أوفى صلى على جنازة فسلم تسليمة (واحدة) " لكن إسناده ضعيف فيه أبو وكيع الجراح بن مليح،وهو يضعيف واتهمــه بعضهم . وقد ذهب لى التسليمتين الحنفية كما في " المبسوط " (٦٥/٢)،أحمد في رواية عنه كما في " الانصاف "(٥٢٥/٢) (ومن المبالغات قول ابن المبارك : " من سلم على الجنازة بتسليمتين فهو جاهل جاهل . رواه أبو داود في " المسائل " (١٥٤) بسند صحيح عنه) والشافعية كما في " شرح ابن قاسم الغزي " (٤٣١/١–باجوري) وقال:" لكن يستحب زيادة ورحمه الله وبركاته" .

**واتـە : سێ سیفـەت و ڕەوشـت هـەن پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەنجامی دەدان ، خەڵكی ئێستا ئەنجامیان نادەن ، یەكێكیان سەلامدانەوەیە لە سەر جەنازە هەروەكو چۆن سەلامی نوێژ دەدرێتەوە .**

**٨٥ ـ وە دەشتوانرێت تەنها سەلامی یەكەم بدرێتەوە ، لە بەر فەرموودەكەی ( أبو هريرة ) ﷺ كە فەرموویەتی : " أن رسول الله ﷺ صلى على جنازة ، فكبر عليها أربعا ، وسلم تسليمة واحـدة " [٢٧٨] ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە سەر جەنازەیەك كرد ، و چوار تەكبیرەی لـە سـەر دەكرد ، و پاشان یەك سەلامی دایەوە .**

**٨٦ ــ وە سوننەت وایە سەلامدانوەكە بە بێ دەنگی بێت ، پێشنوێژ و شوێنكەوتوانی لەو كردارەدا یەكسان و وەك یەكن ، ئەوەش لـە بەر فەرموودەی ( أبو أمامـة ) كە لـە پێشدا باسكرا لـە بابەتەكدا ، بە گوێ : " ثم يسلم سرا في نفســـه حين ينصرف ، والسنـــة أن يفعــل من وراءه مثلمــــا فعــل إمامــــة " [٢٧٩] .**

---

وقد ثبت في " صحيح مسلم " وغيره عن ابن مسعود أن النبي ﷺ كان يسلم تسليمتين في الصلاة ، فهذا يبين أن المراد بقوله في الحـديث الاول :" مثل التسليم في الصلاة " أي التسليمتين المعهودتين .ويحتمل أنه يعني بالاضافة إلى ذلك أنه كان يسلم تسليمة واحدة أيضا ، بالنظر إلى أن ذلك كان من سنته ﷺ في الصلاة أيضا ،أي أنه ﷺ كان تارة يسلم تسليمتين وتارة تسليمة واحدة لكن الاول أكثر ،غير أن هذا الاحتمال فيه بعد لان التسليمة الواحدة وإن كانت ثابتة عنه ، ﷺ لكن لم يروها ابن مسعود فلا يظهر أنها تدخل في قوله المذكور " مثـل التسـليم في الصلاة ". والله أعلم .

[٢٧٨] أخرجه الدار قطني (١٩١) والحاكم ( ١/٣٦٠) وعنه البيهقي (٤/٤٣) من طريق أبي العنبس عن أبيه عنه .

قلت : واسناده حسن كما بينته في " التعليقات الجياد " .

ويشهد له مرسل عطاء بن السائب أن رسول الله ﷺ سلم على الجنازة تسليمة واحدة .

أخرجه البيهقي معلقا. ويقويه عمل جماعة من الصحابة به،فقد قال الحاكم عقبه:" قد صحت الرواية فيه عن علي بن أبي طالب، وعبد الله بن عمر، وعبد الله ابن عباس،وجابر بن عبد الله،وعبد الله،وعبد الله بن أبي أوفى،وأبي هريرة أنهم كانوا يسلمون على الجنازة تسليمه واحدة " .

قلت : وقد وافقه الذهبي،وأسند البيهقي غالب هذه الاثار،وزاد فيهم "واثلة ابن الاسقع وأبي إمامة وغيرهم ".وفي اطلاق الصحة على رواية ابن أبي إوفى نظر عندي ، لان في سندها الجراح بن مليح وهو ضعيف كما سبق قريبا ،إلا أن يكون وقع للحاكم من طريق أخرى ، وذلك مما لا أظنه ، وإلى هذه الاثار ذهب الامام أحمد في المشهور عنه ، وقال أبو داود (١٥٣) : " سمعت أحمد سئل عن التسليم على الجنازة ؟ قال : هكذا ، ولوى عنقه عن يمينه ( وقال : السلام عليكم ورحمة الله ) " . قلت وزيادة " وبركاته " في هذه التسليمة مشروعة خلافا لبعضهم،لثبوتها في بعض طرق حديث ابن مسعود المتقدم في التسليمتين في الفريضة ، ومثلها في هذه المسألة صلاة الجنازة كما سبق،وذكر ابن قاسم الغزي في شرحه استحبابها هنا في التسليمتين ، ورد ذلك عليه الباجوري في حاشيته(١/٤٣١) فذهب إلى عدم مشروعيتها هنا ولا في الفريضة والصواب ما ذكرنا .

[٢٧٩] وله شاهد موقوف ، أخرج البيهقي (٤/٤٣) عن ابن عباس أنه :

" كان يسلم في الجنازة تسليمة خفية " . وإسناده حسن . ثم روى عن عبد الله بن عمر أنه :" كان إذا صلى على الجنائز يسلم حتى يسمع من يليه ".وإسناده صحيح .

واتە : پاشان بە بێ دەنگی و بۆ خۆی سەلام دەدایەوە ، لەو كاتەی كە لە نوێژەكەی دەبوویەوە ، وە سوننەتیش ئەوەیە كە ئەوانەی بە دوایدا نوێژ دەكەن وەكو پێشنوێژەكەیان بكەن .

٨٧ ـ وە دروستیش نیە نوێژ لە سەر مردوو بكرێت لەو سێ كاتەی كە درووست نیە نوێژیان تێدا بكرێت ، ئیللا بۆ زەرورەت نەبێت ، ئەوەش لە بەر فەرموودەی ( عقبة ) ەی كوڕی ( عامر ) رضي الله عنه كە دەفەرمووێت : " ثلاث ساعات كان رسول الله ﷺ ينهانا أن نصلي فيهن ، أو أن نقبر فيهن موتانا : حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع ، وحين يقوم قائم الظهرة حتى تميل الشمس ، وحين تضيف الشمس للغروب حتى تغرب " (٢٨٠) .

واتە : سێ كات هەن پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ دەكردین كە نوێژیان تێدا بكەین ، و مردووەكانمانی تێدا بنێژین ، كاتی خۆر دەرچوونی بەیانیدا تاكو خۆر بەرز دەبێتەوە ، وە لەو كاتەی كە خۆر دەكەوێتە ناوەڕاستی ئاسمان تاكو خۆر لە بەرەو ئاوا بوون لادەدات ، وە لەو كاتەی خۆری ئێواران بەرەو ئاوا بوون دەچێت .

---

قلت : وكأنه لاختلاف هذين الاثرين اختلفت اقوال الحنابلة في هذه المسألة ، فجاء في الانصاف ( ٥ / ٥٢٣ ) : " قال في " الفروع " : ظاهر كلام الاصحاب أن الامام يجهر بالتسليم ، وظاهر كلام ابن الجوزي أنه يسر " . ثم نقل عن " المذهب " و " مسبوك الذهب " ما يشهد لكلام ابن الجوزي . وهو الارجح لحديث أبي أمامة

(٢٨٠) اخرجه مسلم ( ٢ / ٢٠٨ ) وأبو عوانة في صحيحه ( ١ / ٣٦٨ ) وأبو داود ( ٢ / ٦٦ ) والنسائي ( ١ / ٢٨٣ ) والترمذي ( ٢ / ١٤٤ ) وصححه ، وابن ماجه ( ١ / ٤٦٣ ) والبيهقي ( ٤ / ٣٢ ) والطيالسي ( رقم ١٠٠١ ) وأحمد ( ٥ / ١٥٢ ) من طريق علي بن رباح عنه . وزاد البيهقي :

" قال : قلت لعقبة : أيدفن بالليل ؟ قال : نعم ، قد دفن أبو بكر بالليل ".وإسنادها صحيح . الحديث بعمومه يشمل الصلاة على الجنازة ، وهو الذي فهمه الصحابة فروي مالك في " الموطأ " ( ١ / ٢٢٨ ) ومن طريقه البيهقي عن محمد بن أبي حرملة أن زينب بنت أبي سلمة توفيت وطارق أمير المدينة ، فأتي بجنازتها بعد صلاة الصبح ، فوضعت بالبقيع قال : وكان طارق يغلس بالصبح ، قال ابن أبي حرملة:فسمعت عبد الله بن عمر يقول لاهلا إما أن تصلوا على جنازتكم الان،وإما أن تتركوها حتى ترتفع الشمس ، وسنده صحح على شرط الشيخين . ثم روى مالك عن ابن عمر قال : يصلى على الجنازة بعد العصر وبعد الصبح إذا صليتا لوقتهما . وسنده صحيح أيضا.وروى البيهقي بسند جيد عن ابن جريج أخبرني زياد أن عليا أخبره أن جنازة وضعت في مقبرة أهل البصرة حين اصفرت الشمس ، فلم يصل عليها حتى غربت الشمس:فأمر أبو برزة المنادي ينادي بالصلاة ثم أقامها ،فتقدم أبو برزة فصلى بهم المغرب،وفي الناس أنس بن مالك ، وأبو برزه من الانصار من أصحاب النبي ﷺ ، ثم صلوا على الجنازة . قال الخطابي في " المعالم " (٣٢٧/٤) ما ملخصه : واختلف الناس في جواز الصلاة على الجنازة والدفن في هذه الساعات الثلاث ، فذهب أكثر أهل العلم إلى كراهة الصلاة عليها في هذه الاوقات ، وهو قول عطاء والنخعي والاوزاعي والثوري وأصحاب الرأي وأحمد وإسحاق ، والشافعي يرى الصلاة والدفن أي ساعة من ليل أو نهار ، وقول الجماعة أولى لموافقته الحديث " .

قلت : ومنه تعلم أن دعوى النووي جواز هذه الصلاة بالاجماع ، وهم منه رحمه الله .

## ( ١٤ ) بەخاکسپاردن وپاشکۆکانی
## ( الدفن وتوابعه )

٨٨ ـ وە پێویستە مردوو بنێژرێ ئەگەرچی کافریش بێت ، لەو بارەشەوە دوو فەرمودەمان پێگەشتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ :

یەکەم : لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ( أبو طلحة ) ەی ( الأنصاري ) یان تیایە ﷺ ، و لێرەشدا گێڕەرەوەی باسەکە ئەوە ﷺ کە فەرموودەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە : " أن رسول الله ﷺ أمر يوم بدر بأربعة وعشرين رجلا من صناديد قريش ، [ فجروا بأرجلهم ] ، فقذفوا في طوى من أطواء بدر [٢٨١] ، خبيث مخبث [٢٨٢] [ بعضهم على بعض ] ، [ إلا ما كان من أمية بن خلف ، فإنه انتفخ في درعه فملأها ، فذهبوا يحركوه فتزايل [٢٨٣] فأقروه ، وألقوا عليه ماغيبه من التراب والحجارة ] ، وكان ﷺ إذا ظهر على قوم ، أقام بالعرصة [٢٨٤] ثلاث ليال ، فلما كان ببدر اليوم الثالث أمر براحلته فشد رحلها ، ثم مشى واتبعه أصحابه ، وقالوا : ما نرى ينطلق إلا لبعض حاجته ، حتى قام على شفة الرّكيّ [٢٨٥] ، فجعل يناديهم بأسمائهم وأسماء آبائهم [ وقد جيفوا ] : [ يا أبا جهل بن هشام ويا عتبة بن ربيعة ، ويا شيبة بن ربيعة، ويا وليد بن عتبة ] ، أيسركم أنكم أطعتم الله ورسوله ؟ فإنا قد وجدنا ما وعدنا ربنا حقا ، فهل وجدتم ما وعدكم ربكم حقا ؟ قال : [ فسمع عمر قول النبي ﷺ ] ، فقال : يا رسول الله ! ما تكلم من أجساد لا أرواح لها ، [ وهل يسمعون ؟ يقول الله عز وجل : ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ ﴾ ] ، فقال رسول الله ﷺ : والذي نفسي محمد بيده ، ما أنتم بأسمع لما أقول منهم ، [ والله ] [ إنهم الآن ليعلمون أن الذي كنت أقول لهم هو الحق ] ، ( وفي رواية ، إنهم الآن ليسمعون ) ، [ غير أنهم لا يستطيعون أن يردوا علي شيئا ] ، قال قتادة : أحياهم الله [ له ] حتى أسمعهم قوله ، توبيخا ، وتصغيرا ، ونقمة ، وحسرة ، وندما " [٢٨٦] .

---

[٢٨١] بەو بیرانە دەووترێت کە ناوەوەیان بە بەرد هەڵچنراوە ، بۆ ئەوەی نەخورمێنەوە ناوەوەی خۆیان .

[٢٨٢] حاشية السندي على ابن ماجه – (ج ١ / ص ٢٧٧) : (( قَوْله ( الْخَبِيث ) فِي نَفْسه ، الْمُخْبِث ، اِسْم فَاعِل مِنْ أَخْبَثَ اللَّازِم وَالْمُتَعَدِّي فِي الصِّحَاح أَخْبَثَهُ غَيْره عَلَّمَهُ الْخُبْث وَأَفْسَدَهُ وَأَخْبَثَ أَيْضًا أَيْ اِتَّخَذَ أَصْحَابًا خُبْثًا فَهُوَ خَبِيث مُخْبِث وَفِي النِّهَايَة الْخَبِيث ذُو الْخُبْث فِي نَفْسه وَالْمُخْبِث الَّذِي أَعْوَانه خُبَثَاء كَمَا يُقَال لِلَّذِي فَرَسه ضَعِيف مُضْعِف وَقِيلَ هُوَ الَّذِي يُعَلِّمهُمْ الْخُبْث وَيُوقِعهُمْ فِيهِ اِنْتَهَى )) .

[٢٨٣] واتە : ئەندامەکانی پارچە پارچە و لە یەك دەبوونەوە .

[٢٨٤] بە هەموو شوێنێکی فراوان دەوترێت کە خانوو بەرەی تێدا نەبێت .

[٢٨٥] واتە : لێواری بیرەکە .

[٢٨٦] قلت رواه جماعة من الصحابة ، وهذه رواية بعضهم ، وهم :

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی بەدردا فەرمانی كرد بە پەلەكێشكردنی بیست و چوار (٢٤) پیاو لە پیاو ماقوڵ و گەورە و سەركردەكانی قورەیش ، هاوەڵانی پێغەمبەری خواش ﷺ بەقاچەكانیان ڕاكێشیان كردن تاكو خرانە ناو یەكێك لە بیرە بە بەرد هەڵچنراوەكانی بەدرەوە ، ئەو دەروون پیس و پیسكراوانە لە لایەن جگە لە خۆیانەوە ، یان پیسكراو بە هەڵبژێنەرانی برادەر و هاوەڵی پیس ، هەر هەموویان دران بەسەر یەكدا ، تەنها ( أمية ) ەی كوڕی ( الخلف ) نەبێ كە لە پۆشاكە جەنگیەكەیدا ئاوسا بوو بە شێوەیەك پۆشاكەكەی پڕ كردبوو ، كاتێك هاوەڵان ڕۆشتن و جوڵاندیان پارچە پارچە دەبوو ، بۆیە وازیان لێ هێنا ، و بەخۆڵ و بەرد دایان پۆشی ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بەسەر هەر كۆمەڵێكدا سەربكەوتایە ، ئەوا سێ ڕۆژ لە شوێنێكی فراوان چۆڵەوانیدا دەمایەوە ، وە لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمدا . كە لە بەدر بوو . فەرمانی دا بەوەی كە وڵاخەكەی بۆ ئامادە بكرێت ، وپاشان بەڕێ كەوت و هاوەڵانیشی دوای دەكەوتن ، وە هاوەڵانی فەرموویان : وادەزانین بۆ ئیشێكی خۆی بڕوات ، تاكو گەیشتە قەراغی ئەو بیرەی كە كوژراوی بێباوەڕانی تێ فڕێدرا بوو ، بینیمان دەستی كرد بە بانگ كردنی سەركردەكانی قورەیش بە ناوی خۆیان و باوكیانەوە ، لە كاتێكدا كە تەنها بریتیبوون لە كەلاكە ؟!! ، دەیفەرموو : ئەی ( أبو جهل ) ی كوڕی ( هشام ) ، ئەی ( عتبة ) ی كوڕی ( ربيعة ) ، ئەی ( شيبة ) ی كوڕی ( ربيعة ) ، ئەی ( وليد ) ی كوڕی ( عتبة ) ، ئایا پێتان خۆشە كە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر تان بكردایە ﷺ ؟ ئەوەتا ئێمە بەڕاستی و ڕەوایی ئەوەمان بینییوە كە خوای پەروەردگار بەڵێنی پێ داین ، ئایا ئێوە بەڵێنەكانی

---

الأول : أبو طلحة الأنصاري ، يرويه قتادة قال : ذكر لنا أنس بن مالك عن أبي طلحة به . أخرجه البخاري (٧/٢٤٠-٢٤١) واللفظ له ومسلم (٨/١٦٤) وأحمد (٤/١٢٩) والزيادة الخامسة له ، وهي على شرط مسلم ، وأخرجه النسائي أيضا (١/٢٩٣) ، لكنه لم يذكر في سنده أبا طلحة ، وهو رواية لمسلم (٨/١٦٣) وأحمد (٣/٢١٩:١٨٢،١٤٥،١٠٤- ٢٨٧) وعنده الزيادة الأولى والسابعة ، وإسنادهما صحيح على شرط مسلم ، وعندهم ــ أعني الثلاثة ــ الزيادة الرابعة والخامسة ، إلا أنهم قالوا : " أمية بن خلف " بدل " وليد بن عتبة " وهو خطأ من بعض الرواة ، لان أمية لم يكن في البئر كما تدل عليه الزيادة الثانية ، وهي في حديث عائشة كما يأتي بسند حسن ، وعندهم أيضا الزيادة السادسة والعاشرة ، ولأحمد الحادية عشر .

الثاني : عمر بن الخطاب ، رواه عنه أنس أيضا بنحوه ، وفيه الزيادة الثانية . أخرجه مسلم والنسائي وأحمد (رقم١٨٢) .

الثالث : عبد الله بن عمر ، وله الرواية الثانية ، وفيه الزيادة التاسعة . أخرجه البخاري (٧/٢٤٢,٢٤٢-٢٤٣) وأحمد (رقم ٤٨٦٤،٤٩٥٨،٦١٤٥) وفي رواية له : " فذكر ذلك لعائشة ، فقالت : وهل - يعني ابن عمر - ، انما قال رسول الله ﷺ ، إنهم الان ... " وإسنادها حسن ، وفيها الزيادة الثانية أيضا كما تقدم . وأعلم أن العلماء صوبوا رواية ابن عمر ﷺ أن النبي ﷺ قال : " إنهم الان ليسمعون " ، وردوا قولها فيه " وهل " ، لانه مثبت وهي نافية ، ولانه لم يتفرد بذلك بل تابعة أبوه عمر وأبو طلحة كما تقدم ، وغيرهما كما في " الفتح " فراجعه إن شئت التفصيل . والحق أن ما رواه الجماعة صواب ، وما روته عائشة كذلك ، وكل ثقة ولا تناقض بين الروايتن ، فتضم إحداهما إلى الاخرى كما فعلنا في سياق الحديث . ثم أخرجه أحمد (٦/٢٧٦) وابن هشام في " السيرة " (٢/٧٤) بسند حسن ، وفيه الزيادة الثالثة .

خـوای پـەروەردگارتان بینـی ؟ ڕاوی دەڵێـت : ( عمـر ) گـوێی لـەم وتەیـەی پێغەمبـەر بـوو ﷺ ، فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چیە قسە لەگەڵ لاشەیێلێكدا دەكەی كە ڕۆحیـان تێدا نیە ؟! ئایا دەبیسن ؟! ئەوە نیە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى ﴾ ؟ پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمووی سوێند بەو خوایەی كە گیانی ( محمد ) ی بەدەستە ، ئێوە بیسەر تـر نین بـەوەی كە ئەوان دەیبیسن لە وتەكانی من ، سوێند بێت بەخوا ، ئێستا ئەوان باش دەزانن ئەوەی كەوا من پێیانم دەووت ڕاست و ڕەوان ، وە لـە ڕیوایـەتێكی تـردا دەفـەرمووێت : ئەوانـە ئیستا بـە باشـی دەبیسن ، بەڵام ناتوانن بەهیچ شێوەیەك وەڵامم بدەنەوە .

( قتادة ) ﷺ دەفەرمووێت : خودا زیندویانی كردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، وە وای لێ كردن كە گوێیان لە دەنگی بێت ، و بیبیستن ، ئەوەش بۆ سەرزەنشت كردن و بەكەم زانین و هینانی بـەڵا و خەفەت و پەشیمان بوونەوە بەسەریاندا .

دووەم : لە ( علي ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : " لما توفي أبو طالب ، أتيت النبي ﷺ فقلت : إن عمك الشيخ ( الضال ) قد مات ( فمن يواريه ؟ ) ، فقـال : اذهب فواره ، ثم لا تحدث شيئا حتى تأتيني : ( فقال : إنه مات مشركا ! [٢٨٧] ، فقال : إذهب فواره ) ، قال : فواريته ثم أتيته ، قال : إذهب فاغتسـل ثم لا تحدث شيئا حتى تأتيني ، قال : فاغتسلت ، ثم أتيته ، قـال : فـدعا لي بدعوات مـا يسرني أن لي بها حمر النعم وسودها . قال : وكان علي إذا غسل الميت اغتسل " [٢٨٨] .

---

[٢٨٧] هذا صريح في ان ابا طالب مات كافرا مشركا ، وفي الباب أحاديث كثيرة ، منها حديث سعيد بن حزن المتقدم في المسألة ( ٦٠ ) ، وقد قال الحافظ بن شرحه له : " ووقفت على جزء جمعه بعض أهل الرفض أكثر فيه من الاحاديث الواهية الدالة على إسلام أبي طالـب ، ولا يثبت من ذلك شيء ، وبالله التوفيق ، وقد لخصت ذلك في ترجمة أبي طالب من كتاب الاصابة " .

[٢٨٨] اخرجه احمد (رقم ٨٠٧) وابنه في زوائد " المسند " (رقم ١٠٧٤) من طريق أبي عبد الرحمن السلمي عنه . قلت : وسنده صحيح .

واخرجه أبو داود (٢/٧٠) والنسائي (١/٢٨٢-٢٨٣) والبيهقي (٣/٣٩٨) واحمد أيضا (رقم ٧٥٩) من طريق أبي إسحاق : سمعت ناجية بن كعب يحدث عن علي به نحوه . والزيادات لاحمد إلا الثانية فللنسائي .

وإسناده صحيح أيضا ،رجاله كلهم ثقات رجال الصحيحين غير ناجية بن كعب ، قال العجلي في " الثقات "٢ : " كوفي تابعي ثقة " . وقال الحافظ في " التقريب ": ثقة " . وأما قول النووي في " المجموع " ( ٥ / ١٨١ ) :

" رواه أبو داود وغيره ، وإسناده ضعيف " . فهو مردود ، ولا ندري وجهه إلا أن يريد أنه من رواية أبي إسحاق وهو السبيعي ، فإنه كان تغير لما كبر . فإن كان هذا ، فالجواب من وجهين :

الاول : أنه من رواية سفيان الثوري عنه ، وهو من أثبت الناس فيه ، كما في " التهذيب " .

الثاني : أنه لم يتفرد به ، بل جاء من الطريق الاولى كما سبق ، وكان النووي رحمه الله لم يقف عليها أو لم يستحضرها حين تكلم على الحديث ، ولعله اعتمد في تضعيفه على البيهقي ، فقد قال الحافظ في " التلخيص " (٥/١٤٩-١٥٠) بعد أن عزاه لاحمد وأبي داود والنسائي وابن أبي شيبة وأبي يعلى والبزار والبيهقي من طريق أبي إسحاق .. " ومدار كلام البيهقي على أنه ضعيف ، ولا يتبين وجه ضعفه ، وقد قال الرافعي انه

واتە : کاتێك کە ( أبو طالب ) کۆچی دوایی کرد هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ و پێم وت : مامە پیرە گومڕاکەت کۆچی دوایی کردووە کێ دەیخاتە گۆڕەوە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بڕۆ دایپۆشە و پاشان هیچ بەکەس مەڵێ تاکو دەگەڕێیتەوە بۆ لای خۆم ، ( علي ) ش ﷺ وتی : چۆن دایپۆشم ئەو بە موشرکی مردووە ! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بڕۆ دایپۆشە . ( علي ) ش ﷺ دەڵێت : دامپۆشی و هاتمەوە لای ، و پێی فەرمووم : بڕۆ خۆت بشۆ و هیچ شتێك بەکەس مەڵێ هەتا دێیتەوە بۆ لام ، دەڵێت : خۆم شوشت و گەڕامەوە بۆلای دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ هەندێك دوعا و پارانەوەی بۆ کردم پێم خۆش نەبوو بیگۆڕمەوە بە باشترین جۆری وشتر ( حمر النعم ) ، و ڕەشیشیان تیادا بێت ، ڕاوی دەڵێت : بۆیە ئەگەر عەلی ﷺ مردووی بشۆردایە پاشان خۆی دەشوشت .

٨٩ ـ موسوڵمانان لە گەڵ بێ باوەڕاندا بە خاك ناسپێردرێن ، بەڵکو موسوڵمان لە گۆڕستانی موسوڵمانان و بێ باوەڕانیش لە گۆڕستانی بێ باوەڕان ، و هاوبەش پەیداکەران دەنێژرێن ، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئاوا بووە و تاکو ئێستاش هەروایە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ( بشير ) ی کوڕی ( خصاصية ) کە دەفەرمووێت : " بنا أماشي رسول الله ﷺ ( آخذا بيده ) . فقال : يا ابن الخصاصية ما ( أصبحت ) تنقم على الله ؟ [٢٨٩] أصبحت تماشي رسول الله ( قال : أحسبه قال : آخذا بيده ) ، فقلت : ( يا رسول الله بأبي وأمي ) ما ( أصبحت ) أنقم على الله شيئا ، كل خير فعل بي الله ... فأتى على قبور المشركين فقال : لقد سبق هؤلاء بخير كثير ، وفي رواية : خيرا كثيرا ) ثلاث مرات ... ثم أتى على

---

حديث ثابت مشهور ، قال ذلك في أمالية " .

وعزاه في " الفتح " (١٥٤/٧) لابن خزيمة أيضا وابن الجارود .

فائدة : هذا الحديث أورده البيهقي في باب المسلم يغسل ذا قرابته من المشركين ويتبع جنازته ويدفنه ولا يصلي عليه " . وأنت ترى أنه ليس في الحديث ما ترجم له من الاغتسال فقال الحافظ تعليقا على كلامه : " تنبيه . ليس في شئ من طرق هذا الحديث التصريح بأنه غسله إلا أن يؤخذ ذلك من قوله : " فأمرني فاغتسلت فإن الاغتسال شرع من غسل الميت ، ولم يشرع من دفنه . ولم يستدل البيهقي وغيره إلا على الاغتسال من غسل الميت ، وقد وقع عند أحمد أيضا وابنه كما تقدم ، ويستغرب من الحافظ كيف خفي عليه ذلك ، لا سيما وهو قد عزي الحديث لاحمد كما رأيت ثم إن قوله : " ولم يشرع الاغتسال من دفنه " ، فيه نظر ، لان لقائل أن يقول : أن الحديث ظاهر الدلالة على مشروعية ذلك ، ولا ينافيه الزيادة التي وقعت في آخر الحديث ، لانها جملة مستأنفة ، لا علاقة لها بما قبلها ، أعني أنه لا دليل في الحديث أن عليا إنما كان يغتسل من غسل الميت ، لامره ﷺ إياه بالغسل في الحديث بل هذا شيء .

[٢٨٩] إنما قال له عليه السلام هذا لان بشيرا ﷺ كان أظهر شيئا من التضجر بسبب بعده عن دار قومه . فقد روى الطبراني في " الكبير " والاوسط " عن بشير نفسه قال : " أتيت النبي ﷺ فلحقته بالبقيع فسمعته يقول : السلام على أهل الديار من المؤمنين وانقطع شسعي ، فقال : انعش قدمك ، فقلت : يا رسول الله طالت عزوبتي ونأيت عن دار قومي فقال : يا بشير ألا تحمد الله الذي أخذ بناصيتك من بين ربيعة ، قوم يرون لو لا أنهم انكفت الارض بمن عليها . قال الهيثمي في " المجمع " ( ٣ / ٦٠ ) : ورجاله ثقات " .

قبور المسلمين ، فقال : لقد أدرك هؤلاء خيرا كثيرا ، ثلاث مرات . فبينما هو يمشي إذ حانت منه نظرة ، فإذا هو برجل يمشي بين القبور عليه نعلان ، فقال : يا صاحب السبتيتين ، ويحك ألق سبتيتك ، فنظر فلا عرف الرجل رسول الله ﷺ خلع نعليه فرمي بهما " [٢٩٠] .

واته : جارێكیان لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ ڕێم دەكرد ، دەستیم گرتبوو پێی فەرمووم : ئەی كوڕی ( خصاصية ) ئەوە چییە وات لێ هاتووە گلەیی لە خوا دەكەی ? لە كاتێكدا لە گەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕێ دەكەی ؟! ( دەڵێت : وا بزانم فەرمووی : دەستیشت گرتووە ) ، دەڵێت : منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایك وباوكم بە قوربانت بێ وام لێ نەهاتووە گلەیی لە خوا بكەم ، خوا هەموو چاكەیەكی بۆ كردووم .

پاشان ڕۆشت بۆ لای گۆڕی بێ باوەڕ و هاوبەش پەیداكەران ، و سێ جار فەرمووی : ئا ئەمانە خێر و چاكەیەكی زۆریان لەدەست چووە ... پاشان هات بۆ لای گۆڕی باوەڕداران وسێ جار فەرمووی : ئا ئەمانە چاكەیەكی گەورەیان دەستكەوتووە .

لەو كاتەدا كە ڕێی دەكرد چاوی كەوت بە پیاوێك بە ناو گۆڕەكاندا ڕێی دەكات نەعلەكانیشی لە پێ‌یە ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو : ئەی ئەو كەسەی كە نەعلی ( سبتيت ) لە پێدایە نەعلەكانت دابنێ ، كابراش كە سەیری كرد پێغەمبەری خوای ﷺ نە ناسیەوە ، كەچی یەكسەر نەعلەكانی داكەند و فڕێیدان .

( ابن حزم ) لە ( ٥ / ١٤٢ ، ١٤٣ ) دا ئەمەی كردووە بە بەڵگە لە سەر ئەوەی كە دروست نیە موسوڵمان لە گەڵ موشریك ، و هاوبەش پەیداكەراندا بەیەكەوە لەیەك گۆڕستاندا بنێژرێن ، وە لە شوێنێكی تردا دەیكا بەبەڵگە لە سەر ئەوەی كە دروست نیە بە نەعلەوە بەناو گۆڕدا بڕۆییت وەك چۆن لە ڕوونكردنەوەی بابەتی ژمارە ( ١٢٦ ) دا دێت .

٩٠ ـ سوننەتە مردوو لە گۆڕستاندا بنێژرێ چونكە پێغەمبەر ﷺ مردووەكانی لە گۆڕستانی ( البقيع ) دا دەناشت ، وەك چۆن فەرمودە گەلێكی زۆر لەو بارەیەوە هەیە ، كە هەندێكیان لەچەند شوێنێكی تردا باسكراون نزيك ترين و باشترينیان فەرموودەكەی ( ابن الخصاصية ) يە كە لە بابەتی

---

[٢٩٠] اخرجه ابو داود (٧٢/٢) والنسائي (٢٨٨/١) وابن ماجة (٤٧٤/١) وابن أبي شيبة(١٧٠/٤) والحاكم(٣٧٣/١) والسياق له ومن طريقه البيهقي(٨٠/٤)والطيالسي (١١٢٣) وأحمد (٨٣،٨٣،٢٢٤/٥) والزيادات له ،والثالثة للبيهقي وليست في المستدرك ،وروي الطحاوي(٢٩٣/١)منه قصة الرجل صاحب السبتيتين وقال الحاكم : " صحيح الاسناد " . ووافقه الذهبي ، وأقره الحافظ في " الفتح " (١٦٠/٣) وروى ابن ماجه عن عبد الله عثمان وهو البصري شعبة أنه قال : حديث جيد ونقل ابن القيم في " تهذيب السنن " (٣٤٣/٤) عن الامام أحمد أنه قال : اسناده جيد . وقال النووي في " المجموع " : (٣١٢/٥) : " اسناده حسن " .

پێشوودا باسمان لێوە كرد ، وە هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە كە باس لەوە بكات یەكێك لە پێشینە پیاوچاكەكان لە شوێنیكی تردا نێژراون جگە لە گۆڕستان ، تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێ كە لە ژوورەكەی خۆیدا نێژراوە كە ئەوەش لە تایبەت مەندیەكانی پێغەمبەرە سەلامی خودای لەسەر بێت ، بەبەلگەی فەرموودەكەی ( عائشة ) . رەزای خوای لێ بێت . كە دەفەرمێت : " لما قبض رسول الله ﷺ اختلفوا في دفنه ، فقال أبو بكر : سمعت من رسول الله ﷺ شيئا ما نسيته قال : " ما قبض الله نبيا إلا في الموضع الذي يحب أن يدفن فيه " ، فدفنوه في موضع فراشه " (٢٩١) .

واته : كاتێك پێغەمبەر ﷺ كۆچی دوایی كرد هەوەڵان جیاواز بوون لەسەر شوێنی بەخاك سپاردنی ، ( أبو بكر ) ﷺ فەرمووی : شتێكم بیستووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە هەرگیز لەبیرم نەكردووە فەرمووی : خوا گیانی هیچ پێغەمبەرێكی لەهیچ شوێنێكدا نەكێشاوە لەو شەێنەدا نەبی كە خۆی حەزی كردووە تیایدا بنێژرێ ، بۆیە لەشوێنی خەوتنەكەیدا نێژرا .

٩١ ـ شەهیدانی گۆڕەپانی جەنگ لەو حوكمی پێشوو جیادەكرێنەوە بەوەی كە لەشوێنی شەهیدبوونیاندا دەنێژرێن ، و ناگوێزرێنەوە بۆ گۆڕستان ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی ( جابر ) ﷺ كە دەفەرموێت : " خرج رسول الله ﷺ من المدينة إلى المشركين ليقاتلهم ، وقال أبي عبدالله : يا جابر ابن عبدالله لا عليك أن تكون في نظاري أهل المدينة حتى تعلم إلى ما يصير أمرنا ، فإني والله لو لا أني أترك بنات لي بعدي لاحببت أن تقتل بين يدي ، قال : فبينما أنا في النظارين إذ جاءت عمتي بأبي وخالي عادلتهما على ناضح ، فدخلت بهما المدينة لتدفنهما في مقابرنا ، إذ لحق رجل ينادي : ألا إن رسول الله ﷺ يأمركم أن ترجعوا بالقتلي

---

(٢٩١) أخرجه الترمذي (١٢٩/٢) وقال : " حديث غريب ، وعبد الرحمن بن أبي بكر المليكي يضعف من قبل حفظه " . قلت : لكنه حديث ثابت بما له من الطرق والشواهد :

أ – أخرجه ابن ماجه (٤٩٩/١،٤٩٨)وابن سعد(٧١/٢) وابن عدي في الكامل "(ق ٩٤ ٢/)من طريق ابن عباس عن أبي بكر .

ب – وابن سعد وأحمد (رقم ٢٧) من طريقين منقطعين عن أبي بكر .

ج – ورواه مالك (٢٣٠/١) وعنه ابن سعد بلاغا .

د – ورواه ابن سعد بسند صحيح عن أبي بكر مختصرا موقوفا ، وهو في حكم المرفوع ، وكذلك رواه الترمذي في " الشمائل " (٢٧٢/٢) في قصة وفاته ﷺ ، قال الحافظ ابن حجر (٤٢٠/١) : " واسناده صحيح ، لكنه موقوف ، والذي قبله أصرح في المقصود ، وإذا حمل دفنه في بيته على الاختصاص لم يبعد نهي غيره عن ذلك ، بل هو متجه ، لان استمرار الدفن في البيوت ربما صيرها مقابر ، فتصير الصلاة فيها مكروهة " وقد استنبط البخاري الكراهة من قوله ﷺ : " اجعلو في بيوتكم من صلاتكم ، ولا تتخذوها قبورا " أورده في " باب كراهية الصلاة في المقابر " من حديث ابن عمر ، فقال الحافظ : " ولفظ حديث أبي هريرة عند مسلم أصرح من حديث الباب ، وهو قوله : " لا تجعلو بيوتكم مقابر "،فإن ظاهره يقتضي النهي عن الدفن في البيوت مطلقا " .

، فتدفنوها في مصارعها حيث قتلت ، فرجعنا بهما ، فدفناهما حيث قتلا " (٢٩٢) .

واتە : پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە دەرچوو بۆ جەنگ لەگەڵ موشریك و بێ باوەڕان ، ( عبدالله ) ی باوكم ﷺ پێی وتم : ئەی ( جابر ) ی كوڕی ( عبدالله ) دەرمەچۆ لەمانەرەوانی شاری مەدینە بە ، تاكو ئەو كاتەی هەواڵی ئێمە دەزانیت سوێند بەخوا لەبەر ئەوە نەبێ كە كچەكانم بەبێ خاوەن دەمانەوە حەزم دەكرد لەبەردەستی خۆمدا بكوژرایەیت ، ( جـابر ) ﷺ فەرمووی : كاتێك كە من لەنێوان مانەرەواندا بووم پورم گەڕایەوە كە تەرمی باوكم و خاڵۆمی پێبوو بەسەر وشترێكەوە هێنابوونیەوە ، هێنایانیە ناو شاری مەدینەوە بۆ ئەوەی لە گۆڕستاندا بیانێژێت ، لەو كاتەدا پیاوێك هات و بانگەوازی كرد كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێدەكات كوژراوەكان بگەڕێننەوە بۆ شوێنی خۆیان ، و هەر لەو شوێنەدا بیان نێژن كە تیایدا كوژراون ، ئێمە كوژراوەكانمان گێڕایەوە و لە شوێنی كوژرانیاندا ناشتمانن .

٩٢ ـ دروست نیە لەم كاتانەی خوارەوەدا مردوو بنێژرێ مەگەر لەبەر ناچاری نەبێ :

ا . ناشتن لەو كاتانەدا كە لە فەرموودەكەی ( عوقبة ) ی كوڕی ( عـامر ) دا باس كراون كە دەفرموێت : " ثلاث ساعات كان رسول الله ﷺ ينهانا أن نصلي فيهن ، أو أن نقبر فيهن موتانا ، حين تطلع الشمس بازغة حتى ترتفع ، وحين يقوم قائم الظهيرة حتى تميل الشمس ، وحين تضيف الشمس للغروب حتى تغرب " .

واتە : سێ كات هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردووین كە نوێژی تێدا نەكەین ، و مردووەكانمانی تیا نەنێژین ، لە كاتی خۆری بەر بەیاندا تاكو خۆر بەرز دەبێتەوە ، وە لەو كاتەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لا دەدات بەرەو خۆر ئاوا بوون ، وە لەكاتی خۆرە زەردەی ئێواران تاكو خۆر ئاوا دەبێت .

ب . وە لە شەویشدا ، لەبەر فەرمودەكەی ( جابر ) ﷺ كە دەفەرموێت : " أن النبي ﷺ ذكر رجلا من أصحابه قبض ، فكفن في كفن غير طائل ، وقبر ليلا ، فزجر النبي ﷺ أن يقبر الرجل بالليل حتى يصلى عليه ، إلا أن يضطر إنسان إلى ذلك " (٢٩٣) .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێكی كرد لە هاوەڵانی كە مردبوو ، و لە كفنێكی بێ بایەخ و كورتدا ، و بەشەویش نێژرا بوو ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كرد كە بەشەو مردوو بنێژرێ پێش ئەوەی نوێژی لەسەر بكرێ ، مەگەر لەبەر ناچاری نەبێ .

فەرموودەكە بەڕوونی بەڵگەیە بۆ ئەوەی كە باسمان كرد ، و هەر ئەمەشە بۆچوونی پێشەوا

---

(٢٩٢) أخرجه أحمد (٣/٣٩٧-٣٩٨) بسند صحيح ، وبعضه عند أبي داود وغيره مختصرا وقد تقدم في المسألة (١٧ص ١٤) .

(٢٩٣) أخرجه مسلم وغيره وقد سبق في المسألة (٣٥ص ٥٦) .

**( أحمد ) ە . ڕەحمەتی خوای لێ بێ . لە گێڕانەوەیەکدا لە ( الإنصاف : ٢ /٥٤٧ ) دا کە دەفەرموێت : (( لا يفعله إلا لضرورة )) ، وفي أخرى عنه : (( يكره )) واتە : مردوو لە شەودا نانێژرێ مەگەر لەبەر ناچاری نەبێت ، وە لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت : کەراهەتی هەیە )[294] .**

**دەڵێم : یەکەمیان زیاتر نزیکە لەڕواڵەتی وشەی ( زجر ) چونکە ئەویان زیاتر واتای نەهی و قەدەغەکردنی تێدایە ، تاکو وشەی ( نهي ) کە دەکرێ بووترێت بۆ کەراهەت هەڵدەگرێت ، لەسەر ئەوەی کە بنەما تیایدا حەرام و قەدەغەیە وهیچ شتێك لای نادات بۆ کەراهەت[295] .**

---

[294] قلت : وقد رد ذلك التأويل الامام النووي أيضا ، ولكنه في سبيل بيان ذلك وقع في تأويل آخر يشبه هذا وادعي دعوى غير ثابتة فقال في " شرح مسلم " : " قال بعضهم إن المراد بالقبر صلاة الجنازة ، وهذا ضعيف ، لان صلاة الجنازة لا تكره في هذا الوقت بالاجماع ، فلا يجوز تفسير الحديث بما يخالف الاجماع ، بل الصواب أن معناه تعمد تأخير الدفن إلى هذه الاوقات ، كما يكره تعمد تأخير العصر إلى اصفرار الشمس بلا عذر ... فأما إذا وقع الدفن في هذه الاوقات بلا تعمد فلا يكره " . قلت : وهذا تأويل لا دليل عليه ، والحديث مطلق يشمل المتعمد وغيره ، فالحق عدم جواز الدن ولو لغير متعمد ، فمن أدركته فيها فليتريث حتى يخرج وقت الكراهة . وأما ادعاؤه أن صلاة الجنازة لا تكره في مثل هذا الاوقات بالاجماع فوهم منه رحمه الله ، فالمسألة خلافية والصواب فيها الكراهة خلاف الاجماع المزعوم ، وقد سبق بيان ذلك في المسألة (٨٩) تعليقا عليها (ص١٣٠).

[295] بەڵام ئەوەی دەبێتە جێی سەرنج لەسەر ئەم وتەیەمان ئەو وتەیەیە کە لە فەرموودەکەدا هاتووە : " حتى يصلى عليه " کە لە ڕواڵەتدا ئەوە دەگەیەنێ کە دروستە لەشەودا مردوو بنێژرێ لەدوای ئەوەی نوێژی لەسەر کرا ، چونکە مەبەست لەقەدەغەکردنەکە نوێژەکەیە ، ئەگەر ئەنجامدرا ئەوا قەدەغەکردنەکە هەڵدەگیرێ ، بەڵام وتەی " إلا أن يضطر إنسان إلى ذلك " بەرپەرچی دەداتەوە چونکە ( ذلك ) دەگەڕێتەوە بۆ قەدەغەکراوەکە کە ناشتنی مردووە لەشەودا لەبەر هۆکارگەلێك کە لە داهاتوودا لە ( ابن حزم ) وە بۆتان دەگێڕینەوە ، هەرچەند ئێمە بۆچونمان وانیە کە خەڵکی ناچاربن و مردوویەك بنێژن پێش ئەوەی نوێژی لەسەر بکەن ، کە ئەمە وادەکات هیچ سودێك لە وشەی ( الليل ) وەرنەگیرێت .

چونکە هەر چۆن ناشتنی مردوو پێش نوێژ لەسەر کردنی لەشەودا دروست نیە ، هەروەها لەڕۆژیش دا دروست نیە ، وە ئەگەر بەشەو دروست بێ لەبەر ناچاری ئەوا لەڕۆژیشدا لەبەر ناچاری دروستە ، وهیچ جیاوازیەك نیە ، کەواتە چ سودێك هەیە لە بەستنەوەی ئەم قەدەغەیە بەشەوەوە ؟

بێ گومان هیچ سودێکی ڕون نیە تەنها بەو شێوە نەبێ کە لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا کە دروست نیە بە شەو مردوو بنێژرێ ، ئاشکرا کردن و خستنە ڕووی ئەوەش بەم شێوەیە دەبێت :

ناشتنی مردوو لەشەودا گومانی ئەوەی لێدەکرێ کە نوێژخوێنی کەمی لەسەر کۆببێتەوە و نوێژی لەسەر بکەن بۆیە پێغەمبەر ﷺ ناشتنی لەشەودا قەدەغەکرد ، بۆ ئەوەی لەڕۆژدا نوێژی لەسەر بکرێت ، چونکە لەڕۆژدا خەڵکی چالاك ترن بۆ نوێژ ، بەمەش ژمارەی نوێژخوێنان زیاد دەکات کە ئەوەش یەکێکە لە مەبەستەکانی شەریعەت و زیاتر ئومێدی ئەوە هەیە کە تکاکانیان وەربگیرێت بۆ مردووەکە ، وەك چۆن لەبابەتی ژمارە ( ٦٣ ) ی پەڕە ( ) ڕوونکراوەتەوە .

پێشەوا ( النووي ) لە ( شرح مسلم ) دا دەفەرموێت : (( وأما النهي عن القبر ليلا حتى يصلى عليه ، فقيل سببه أن الدفن نهارا يحضره كثير من الناس ويصلون عليه ولا يحضره في الليل إلا أفراد ، وقيل لانهم كانوا يفعلون ذلك لرداءة الكفن ، فلا يتبين في الليل ، ويؤيده أول الحديث وآخره ، قال القاضي : العلتان صحيحتان ، قال : والظاهر أن النبي ﷺ قصدهما معا ، قال : وقد قيل غير هذ )) ، واتە : هۆی

قەدەغەكردنی ناشتنی مردوو لەشەودا بۆ ئەوەیە كە نوێژی لەسەر بكرێت ، وە وتراوە هۆكەی ئەوەیە كە لە ڕۆژدا خەڵكێكی زۆر لەسەری كۆدەبنەوە و نوێژی لەسەر دەكەن ، بەڵام لەشەودا چەند كەسێكی كەم نوێژی لەسەر دەكات ، وە وتراوە : ئەوان بۆیە لەشەودا مردوویان دەناشت چونكە كفنەكە كۆن وبێ بایەخ بووە كە ئەم كۆنی كفنە لەشەودا دەرناكەوێ ، وە سەرەتا و كۆتایی فەرموودەكە پشتگیری ئەم واتایە دەكات ، ( القاضـــي ) فەرمویەتی : هەردوو هۆكارەكە ڕاستن . فەرموی : وە جگە لەمانەش بۆچونی دیكەش وتراوە .

دەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەگەر زانرا كە قەدەغەكردنی ناشتن بەشەو بەهۆی كەمی نوێژخوێنان وترسی بێ كەڵكی كفنەكەوەیە ، ئەوا بۆمان دەردەكەوێت كە دروستە مردوویەك لە ڕۆژدا نوێژی لەسەر بكرێ و پاشان ناشتنەكەی لەبەر بونی بیانویەك دوا بكەوێت بۆشەو ، چونكە هۆی قەدەغەكردنەكە نەماوە و مەبەستەكەش هاتۆتە دی كە زۆری نوێژخوێنانە ، بەڵام ئایا دروستە ناشتنی مردوو لە ڕۆژدا دوا بخرێ بۆ ئەوەی نوێژخوێنی زۆری لەسەر كۆببێتەوە ؟ ( الصنعاني ) لە ( سبل الســـلام ) دا بەباشی زانیوە بەڵام من وای بۆ ناچم ، چونكە هۆی قەدەغەكردنەكە پەیوەستە بەشەوەوە و دروست نیە لێی لابدرێت بۆ ڕۆژ لەبەر بونی جیاوازیەكی زۆر لە نێوان هەردوو كاتەكەدا ، چونكە كەمی نوێژخوێنان لەشەودا شتێكی سروشتییە بەپێچەوانەی ڕۆژەوە كە زۆری نوێژخوێنان شتێكی سروشتییە ، پاشان ئەم زۆریەش سنورێكی بۆ نیە وە تاكو ناشتنی مردووەكە دوابخرێ نوێژخوێنان زیاتر دەبن ، هەر بۆ ئەمەشە كە زۆرێك لە زیادڕەویكاران ئەوانەی كە حەزیان لە خۆدەرخستن وریا و وپلەو پایەیە . ئەگەر چی لەسەر ئەركی مردووەكەش بێ . مردووەكانیان دوا دەخەن بۆ ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ بۆ ئەوەی خەڵكی زۆری لێ كۆببێتەوە ، ئەگەر بووتریێ ئەمە دروستە ئەوا دەبێتە هۆی بەربەرچدانەوەی فەرمانەكانی پێغەمبەر ﷺ كە فەرمان دەكات مردوو زوو بنێژرێ ، بـە بیانوی زۆری نوێژخوێنان كە هیچ سنورێكی نیە وەك لـە بابەتی ژمارە ( ١٧ ) دا باسمان كردووە .

لەدوای ئەمە وەڵامی ئەو سەرنجەمان دەست دەكەوێ كە هێنامانەوە لەسەر وتەی ( حتى يصلي عليـــه ) كە بۆمان دەركەوت مەبەست پێی ئـەوەیە كـە دوابخرێ بـۆ ڕۆژ بـۆ ئەوەی كۆمەڵێكی زۆر نوێژی لەسەر بكات ، بۆ ئەوەی بزانی كە مەبەست لە ( ذلك ) لە وتەی ( إلا أن يضطر إنسـان إلى ذلك ) دەگەڕێتەوە بۆ ناشتنی مردوو لەشەودا ئەگەرچی چەند نوێژخوێنێكی كەمیش نوێژی لەسەر بكەن ، وە ناگەڕێتەوە بۆ ناشتنی مردوویەك كە نوێژی لەسەر نەكرابێ بەهیچ جۆرێك . بۆیە تێبفكرێ لەم وتەیە چونكە جێی خۆیەتی تێبفكرێت .

پاشان پێشەوا ( النووي ) لە ( شرح مسلم ) دا دەفەرموێت : (( وقد اختلف العلماء في الدفن في الليل، فكرهه الحسن البـــصري إلا لضرورة ، وهذا الحديث مما يستدل له به ، وقال جماهير العلماء من السلف والخلف : لا يكره واستدلو بأن أبا بكر الصديق ﷺ وجماعة من السلف دفنوا ليلا من غير إنكار ، وبحديث المرأة السوداء : والرجل الذي كان يقم المسجد فتوفي بالليل فدفنوه ليلا ، وسألهم النبي ﷺ عنـــه فقالوا : توفي ليلا فدفناه في الليل ، فقال : ألا آذنتموني ، قالوا : كانت ظلمة ولم ينكر عليهم ، وأجابوا عند هذا الحديث أن النهي كان لتـــرك الصلاة ، ولم ينه عن مجرد الدفن بالليل ، وإنما لترك الصلاة أو لقلة المصلين أو عن إساءة الكفن أو عن المجموع كما سبق )) ، واتە : زانایـان بۆچونیان جیاوازە دەربارەی ناشتنی مردوو لەشەودا ، حەسەنی بەسری بە مەكروهی داناوە مەگەر كەسێك ناچار ببێ ، وە ئەم فەرموودەیە دەكرێتە بەڵگە بۆی وە زۆربەی زانایانی ( سلف ) پێشین و ( خلف ) پاشینەكانیش فەرمویانە : مەكروە نیە بە بەڵگەی ئەوەی كە ( أبو بكر ) ﷺ وە هەروەها كۆمەڵێك لە پێشینە پیاوچاكەكان لەشەودا نێژراون وكەس نكۆڵی لێ نەكردووە ، وە بە بەڵگەی فەرموودەی ئافرەتە ڕەش پێستەكە و ئەو پیاوە خزمەتكارەی مزگەوت كە كۆچی دوایی كردو لـە شـەودا نێژرا وپاشان پێغەمبەر ﷺ پرسیاری كرد ، هاوەڵان فەرموویان : لـە شـەودا مردوو هـەر لەشەودا ناشتمان ، فەرموی : ئـەی بـۆ پرسی منتان نەكرد ؟ فەرمویان : دنیا زۆر تاریك وسارد بوو ، وە پێغەمبەر ﷺ هیچ لۆمەیەكی نەكردن .

**٩٣ ـ وە ئەگەر ناچاربوون ئەوا دروستە لە شەودا مردوو بنێژن ، ئەگەرچی بە بەكارهێنانی چرا و گڵۆپیشەوە بێت ، و ئەو چرا وگڵۆپەش دابەزێننە ناو گۆڕەكە بۆ ئاسان كردنی ناشتنەكە ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی ( ابن عباس ) ﷺ كە دەفەرموێت : " أن رسول الله ﷺ أدخل رجلا قبره ليلا ، وأسرج في قبره " [٢٩٦] ، واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا پیاوێكی مردووی ناشت ، و چرای**

---

بەوە وەڵامی ئەم فەرموودەیەیان داوەتەوە كە قەدەغەكردنەكە بۆ نەكردنی نوێژەكەیە و بۆ ناشتنی مردوو نیە لەشەودا ، بەڵكو بۆ نەكردنی نوێژەكەیەتی یاخود لەبەر كەمی نوێژخوێنانە یاخود لەبەر خراپی كفنەكەیەتی یان لەبەر هەموو ئەم هۆكارانەیە .

دەڵێم ( ئەلبانی ) : وەڵامی یەكەم كە دەڵێ : ( قەدەغەكردنەكە بەهۆی نەكردنی نوێژەكەوەیە ) دروست و تەواو نیە ، چونكە ئەگەر ئاوابێت ئەوا هیچ جیاوازیەك بەدی ناكرێت لە نێوان ناشتنی مردوو لەشە و یاخود لەڕۆژدا ، بەڵكو بۆچوونی دروست ئەوەیە كە قەدەغەكردنەكە لەبەر ئەو دوو هۆكارەیە كە لە وتكانی ( القاضی ) دا ڕونكرایەوە ، هەر بەم بۆ نەیەشەوە ( ابن حـزم ) بەدروستی دانەناوە هیچ كەسێك لەشەودا بنێژرێ مەگەر لەبەر ناچاری نەبێ ، وە ئەم فەرموودەیەی بەبەڵگە هێناوەتەوە لە ( المحلی : ٥ / ١١٤ ــ ١١٥ ) دا ، پاشان دەربارەی ئەو فەرموودانەی كە باس لە ناشتنی مردوو لەشەودا دەكەن وئەوانەش كەبەو واتایە هاتوون بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە : (( وكل من دفن ليلا منه ﷺ ومن أزواجه ومـن أصحابه ﷺ ، فإنما ذلك لضرورة أو جبت ذلك من خوف الحر على من حضر ــ وهو بالمدينة شديد ــ أو خوف تغير أو غير ذلك مما يبيح الدفن ليلا ، ولا يحل لأحـد أن يظن بهم ﷺ خلاف ذلك )) واتە : هەموو ئەوانەی لەشەودا نێژراون لە پێغەمبەر ﷺ و خێزانەكانی و هاوەڵانی تەنها لەبەر ناچارییەك بووە كە وای پێویست كردووە لەشەودا بنێژرێن ، وەك ترسی زۆری گەرما لەسەر ئەو كەسانە كە ئامادە دەبن ــ كە ئەمەش لە مەدینە دا زۆرە ــ یان لەبەر ترسی گۆڕانی لاشەكە ، وە جگە لەمانەش كە وادەكات ناشتنی مردوو لەشەودا دروست بێت ، وە دروست نیە بۆ هیچ كەسێك گومانی وا ببات كە هاوەڵان بە پێچەوانەی ئەمە كاریان كردووە .

پاشان لە ( سعید ) ی كوڕی ( المسیب ) وە دەگێڕدرێتەوە كە ناشتنی مردوو لەشەودا مەكروهە .

منیش دەڵێم ( ئەلبانی ) : دروستە بووترێ هەندێ لەوانەی كە لە شەودا نێژراون لەڕۆژدا نوێژیان لەسەر كرا بوو ، بەم شێوەیە هیچ دژیەكیەك نامێنی ، كە ئەمەش ڕاستی ناشتنی پێغەمبەر ﷺ بووە ، چونكە لەڕۆژی سێ شەممەدا لەلایەن هاوەڵانەوە نوێژی لەسەر كرا و پاشان لەشەوی چوار شەممەدا نێژرا ، وەك چۆن ( ابن هشام ) لە ژیان نامەی پێغەمبەر ﷺ دا لە ( ٤ / ٣١٤ ) دا لە ( ابن اسحاق ) وە بۆمان دەگێڕێتەوە . والله أعلم .

[٢٩٦] أخرجه ابن ماجه (١/ ٤٦٤) والترمذي (٢/١٥٧) بأتم منه وقال : " حديث حسن " . قلت : يعني أنه حسن لغيره ، وهذا اصطلاح خاص للترمذي أنه إذا قال : " حديث حسن " فإنما يريد الحسن لغيره كما نص عليه هو نفسه في " العلل " ، المذكورة في آخر كتابه ، وقد جاء له شاهد كما يأتي ، وعليه فلا يرد على تحسين الترمذي نقد ابن القطان إياه الذي حكاه صاحب " تحفة الاحوذي ".

أما الشاهد فهو من حديث جابر بن عبد الله . أخرجه أبو داود (٢/٦٣) والحاكم (١/٣٦٨) والبيهقي (٤/٥٣) وقال الحاكم : " صحيح على شرط مسلم " . ووافقه الذهبي وزاد عليهما النووي فقال في " المجموع " (٥/٣٠٢) : " رواه أبو داود بإسناد على شرط البخاري ومسلم !

" قلت : وكل ذلك خطأ ، فإن مدار إسناده على محمد بن مسلم الطائفي ، وهو وإن كان ثقة في نفسه ، فقد كان ضعيفا في حفظه ، ولذلك لم يحتج الشيخان به ، وإنما روى له البخاري تعليقا ، ومسلم استشهادا ، ومن العجائب أن الحاكم والذهبي على علم ببعض هذا ، فقد ذكـر المزي أن الطائفي هذا ليس له في مسلم إلا حديثا واحدا ، قال الحافظ ابن حجر : " وهو متابعه عنده ، كما نص عليه الحاكم " وكذلك صرح الذهبي في ترجمته من " الميزان " أن مسلما روى له متابعة .

نوێژ بكات ، بە هەتا هەتایی نوێژەكەی دەبێت دوبارە بكاتەوە .

پاشان كەراهەتی نوێژكردن لە گۆڕستاندا هەموو جێگایەكی دەگرێتەوە گەر گۆڕەكە لەپێش یان پاشی نوێگەر یان لای ڕاستی وە یاخود لای چەپی یەوە بێت ، چونكە نەهیەكە گشتیە و ئەوەی كە جێگیر و سەلمێنراوە لە ( علم الأصول ) دا كە ( مطلق يجرى على إطلاقه حتى يأتي ما يقيده ) ڕەها لەسەر ڕەهایی و گشتێتی خۆیەتی تاكو بەڵگەیەك دێت و پەیوەستی ئەكات . وە لێرەدا هیچ شتێكی وا نەهاتووە كە پەیوەستی بكات ، وە ئەوەش كە باسمان كرد هەندێ لە شەرع زانانی مەزهەبی حەنەفی وجگە لەوانیش تەصریحیان پێ كردووە وەك ئێستا دەچینە سەری .

پێشەوا شێخی پایەبەرزی ئیسلام ( ابن تيمية ) لە ( الإختبارات العلمية : ص٢٥ ) دەفەرموێ : (( ولا تصح الصلاة في المقبرة ، ولا إليها ، والنهي عن ذلك ، إنما هو سد لذريعة الشرك ، وذكر طائفة من أصحابنا : أن القبر والقبرين لا يمنع من الصلاة ، لأنه لا يتناوله اسم المقبرة ، وإنما المقبرة ثلاثة قبور فصاعدا ، وليس في كلام أحمد وعامة أصحابه هذا الفرق ، بل عموم كلامهم وتعليلهم واستدلالهم يوجب منع الصلاة عند قبر واحد من القبور ، وهو الصواب ، والمقبرة كل ما قبر فيه ، لا أنه جمع قبر . وقال أصحابنا : وكل ما دخل في اسم المقبرة مما حول القبور لا يصلى فيه ، فهذا يعين أن المنع يكون متناولا لحرمة القبر المنفرد وفنائه المضاف إليه . وذكر الآمدي وغيره : أنه لا تجوز الصلاة فيه أي المسجد الذي قبلته إلى القبر حتى يكون بين الحائط وبين المقبرة حائل آخر . وذكر بعضهم : هذا منصوص أحمد )) ، واتە : وە نوێژكردن لە گۆڕستاندا ، و لای گۆڕ

---

پێغەمبەر ﷺ قەدەغە ( نەهی ) مان لێبكات بەحەرامی دەزانین ، وە ئەوەش بەنزیك بوونەوە لەخوای گەورە دەزانین ئەوە ئەنجام بدەین كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە . وە ( فەرمان ونەهی ) كردنەكانی حەق ودروستن وە كرداری پێغەمبەرمان ﷺ حەقە و جگە لە ویش بەتاڵ و ناڕەوایە .

قلت : وفيما قاله في صلاة الجنازة نظر ، لانه لا نص على جوازها في المقبرة ولو كان ابن حزم من القائلين فالقياس لقلنا أنه قاس ذلك على الصلاة على القبر : ولكنه يقول ببطلان القياس من أصله ، وصلاة الجنازة في المقبرة خلاف السنة التي لم تأت إلا بصلاتها في المصلى وفي المسجد كما سبق بيانه في محله ، بل قد جاء النهي الصريح عن الصلاة عليها بين القبور كما في رواية في حديث أنس المذكور في هذا الفصل ، وهو الحديث الثاني منه .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەوەی كە ( ابن حزم ) فەرمووی سەبارەت بەنوێژی جەنازە جێگای سەرنجە ، چونكە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی كە نوێژی جەنازە لە گۆڕستاندا دروستە هەرچەند كە ( ابن حزم ) لەوانەیە كەئەوە دەڵێت بە ( قیاس ) و قیاسی كردووە لەسەر نوێژكردن لەسەر گۆڕ . بەڵام بەبەتاڵی قیاسكردنەكەیەوە لەبنچینەدا دەڵێ . وەنوێژی مردوو لەگۆڕستاندا پێچەوانەی ئەو سونەتەیە كە لە سونەتیشدا نەهاتووە ، تەنها لە ( مصلى ) نوێژگا ومزگەوت نەبێ . وەك لەپێش دا لەجێگای خۆی ڕونكرایەوە . بەڵكو بەڕاشكاوی نەهی هاتووە لەسەر نوێژكردن لەسەر و لەنێوان گۆڕەكاندا . وەك لەڕیوایەت و فەرمودەكەی ( أنس ) دا باسكرا لەم بەشەدا ، كە ئەویش فەرموودەی دووەمی ئەم بەشەیە .

دروست نیە . وە نەهی كردنیش لەمە تەنها بۆ ڕێگە گرتنە لەهاوبەش دانان بۆ خوای پەروەردگار ، وە كۆمەڵێك لە هاوەڵانمان ئەوەیان باسكردووە كە یەك یان دوو گۆڕ ڕێگر نیە لەوەی كە نوێژی تێدا بكرێ ، چونكە ناوی گۆڕستانی لێنانرێ ، بەڵام ئەگەر لە سێ گۆڕ بۆ سەرەوە بوو ئەو كاتە ناوی گۆڕستانی لێدەنرێ ، وە ئەم جیاوازییە لە وتەی ئیمام ( أحمد ) و هاوەڵانیدا نیە ، بەڵكو وتەی هەموویان بەگشتی و هۆكار و بەڵگەكانیان ئەوە پێویست دەكات كە دەبێ ڕێگری بكرێ لە نوێژكردن لای یەك گۆڕیش . وە ئەوەش سەواب و ڕاستە ، وە ناوی گۆڕستانیش لەهەموو جێگایەك دەنرێ كە مردووی تێدا بنێژرێ ، هاوەڵانمان وتویانە هەر جێگایەك بچێتە ژێر ناوی گۆڕستانەوە لە چواردەوری گۆڕەكانیدا نوێژی تێدا ناكرێ . ئەمەش ئەوە دیاری دەكات كە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە بچنە ڕیزی حورمەتی گۆڕەكەوە ، و ئەو چۆڵاییەی كە دەدرێتە پاڵی ، وە ئەمەو ( آمدي ) و جگە لەویش ئەوەیان باسكردووە كە نوێژی تێدا ناكرێ واتە : مزگەوتێك كە ڕووگەی لەگۆڕ بێت ، تاكو لە نێوان دیوارەكەی و گۆڕەكەدا بەربەستێكی تر نەبێت لەیەك جودایان كاتەوە ، وە هەنێكیان وتویانە ئەمە دەقی ووتەی پێشەوا ( أحمد ) ە .

وە لە وتەی شێخدا . ڕەحمەتی خـوای لەسەر . ئاشكرایە كـە هۆی نەهی كردن لە نوێژكردن لە گۆڕستان تەنها بۆ ڕێگە گرتنە لە هاوەڵ دانـان ، وە ئەمەش یەكێك لە وتەی زانایانە لەم مەسەلەیەدا .

وە وتەی دووەمیشیان ئەوەیە كە لە بەر پیسی زەوی گۆڕستانە !! وە ئەمەش دوو وتە بوو لە مەزهەبی حەنەفیەكاندا وە ( ابن عابـدین ) ( ١ / ٣٥٢ ) سەرنجی لەسەر وتەی دووەمیان هەیە ، چونكە هاتنی گۆڕان بەسەر شتە پیسەكان هۆی پاكبوونەوەیانە لە لایاندا ، كەوابوو چۆن ئەم هۆیە ڕاستە !؟ وە ئەوەش كە گومانی تێدا نبێت لە لای ئێمەدا كە وتەی ڕاست و دروستە وتەی یەكەمە . وە شیخی پایەبەرزی ئیسلام ئەمەی ڕون كردۆتەوە لە كتێبەكانیدا و بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە ، بەشێوەیەك كە جگە لە لای ئەو لای كەسی تر نیە ، بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ ( اقتضاء الصراط المستقيم : ١٥٢ / ١٩٣ ) ، وە نووسەر لە كتێبی ( الخانية ) دا كە لە كتێبی حەنەفیەكانە لەسەر ئەوە ئەڕوات . و ( طحاوي ) یش لە پەراوێزەكەی لەسەر (مراقـي الفـلاح ) دا ئاماژەی بۆ دەكات لە سەر وتەی لێكدەرەوە ( شارح ) ەوە دەڵێ : ( وتكره الصلاة في المقبرة : نوێژكردن حەرامە لەگۆڕستاندا ) ئەوەش لە ( ١ / ٢٠٨ ) كە دەفەرمووی : (( بتثليث الباء ، لأنه تشبه باليهود والنصارى ، قال ﷺ : " لعنة الله على اليهود والنصارى ، اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد " ، وسواء كانت فوقه أو خلفه أو تحت ما هو واقـف عليـه . ويستثنى مقابر الأنبياء ــ عليهم السلام ــ فلا تكره الصلاة فيها مطلقا منبوشة أو لا ، بعد أن لا يكون القبر في

جهة القبلة ، لأنهم أحياء في قبورهم )) ، واتە : چونکە خۆشوبهاندنە بە جولەکە و گاورەوە . وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : نەفرەتی خوا لە جولەکە و گاورەکان بێت کە گۆڕی پێغەمبەرانیان . علیهم السلام . دەکرد بە مزگەوت . وە یەکسانە و هیچ جیاوازی یەکی تێدانیە کە گۆڕەکە لەسەری بێت یان لە پشتییەوە وە یان لە ژێر ئەوە بێت کە لە سەری دەوەستی . بەڵام گۆڕی پێغەمبەران . علیهم السلام . جیاوازن لەمەدا و بەگشتی نوێژکردن تێیدا دروستە ، دەرکراو بێت یان نە . ئەگەر گۆڕەکە لە ڕووی ڕوگەوە نەبێت ، چونکە پێغەمبەران . علیهم السلام . زیندوون لە گۆڕەکانیاندا .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەم جیاکردنەوەیە بەڕوونی دیارە کە وتەیەکی بەتاڵە ، چۆن ئەو شتە دەبێت لە کاتێکدا کە ئەمە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو هۆکارەدا کە باسکرا ، و ئەو فەرمودەیەش کە بەڵگەیە لەسەری ، وە چۆن هاوشێوەی ئەم جیاکردنەوەیە دروستە لەگەڵ ئەو هەموو فەرمودە زۆرانەی کە لە بارەی نەفرەت کردن لە جولەکە و گاورەوە هاتوون لەبەر ئەوەی کە گۆڕی پێغەمبەرانیان کردبوو بە مزگەوت !؟ پاشان بە ( صحیح ) ی لە پێغەمبەرەوە هاتووە ﷺ کە قەدەغە ( نهـي ) ئەوەی لێکردووین ، و نەهیەکەش بەڕاستەوخۆیی لەسەر بەمزگەوت کردنی گۆڕی پێغەمبەرانە ، وجگە لەگۆڕی پێغەمبەرانیش ئەم نەهیە دەیگرێتەوە . کەوابوو چۆن ئەم جیاکردنەوە دەبێت بڕوای پێ بکرێت !؟ وە وتەی ڕەوا ئەوەیە کە ئەم شێوە جیاکردنەوەیە لە گەڵ وتەی دووەمدا دەڕوات ، کە نوێژنەکردن لەسەر گۆڕ بەهۆی پیسیەوەیە ، وە بێگومان گۆڕی پێغەمبەران . علیهم السلام . پاکە ، چونکە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : " إن الله حرم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء " [٤٢٣] ، واتە : بەڕاستی خوای گەورە لەسەر زەوی حەرام کردووە کە جەستەی پێغەمبەران . علیهم السلام . بخوات و بڕزێنێ . بەڵام ئەم هۆیە بەتاڵە ( پوچەڵە ) وە هەرچ شتێکیش لەسەر بەتاڵ بنیات بنرێ بەتاڵە .

٩ - دروست کردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ ، وچەندان فەرمودەشی لەسەرە :

یەکەم : لە ( عائشة ) و ( عبدالله ) ی کوڕی ( عباس ) لە گەڵ یەکدا فەرموویانە : " لما نزل برسول الله ﷺ طفق يطرح خميصة له على وجهه ، فإذا اغتم بها كشفها عن وجهه ، فقال : وهو كذلك : لعنة الله على اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد ، يحذر [ مثل ] ما صنعوا " [٤٢٤] .

واتە : لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو و ناڕەحەت دەبوو ، ئەویش

---

[٤٢٣] وقد فصلت القول في خطأ الطحاوي وتناقضه في الاستثناء المذكور في كتابي ( الثمر المستطاب في فقه السنة والكتاب ) .

[٤٢٤] أخرجه البخاري (١/٤٢٢٦/٣٨٦٨/١١٦) ومسلم (٢/٦٧) والنسائي (١/١١٥) والدارمي (١/٣٢٦) والبيهقي (٤/٨٠) وأحمد (١/٢١٨٦/ ٣٤٢٢٩٢٧٥) والزيادة لمسلم والدارمي وغيرهما .

كراسێكی هەبوو دەیدا بە سەر ڕووی خۆیدا لە ناڕەحەتی ، بەو شێوەیە بوو ، وە كە دەهاتەوە هۆش پارچەكەی لە سەر ڕوومەتی لادەدا و دەیفەرموو : نەفرەتی خوا ( لەعنەتی خوا ) لە جولەكە و خاچ پەرستان بێت گۆڕی پێغەمبەرانیان دەكرد بەمزگەوت ، وریای دەكردنەوە لەوەی كە ئەوان ئەنجامیان دا ، بۆ ئەوەی ئەنجامی نەدەن .

**دووەم :** لە ( عائشة ) ەوە . ڕەزای خوای لەسەر بێت . دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشی یەی كە تێیدا وەفاتی كرد ، و ڕاست نەبووەوە ، فەرمووی : " لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد " ، ( عائشة ) . ڕەزای خوای لەسەر بێت . فەرمووی : فلولا ذاك أبرز قبره ، غير أنه خشي أن يتخذ مسجدا [٤٢٥] ، واتە : نەفرەتی خوا لە جولەكە و خاچ پەرستان بێت ، گۆڕی پێغەمبەرانیان دەكرد بەمزگەوت . دوا بەدوای گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە ( عائشة ) ڕەزای خوای لێ بێت . فەرمووی : ئەگەر ئەوە نەبوایە گۆڕەكەی بەرز دەكرد و هەڵیان دەبەست ، چونكە ئەو دەترسا گۆڕەكەی بكرێت بە مزگەوت .

**سێیەم :** لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە دەفەرمو‌ێ : " قاتل الله اليهود ( وفي رواية : لعن الله اليهود والنصارى ) اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد " [٤٢٦] ، واتە : خوای گەورە جولەكە لەناو بەرێ ( لە ڕیوایەتێكی تردا ) نەفرەتی خوا لە جولەكە و گاور بێت كە گۆڕی پێغەمبەرانیان دەكرد بەمزگەوت .

**چوارەم :** لە ( أبو هريرة ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی : " اللهم لا تجعل قبري وثناً يعبد ، لعن الله قوماً اتخوا قبور انبيائهم مساجد " [٤٢٧] ، واتە : خوایە گۆڕكەم نەكەی بەوەی كە بێجگە لەتۆ بپەرسترێ ، نەفرەتی خوا لەقەومێك بێت كەگۆڕی

---

[٤٢٥] أخرجه البخاري (٣/١٥٦ ١٩٨ ٨/١١٤) وأبو عوانة (٢/٣٩٩) وأحمد (٦/٨٠١٢١٢٥٥) . وله عنده (٦/١٤٦٢٥٢) طريق آخر عنها .

[٤٢٦] أخرجه البخاري (١/٤٢٢) ومسلم وأبو عوانة (٢/٤٠٠) وأبو داود (٢/٧١) والبيهقي (٤/٨٠)وأحمد (٢/٢٨٤٣٦٦٣٩٦٤٥٣ ٥١٨) والرواية الثانية له ولمسلم وأبي عوانة وهي من طريق أخرى عن أبي هريرة .

[٤٢٧] أخرجه أحمد (٢/٢٤٦) وابن سعد في ( الطبقات ) (٢/٣٦٢) وأبو نعيم في ( الحلية ) (٧/٣١٧)بإسناد صحيح وأما قول الهيثمي في ( مجمع الزوائد ) (٢٣) : ( رواه أبو يعلى وفيه إسحاق بن أبي إسرائيل وفيه كلام لوقفه في القرآن وبقية رجاله ثقات ) .

فقيه نظر من وجوه :

١ ـــ إنه اقتصر على أبي يعلى في العزو فأوهم أنه ليس في ( مسند أحمد ) وليس كذلك كما عرفت .

٢ ـــ أن إسحاق المذكور ثقة ووقفه في القرآن لا يجرحه كما هو مقرر في المصطلح .

٣ ـــ أنه لم يتفرد به فهو عند احمد من غير طريقه فالحديث صحيح لاشك فيه .

وله شاهد مرسل .أخرجه مالك في ( الموطأ ) (١/١٨٥-١٨٦) بسند صحيح . وروي موصولا عن أبي سعيد الخدري .

پێغەمبەرانیان دەکرد بەمزگەوت .

**پێنجەم :** لە ( جندب ) ەوە دەگێڕنەوە ﷺ کە فەرمویەتی : " سمعت النبي ﷺ قبل أن يموت بخمس يقول : [ قد كان لي فيكم أخوة وأصدقاء و ] إني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل ، فإن الله تعالى قد اتخذني خليلا كما اتخذ إبراهيم خليلا ، ولو كنت متخذا من امتي خليلا ، لا تخذت أبا بكر خليلا ، ألا وإن من كان قبلكم كانو يتخذون قبور أنبيائهم وصالحيهم مساجد ، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد ، إني أنها كم عن ذلك " (٤٢٨) .

واتە : لە پێغەمبەرم بیست ﷺ پێنج ڕۆژ پێش مردنی دەیفەرموو : لەناو ئێوەدا دۆست وهاو ڕێیانم هەیە ، ( وإني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل ) وەخوای گەورە منی کردووە بەدۆستی خۆی وەك چۆن ئیبراهیمی کردبوو بەدۆستی خۆی ، وە ئەگەر لە ئوممەتەکەمدا کەسێکم بەدۆستی خۆم بکردایە ئەوا ( أبـو بكـر ) م دەکرد بە دۆستی خۆم ، ئەوانەی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەران وپیاوچاکانیان دەکرد بە مزگەوت ، جائێوە گۆڕەکان مەکەن بەمزگەوت ، من ڕێگەتان بەوە پێنادەم و نەهییتان لێدەکەم .

**شەشەم :** لە ( عبدالله ) کوڕی ( مسعود ) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ : لە پێغەمبەرم بیست کە دیفەرموو " إن من شرار الناس من تدركه الساعة وهم أحياء ، ومن يتخذ القبور مساجد " (٤٢٩) ، واتە : بەڕاستی خراپترینی خەڵك ئەوانەن کەوا قیامەتیان بەسەردا دێت و زیندوون ئەوانەن کە گۆڕەکان دەکەن بەمزگەوت .

**حەوتەم :** لە ( عائشة ) وە . ڕەزای خوای لێ بێت . دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ : " لما كان مرض النبي ﷺ تذاكر بعض نسائه كنيسة بأرض الحبشة يقال لها ( مارية ) ـ وقد كانت أم سلمة وأم حبيبة قد أتتا أرض الحبشة ـ فذكرن من حسنها وتصاويرها . قالت : فقال النبي ﷺ : إن أولئك إذا كان فيهم الرجل الصالح [ فمات ] بنوا على قبره مسجدا ، ثم صوروا فيه تلك الصور ، أولئك شرار الخلق عند الله [ يوم القيامة ] " (٤٣٠) .

واتە : لەکاتی نەخۆشی یەکەی پێغەمبەردا ﷺ هەندی لەخێزانەکانی باسی کەنیسەیەکیان بۆ دەکرد کە لەوڵاتی حەبەشەدا بینیبوویان کە پێی دەووترا ( مارية ) ـ ( أم سلمة ) ، و ( أم حبيبة )

---

(٤٢٨) أخرجه مسلم (٢/٦٧-٦٨) دون سائر الستة ونسبه الشوكاني (٢/١١٤) للنسائي أيضا فلعله يعني ( السنن الكبرى ) له ولم ينسبه في ( الذخائر ) إلا لمسلم وحده نعم أخرجه عوانة في ( صحيحه ) (٢/٤٠١) والزيادة له.

(٤٢٩) أخرجه أحمد (رقم ٣٨٤٤٤١٤٣٤١٤٤٤٣٤٢) بإسناد في حسين عنه . ورواه ابن أبي شيبة وابن حبان في ( صحيحه ) وقال ابن تيمية : ( إسناده جيد ) . وذهل الهيثمي عن كونه في المسند فقال (٢/٢٧) : ( رواه الطبراني في (( الكبير )) وإسناده حسن ) .

(٤٣٠) أخرجه البخاري (١/٤١٦٤٢٢) ومسلم (٢/٦٦-٦٧) والنسائي (١/١١٥) وكذا أبو عوانة (٢/٤٠٠-٤٠١) والبيهقي(٤/٨٠) والسياق لهما وأحمد (٦/٥١)وابن أبي شيبة (٤/١٤٠)والزيادتان له للشيخين وغيرهما.

ڕۆشتبونە وڵاتی حەبەشە . باسی جوانی و ڕازاوەیی و وێنەی کەنیسەکانیان دەکرد . دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی : بەڕاستی ئەوانە ئەگەر پیاوێکی چاك لەناویاندا بمردایە مزگەوتیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرد پاشان لەو وێنانەیان تێدا دروست دەکرد ئەوانە خراپترینی خەڵکن لای خوای گەورە ( لەدوا ڕۆژدا ) .

وە لەم باسەدا چەندین فەرمودەی ترم لە هەندێ هاوەڵی ترەوە هێناوەتەوە لە کتێبی ( تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد ) کە بەڵگەیەکی یەك لاکەرەوەیە لەسەر حەرامێتی کردنی گۆڕ بەمزگەوت لەبەر ئەو نەفرەتانەی کە کراوە لەوانەی کە گۆڕ دەکەن بەمزگەوت ، لەبەر ئەوەیە فەقیە و شەرع زان ( الهيتمي ) لە کتێبی ( الزواجر : ١ / ١٢٠ ــ ١٢١ ) دا لە ڕیزی تاوانە گەورەکاندا لە تاوانی ژمارە ( ٩٣ ) دا فەرموویەتی : کردنی گۆڕە بەمزگەوت ... پاشان هەندێ لەم فەرمودانەی کە لەپێشدا ڕابوورد هێناوەتەوە و جگە لەوانەش کە لەسەر مەرجی ئێمە نین وە پاشان دەفەرموێ : (( وعدُّ هذه من الكبائر وقع في كلام بعض الشافعية ، وكأنه أخذ ذلك مما ذكره من هذه الأحاديث ، ووجهه واضح ، لأنه لعن من فعل ذلك بقبور أنبيائه . وجعل من فعل ذلك بقبور صلحائه شر الخلق عند الله يوم القيامة ، ففيه تحذير لنا كما في رواية ( يحذر ما صنعوا ) ، أي : يحذر أمته بقوله لهم ذلك من أن يصنعوا كصنع أولئك فيلعنوا كما لعنوا ... قال بعض الحنابلة : قصد الرجل الصلاة عند القبر متبركا بها عين المحادة لله ورسوله ، وإبداع دين لما يأذن به الله ، لا نهي عنها ثم إجماعا فإن أعظم المحرمات وأسباب الشرك الصلاة عندها ، واتخاذها مساجد ، أو بناؤها عليها ، والقول بالكراهة محمول على غير ذلك إذ لا يظن بالعلماء تجويز فعل تواتر عن النبي ﷺ لعن فاعله ، وتجب المبادرة لهدمها وهدم القباب التي على القبور ، إذ هي أضر من مسجد الضرار ، لأنها أسست على معصية رسول الله ﷺ ، لأنه نهى عن ذلك ، وأمر ﷺ بهدم القبور المشرفة ، وتجب إزالة كل قنديل أو سراج على قبر ، ولا يصح وقفه ونذره . انتهى )) .

واتە : ژماردن و دانانی ی گۆڕ بەمزگەوت کردن لەڕیزی تاوانە گەورەکان ، دەرکەوتووە لە وتەی هەندێ لە زانایانی شافعی مەزهەبەوە ، وەك بڵێی : ئەمەی لەو فەرمودانەوە وەرگرتووە کە باسی لێوەکردوون . وە ڕووەکەشی ئاشکرایە ، چونکە نەفرەتی کردووە لەوەی ئەوە دەکات بەگۆڕی پێغەمبەران ، وە ئەوانەشی کە ئەمە دەکەن بە گۆڕی پیاوچاکانەوە دایناون بە خراپترینی خەڵك لای خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ، وە ئەمەش ئاگادار کردنەوەی تێدایە بۆ ئێمە وەك لەو ڕیوایەتەدا هاتووە ( يحذر ما صنعوا : ئاگاداری دەدات لەوەی کە ئەوان کردوویانە ) ، واتە ئوممەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە بەو وتەیەی کە بە ئەوانی وت ، لەوەی ئەوە ئەنجام بدەن کە ئەوانە ئەنجامیان داوە ، و پاشان نەفرەتیان لێ دەکرێ وەك چۆن نەفرەت لەوان کرا ... هەندێ لە زانایانی

حەمبەلیەكان دەڵێن : ڕۆشتنی موسڵمان بۆ لای گۆڕ بۆ نوێژكردنی لە لای گۆڕەكە و بۆ تەبەڕوك كردن بێ ئەوە دژایەتی كردنە لەگەڵ خوای گەورە و پێغەمبەرەكەیدا ، وە داهێنانی دینێكە كە خوای گەورە ڕێگەی پێنەداوە ، لەبەر ئەوە نەهیەی كە لەسەری هاتووە وە هەروەها كۆڕای زانایانیش لەسەر حەرامێتی ئەم كارەن . بەڕاستی گەورەترینی تاوانەكان وهۆیەكانی هاوەڵدانان نوێژكردنە لای گۆڕ و كردنێتی بەمزگەوت ، یان خانوو بینا لەسەر كردنی : وە وتنی ئەوەی كە ئەو كارە كەراهەتی هەیە دەخرێتە سەر مەبەستی تر جگە لەوە ، وە ناشبێت گومانی ئەوە بەزانایان ببرێت كە شتێك بەدروست وحەڵاڵ دابنێن كە بەموتەواتری لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ نەفرەتهی لە ئەنجامدەرەكەی بكات ، بەڵكو پێویستە دەست پێشخەری بكرێ بۆ ڕوخاندنی ئەو گومەزی و قوبانەی كە لەسەر گۆڕ دروست كراون لە كاتێكدا ئەوە زیان بەخش ترە لەمزگەوتی ( ضـــرار ) ، چونكە لەسەر سەرپێچی كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ دامەزراوە ، وە لەبەر ئەوەی كە نەهی لەوە كردووە وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كردووە بەڕوخاندن وتێكدانی گۆڕی بەرزكراو ، وە پێویستە هەموو ئەو چرا و داگیرساوانە لە سەر قەبرەكان لا ببرێت ، وە ناشبێت وەقف بكرێن و بكرێن بە نەزر بۆ ئەو گۆڕانە .

**ئەمەو كردنی مزگەوت بەگۆڕ كە باسكرا لەفەرموودەكانی پێشوودا چەند شتێك لەخۆ دەگرێت :**

**یەكەم :** نوێژكردن لای گۆڕ و ڕوتێكردنی لەكاتی نوێژدا .

**دووەم :** سوژدە بردن لەسەر گۆڕەكان .

**سێیەم :** دروست كردنی مزگەوت لەسەر گۆڕ .

واتای دووەم بەئاشكرایی لەكردنی گۆڕ بە مزگەوت دەردەكەوێت ، دوانەكەی تریش لەگەڵ ڕۆشتنە ناویەوە دەقی فەرمودە لەسەر هەموویان هاتووە لەهەندی لە فەرمودەكانی پێشودا . وە بە تێروتەسەلی ئەو باسەم كردووە و وتەی زانایانم بەبەڵگە لەسەری هێناوەتەوە لە كتێبە تایبەتەكەمدا ( تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد ) وە مێژووی ئەوەم باسكردووە كە چ كات گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ خراوەتە مزگەوتە پیرۆزەكەیەوە ، وە ئەمە هیچ پێچەوانە بوونەوەیەكی تێدا نیە لەبەر ئەو فەرمودانەی پێشوو ، وە لەگەڵ ئەوەشدا نوێژكردن لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بەتایبەت هیچ كەراهەتێكی نیە ، وە هەر كەس دەیەوێ وتە لەسەر ئەمە ببینێ بەدرێژی با بۆی بگەڕێتەوە .

١٠ ـ دووبارەكردنەوەی سەردانی گۆڕستان لە كاتێلێكی دیایكراودا ( اتخاذها عيدا ) ، واتە : لە كاتی دیاری كراو و چەند بۆنەیەكی زانراودا بۆ ئەنجامدانی پەرستش لە لایدا ، یاخود جگە لەوە . لەبەر فەرمودەی ( أبو هريرة ) ﷺ كە دەفەرموێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " لا تتخــذوا

قبري عيدا ، ولا تجعلوا بيوتكم قبورا ، وحيثما كنتم فصلوا علي ، فـإن صـلاتكم تـبلغني " [٤٣١] ، واتـه : گۆڕەكەم وا لێمەكەن كە دووبارەو لە كاتێلێكى ديارى كراودا سەردانى بكەن ، وە ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان ، وە لەهەر جێگايەك بن و سەڵاواتم لەسەربدەن ، سەڵاواتەكانتان پێم دەگات .

پاشان شێخى پايەبەرزى ئيسلام لـە ( الاقتضاء : ص : ١٥٥ ــ ١٥٦ ) دەفەرموێ : (( ووجـه الدلالة أن قبر النبي ﷺ أفضل قبر على وجه الأرض ، وقد نهى عن اتخاذه عيدا فقبر غيره أولى بالنهي كائنا مـن كان ، ثم قرن ذلك بقوله ﷺ : " ولا تتخذوا بيوتكم قبورا " أي : لا تعطلوها عن الصلاة فيها والدعاء والقراءة ، فتكون بمنزلة القبور ، فأمر بتحري العبادة في البيوت ، ونهى عن تحريها عند القبور ، عكس ما يفعله المشركون من النصارى ومن تشبه بهم .

قال : فهذا أفضل التابعين من أهل بيته علي بن الحسين رضي الله عنه منهى ذلك الرجل أن يتحرى الدعاء عند قبره ﷺ واستدل بالحديث الذي سمعه من أبيه الحسين عن جده علي . وهو أعلم بمعناه من غيره ، فتبين أن قصده أن يقصد الرجل القبر للسلام عليه ونحوه عند غير دخول المسجد ، ورأى أن ذلك من الدعاء ونحوه اتخاذ له عيدا . وكذلك ابن عمه حسن بن حسن شيخ أهل بيته كره اتخاذه عيدا . فانظر هذه السنة كيف أن مخرجها من أهـل

---

[٤٣١] اخرجه ابو داود (٣١٩/١) واحمد (٣٦٧/٢) بإسناد حسن وهو على شرط مسلم وهو صحيح مما له من طرق وشواهد .

فله طريق اخرى عن أبي هريرة عند أبي نعيم في ( الحلية ) (٢٨٣/٦) .

وله شاهد آخر بنحو هذا من طريق علي بن الحسين عن أبيه عن جده مرفوعا. أخرجه اسماعيل القاضي (رقم ٢٠) وغيره . انظر ( تحـذير الساجد ) (٩٨-٩٩) . وە ئەم فەرمودەيە بەڵگەيە لەسەر حەرامێتى كردنى گۆڕى پێغەمبەران وپياوچاكان بەجەژن .

وله شاهد مرسل بإسناد قوي عن سهيل قال:( رآني الحسن بن الحسن بن علي بن أبي طالب عند القبر ، فناداني وهو في بيت فاطمة يتعشى ، فقال : هلم إلى العشاء ، فقلت : لا أريده . فقال : مالي رأيتك عند القبر ؟ فقلت : سلمت على النبي ﷺ فقال : ( إذا دخلت المسجد فسلم ) ثم قال : إن رسول الله ﷺ قال : ( لا تتخذوا قبري عيدا ، ولا تتخذوا بيوتكم قبورا ، وصلوا علي ، فإن صلاتكم تبلغني حيثما كنتم ، لعن الله اليهود اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد ) . ما أنتم ومن بالاندلس إلا سواء .

واته : سهيل دەفەرموێ حەسەنى كوڕى حەسەنى كوڕ عەلى كوڕى ئەبو تاليب بينيمى لە لاى گۆڕەكە ، بانگى كردم لەماڵى ( فاطمة ) بوو نانى ئێوارەى دەخوارد ، وتى : وەرە لەگەڵم بخۆ ، وتم ناتوانم بخۆم ، فەرمووى چيتە وادەت بينم لاى گۆڕ ؟ وتم : سەلامم لەسەر پێغەمبەر ﷺ كرد فەرمووى : ئەگەر هاتيتە مزگەوتەوە سەلامى لێ بكە ، پاشان فەرمووى : پێغەمبەرى خوا ﷺ فـەرمووى : " گۆڕەكەم وەك جەژن لێمەكەن ، وە ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان ، وە سەڵاواتم لەسەر بدەن ، چونكە سەڵاواتەكانتان پێم دەگات لە هەركوێ يەكدا بن ، نەفرەتى خوا لە جولەكە و گاور بێت ، كە گۆڕى پێغەمبەرانيان دەكرد بەمزگەوت )) ، ئێوە كە لە پاڵ مزگەوتەكەن ، و ئەوانەش كە لە ئەندەلوسن وەك يەكن و هيچ جياوازيەكتان نيە لەو كارەدا .

واته له صەڵاواتداندا . ... رواه سعيد بن منصور كما في ( الاقتضاء ) لابن تيمية وهو عند الشيخ اسماعيل بن اسحاق القاضي في ( فـضل الصلاة على النبي ﷺ ) (رقم٣٠) [ قام بنشره لاول مرة المكتب الاسلامي بتحقيقنا ، فيطلب منه ] دون قوله ( لعن الله اليهود ... ) وكـذا رواه ابن أبي شيبة (١٤٠/٤) مقتصرا على المرفوع منه فقط .

المدينة وأهل البيت الذين هم من رسول الله ﷺ قرب النسب وقرب الدار لأنهم إلى ذلك أحوج من غيرهم فكانوا له أضبط .

والعيد إذا جعل اسما للمكان فهو المكان الذي يقصد الاجتماع فيه وإتيانه للعبادة عنده أو لغير العبادة كما أن المسجد الحرام ومنى ومزدلفة وعرفة جعلها الله عيدا مثابة للناس ، يجتمعون فيها وينتابوها للدعاء والذكر والنسك . وكان للمشركين أمكنة ينتابوها للاجتماع عندها ، فلما جاء الاسلام محا الله ذلك كله . وهذا النوع من الأمكنة يدخل فيه قبور الانبياء والصالحين )) .

واتە : ڕوی بەڵگە ئەوەیە کە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ چاکترین و ڕێزدارترین گۆڕە لەسەر ڕووی زەوی ، لەگەڵ ئەوەشدا نەهی کراوە لەوەی کە بکرێت بەشوێنێك و لە کاتێلێکی دیاریکراودا سەردان بکرێت ، کەوابوو گۆڕی کەسانی تر لە پێشترە کە نەهیەکە بیگرێتەوە ، جا خاوەن گۆڕەکە هەر کەسێك بێت . پاشان لە گەڵ ئەوەشدا ئەم فەرموودەیەی فەرموو : " وە ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕستان " واتە : ماڵەکانتان بەتاڵ مەکەن لە نوێژکردن و پاڕانەوە و دوعاکردن ، بە ئەنجام نەدانی ئەمانەش ماڵەکان دەکەونە پلەی گۆڕستانەوە . بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بەعیبادەت کردن لە ماڵەکاندا ، وە نەهی و ڕێگری کردووە لە عیبادەت کردن لای گۆڕەکان . بە پێچەوانەی ئەوەی کەوا هاوەڵدانەران و گاور و ئەوانەش کە لاسایی ئەوان دەکەنەوە ئەنجی دەدەن .

دەفەرموێ : ئەوە چاکترینی شوێنکەوتوانە لەناو ئەهل و بەیتیدا کە ( علي ) کوڕی ( حسين ) ە . ڕەزای خوایان لەسەر بێ . ڕێگری کرد لەو پیاوە کە لە لای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بپاڕێتەوە ، وە بەڵگەی هێنایەوە بەو فەرمودەیەی کە لەباوکیەوە ( حسين ) بیستبوی ئەویش لە باپیریەوە ( علي ) ، بێگومان ئەو شارەزاترە بەواتەکەی لەکەسانی تر . وەڕون بویەوە کە مەبەستی ئەو پیاوە گۆڕ بوو بۆ ئەوەی سەلامی لەسەر بکات وە هاوشێوەی ئەمانە کە نەچوبێتە ناو مزگەوتەوە وەوای بینی کە ئەمە لەپاڕانەوە و هاوشێوەیەتی و کردنیەتی وەك جەژن لە دووبارە بوونەوە . وە بەهەمان شێوە کوڕە ئاموزاکەی ( حسن ) ی کوڕی ( حسن ) کە شێخی ئەهل و بەیتی بووە پێی ناخۆش بووە کە گۆڕی پێغەمبەر وەکو جەژنی لێ بکرێت . جا بڕوانە سەراو و سەرچاوەی ئەم سوننەتە چۆن لەناو خەڵکی مەدینە و ئەهل و بەیتەوە دەردەچێت ، ئەوانەی کەوا نەسەبیان و ماڵیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ نزیکە ، ئەوان لەخەڵکی پێویست تربوون بۆ ئەوە ئەوان زیاتر پارێزگاریان لێ ئەکرد .

وە ( العيد ) ئەگەر بووە ناوێك بۆ جێگایەك ، ئەوە بریتیە لەو جێگایەی کە کۆبونەوەی تێدا دەکرێت ، وە هاتن بۆی بە مەبەستی عیبادەت لەو جێگایە و یاخود بۆ جگە لە عیبادەتیش ، هەروەك چۆن خوای گەورە ماڵی خوا و مینا و موزدەلیفە و عەرەفەی داناوە بە جێگای کۆبونەوەی خەڵکی لە کاتی دیاریکراودا ، و شوێنی پاداشت بۆ خەڵکی ، کە تێیدا کۆببنەوە و بڕۆن بۆ

پاڕانەوە و زیكر و حەج كردن لەوێدا . وە هاوەڵدانەرانیش چەندەها جێگەیان هەبوو سەردانیان دەكردن و تێیدا كۆدەبونەوە ، بەڵام كاتێ ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات خوای گەورە هەموو ئەمانی لابرد و نەیهێشتن . وە گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكانیش دەچێتە ڕیزی هاوشێوەكانی ئەم جێگایانەوە .

پاشان شێخ لە ( ص : ١٧٥ ـــ ١٨١ ) دا دەفەرموێ : (( ولهذا كره مالك ﷺ وغيره من أهل العلم لأهل المدينة كلما دخل أحدهم المسجد أن يجيء فيسلم على قبر النبي ﷺ وصاحبيه ... قال : وإنما يكون ذلك لاحدهم إذا قدم . من سفر أو أراد سفرا ونحو ذلك ورخص بعضهم في السلام عليه إذا دخل المسجد للصلاة ونحوها ، وأما قصده دائما للصلاة والسلام فما علمت أحدا رخص به ، لأن ذلك نوع من اتخاذه عيدا ... مع أنه قد شرح لنا إذا دخلنا المسجد أن نقول : السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته [٤٣٢] ...كما نقول ذلك في آخر صلاتنا .

قال : فخاف مالك وغيره أن يكون فعل ذلك عند القبر كل ساعة نوعا من اتخاذ القبر عيدا .

وأيضا فإن ذلك بدعة فقد كان المهاجرون والأنصار على عهد أبي بكر وعمر وعثمان وعلي ﷺ يجيئون إلى المسجد كل يوم لعلمهم ﷺ بما كان النبي ﷺ يكرهه من ذلك وما نهاهم عنه ، وأنهم يسلمون عليه حين دخول المسجد والخروج منه ، وفي التشهد كما كانوا يسلمون عليه كذلك في حياته .

وما أحسن ما قال مالك : لن يصلح آخر هذه الأمة إلا ما أصلح أولها ، ولكن كلما ضعف تمسك الأمم بعهود أنبيائهم ، ونقص إيمانهم ، عوضوا ذلك بما أحدثوه من إلبدع والشرك وغيره ، لهذا كرهت الأمة استلام القبر وتقبيله . وبنوه بناء منعوا الناس أن يصلوا إليه .

قال : وقد ذكرنا عن أحمد وغيره أنه أمر من سلم على النبي وصاحبيه ، ثم أراد أن يدعو أن ينصرف فيستقبل القبلة ، وكذلك أنكر ذلك من العلماء المتقدمين كما لك وغيره ، ومن المتأخرين مثل أبي الوفاء بن عقيل وأبي الفرج ابن الجوزي ، وما أحفظ لا عن صحابي ولا عن تابعي ولا عن إمام معروف أنه استحب قصد شئ من القبور للدعاء عنده ولا روى أحد في ذلك شيئا ، لا عن النبي ﷺ ولا عن أصحابه ، ولا عن أحد من الائمة المعروفين ، وقد صنف الناس في الدعاء وأوقاته وأمكنته وذكروا فيه الاثار ، فما ذكر أحد منهم في فضل

---

[٤٣٢] قلت : لم أر هذه الصيغة في شئ من الاحاديث الواردة في آداب الدخول إلى المسجد والخروج منه ، وأخذها من مطلق قوله : ( إذا دخل أحدكم المسجد فليسلم على النبي ﷺ . . . الحديث أخرجه أبو عوانة في صحيحه ( ١ / ٤١٤ ) وأبو داود في سننه ( رقم ٤٦٥ ) ، فمما لا يخفى بعده ، لا سيما وقد جاءت الصيغة في حديث فاطمة رضي الله عنها بلفظ ( السلام على رسول الله ، اللهم صل على محمد وعلى آل محمد ) . أخرجه القاضي اسماعيل ( ٨٢ – ٨٤ ) وغيره . وانظر ( نزل الابرار ) ( ٧٢ ) . و ( الكلم الطيب ( رقم ٦٣ بتحقيقي وضع المكتب الاسلامي ) .

الدعاء عندها شيء من القبور حرفا واحدا فيما أعلم ، فكيف يجوز والحالة هذه أن يكون الدعاء عندها أجوب وأفضل ، والسلف تنكره ولا تعرفه وتنهى عنه ولا تأمر به !؟ قال : وقد أوجب اعتقاد استجابة الدعاء عندها وفضله أن تنتاب لذلك وتقصد ، وربما اجتمع عندها اجتماعات كثيرة في مواسم معينة . وهذا بعينه هو الذي نهى عنه النبي ﷺ بقوله : " لا تتخذوا قبري عيداً " .

قال : حتى إن بعض القبور يجتمع عندها في يوم من السنة ، ويسافر إليها إما في المحرم أو رجب أو شعبان أو ذي الحجة أو غيرها . وبعضها يجتمع عندها في يوم عاشوراء ، وبعضها في يوم عرفة ، وبعضها في النصف من شعبان . وبعضها في وقت آخر . بحيث يكون لها يوم من السنة تقصد فيه . ويجتمع عندها فيه . كما تقصد عرفة ومزدلفة ومنى في أيام معلومة من السنة ، وكما يقصد مصلى المصر يوم العيدين . بل ربما كان الاهتمام بهذه الاجتماعات في الدين والدنيا أهم وأشد ومنها ما يسافر إليه من الأمصار في وقت معين أو وقت غير معين لقصد الدعاء عنده والعبادة هناك ، كما يقصد بيت الله الحرام لذلك ، وهذا السفر لا أعلم بين المسلمين خلافا في النهي عنه .

قال : ومنها ما يقصد الاجتماع عنده في يوم معين من الاسبوع . وفي الجملة هذا الذي يفعل عند هذه القبور هو بعينه الذي نهى عنه رسول الله ﷺ بقوله : " لا تتخذوا قبري عيدا " فإن اعتياد قصد المكان المعين في وقت معين عائد بعود السنة أو الشهر أو الأسبوع ، هو بعينه معنى العيد ثم ينهى عن دق ذلك وجله ، وهذا هو الذي تقدم عن الامام أحمد إنكاره . قال ( يعني أحمد ) : وقد أفرط الناس في هذا جدا وأكثروا . وذكر ما يفعل عند قبر الحسين .

ثم قال الشيخ : ويدخل في هذا ما يفعل بمصر عند قبر نفيسة وغيرها . وما يفعل بالعراق عند القبر الذي يقال : إنه قبر علي ﷺ وقبر الحسين وحذيفة بن اليمان و ... و ... وما يفعل عند قبر أبي يزيد البسطامي إلى قبور كثيرة في أكثر بلاد الإسلام لا يمكن حصرها .

قال : واعتياد قصد هذه القبور في وقت معين ، والاجتماع العام عندها في وقت معين ، هو اتخاذها عيدا كما تقدم ، ولا أعلم بين المسلمين أهل العلم في ذلك خلافا . ولا يغتر بكثرة العادات الفاسدة ، فإن هذا من التشبه بأهل الكتابين الذي أخبرنا النبي ﷺ أنه كائن في هذه الامة . وأصل ذلك إنما هو اعتقاد فضل الدعاء عندها ، وإلا فلو لم يقم هذا الاعتقاد في القلوب لا نمحى ذلك كله . فإذا كان قصدها يجر هذه المفاسد كان حراما كالصلاة عندها وأولى وكان ذلك فتنة للخلق وفتحا لباب الشرك وإغلاقا لباب الايمان )) .

واتە : ئا لەبەر ئەمە بووە كە پێشەوا ( مالك ) و جگە لەو لە ئەهلی عیلم . واتە زانایان . ، بە مەكروهیان داناوە . بۆ خەڵكی مەدینە . كە هەموو كات كە یەكێكیان دەچێتە مزگەوتەوە بڕوات سەلام لەسەر گۆڕی پێغەمبەر و دوو هاوەڵە بەڕێزەكەی بكات ... دەفەرموێت : ئەمە تەنها بۆ ئەوانەیانە كە بگەڕێتەوە لەسەفەر یان بیەوێ سەفەر بكا ، و لە گەڵ هاوشێوەی ئەمانە . وە

هەندێکیان . واتە لە زانایان . ڕێگەیان داوە بە سەلام کردن لە سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بۆ نوێژ بچێتە مزگەوت یان جگە لەوە ، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت بەبەردەوامی سەلامی لێ بکات ئەوە نازانم هیچ کەسێك ڕێگەی بەوە دابێت ، چونکە ئەوە جۆرێکە لە شوبهاندنی مزگەوتەکەی بە جەژن ... لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی داوین ئەگەر ڕۆشتینە مزگەوتەوە بڵێین : ( السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته ) ، وەك چۆن ئەوە دەڵێین لە کۆتایی نوێژەکانماندا .

فەرمووی : پێشەوا ( مالك ) و جگە لەویش ترساوون لەوەی کە هەموو ساتێك ئەنجامدانی ئەوە لە لای گۆڕدا جۆرێك بێت لە کردنی گۆڕ بەجەژن ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەو کارە بیدعەیە . چونکە لە کاتی خۆیدا کۆچکەران وپشتیوانان لەسەر دەمی ( أبو بكر عمر وعثمان وعلي ) ﷺ هەموو ڕۆژێك دچوونە مزگەوتەکەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی پێ ناخۆش بووە ئەوەی کە نەهی لێکردن ، وە ئەوان تەنها لەکاتی چوونە مزگەوت و دەرچووندا سەلامیان لێدەکرد وەك چۆن سەلامیان لێ دەکرد لە نوێژەکانیان لەوکاتەی کە لەژیاندا بوو ﷺ .

چەند جوانە ئەو وتەیەی پێشەوا ( مالك ) کە دەفەرموێ : کۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێ تەنها بەوە نەبێ کە پێشینەکەی پێ چاك بووە . بەڵام چەندە ئوممەتان دەست گرتنیان بەسونەت وفەرمانی پێغەمبەرانیانەوە . عليهم السلام . کەمتر بێت و ئیمانیان پوچەڵبێتەوە ، ئەوا لەجێی ئەوەدا بیدعە و هاوەڵ دانان وجگە لەوانەش جێگای دەگرێتەوە ، ئالەبەر ئەوەیە کە زانایان بەگشتی دەست گرتن بە گۆڕ و ماچکردنیان بەحەرام داناوە . وە هەروەها بینا و خانوویەکیان لەسەر کردووە کە ڕێگری کردنی خەڵکی دەکات لەوەی کە پێی بگەن .

دەفەرموێ : وە لە پێشدا لە پێشەوا ( أحمد ) وجگە لەویش گێڕاومانەتەوە ، کە فەرمانی دەکرد بە هەرچ کەسێك کە سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ و دوو هاوەڵە بەڕێزەکەی دەکات ، وپاشان گەر بیەوێ بپاڕێتەوە ئەوە ڕووی لە گۆڕ وەر بگێڕێ و ڕووبکاتە قیبلە ، وە بەهەمان شێوە زانایانی کۆن ئەوەیان ئینکار کردووە وەك : پێشەوا ( مالك ) و جگە لەویش . وە لە زانایانی پاشینیش وەك : ( أبو الوفاء ابن عقيل ) و ( أبو الفرج ابن الجوزي ) یش .

وە نەشمزانیوە لە هاوەڵان یاخود شوێنکەوتووان یان پێشەوایەکی ناسرا و کە ڕۆشتنی بۆ لای گۆڕ بۆ دوعا و پاڕانەوەپێ سوننەت بووبێ . وە هیچ کەس لەم بارەیەوە هیچی نەگێڕاوەتەوە نە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ، وەنەش لە هاوەڵە بەڕێزەکانیەوە ﷺ وە نەش لە یەکێك لە پێشەوایانی ناسراوەوە ، وە زۆرێك لە زانایان نوسینیان کردووە لە بارەی پاڕانەوە و دوعا و کاتی وەڵامدانەوە و جێگایەوە ، و چەندین ڕیوایەتیان تێدا باسکردووە . کەچی هیچ کەسێکیان باسی . تەنانەت

پیتێکیشیان . نەکردووە کە پاڕانەوە لای گۆڕەکان هیچ چاکە وپلە وڕێزێکی تێدا بێت ، ئەوەندەی کە لە سنوری زانینی مندا بێت .

کەوابوو مادام بەم شێوەیە بێ ئیدی چۆن دەبێ کە پاڕانەوە لای گۆڕ وەڵامدراوەتر وچاکتر بێ ؟!! وە پێشین ( سلف ) ئینکاریان کردووە وپێیان نەزانیبێت ونەهیان لێکردووە وفەرمانیان پێ نەکردووە !؟

دەفەرموێ : باوەڕبوون بەبەڕێزی گۆڕەکە و وەڵام دانەوەی بۆیان ئەوە پێویست دەکات کە مەبەستیان گۆڕ بێ و بۆ ئەو مەبەستەش بێن بۆ لای گۆڕ . وە لەوانەیە خەڵکی کۆببنەوە بەکۆبوونەوەیەکی زۆر لە کاتێکی دیاری کراودا ، ئەمەش خودی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بەو فەرمودەیەی نەهی لێکردووە و کە دەفەرموێ : " ولا تتخذوا قبري عيداً " ، واتە : وە گۆڕەکەم مەکەن بە جەژن .

وە دەفەرمووێ : تەنانەت هەندێ لە گۆڕەکان خەڵکی لای کۆدەبنەوە لەساڵێکدا یەك ڕۆژ ، وە سەفەری بۆ دەکەن لە مانگی موحەڕەمدا یان لە ڕەجەب یان لە شەعبان یاخود ( ذي الحجـة ) یان هەر مانگێکی تر . وە هەندێ خەڵك لای کۆدەبنەوە لە عاشورادا ، وە هەندێکیان لە ڕۆژی عەرەفەدا ، وە هەندێکیان لە نیوەی مانگی شەعباندا ، وە هەندێکیان لە کاتێکی تردا . بەشێوەیەك لە ساڵێکدا ڕۆژێك ، کە ئەوان دەیانەوێ لەو ڕۆژەدا کۆببنەوە لای گۆڕەکە . وەك چۆن عەرەفە و موزدەلیفە و مینا خەڵکی لە ڕۆژانی دیاری کراودا لە ساڵەکەدا بۆی کۆدەبنەوە ، وەك کۆبوونەوە مسریەکان لەنوێژگەی شاردا بۆ نوێژی دوو جەژنەکە . بگرە لەوانەشە گرنگی پێدانی بەو کۆبوونەوانە لەدین و دونیا گرنگتر و لەپێشتر بێت !!! وە تیایاندایە کە سەفەر دەکات لە جێگای دوورەوە بۆ لای ئەو گۆڕانە لەکاتی دیاری کراودا ، یاخود بەبێ دیاری کردنی کات بۆ پاڕانەوە و عیبادەت کردن لای ئەو گۆڕەدا !!! وەك چۆن سەردانی ماڵی خوای گەورە بێت ، بۆ ئەو عیبادەتانە . وە نازانم هیچ جوداییەك لەناو موسڵمانانادا هەبێت لەنەهی کردن لەسەر ئەم سەفەر کردنە .

دەفەرمووێت : وە تیایاندا هەیە لە هەفتەیەکدا ڕۆژێك لە کاتی دیاری کراودا لایدا کۆدەبنەوە ، وە بە گشتی ئەوەی کە لە لای گۆڕەکاندا ئەنجام دەدەرێت ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردووە بەو وتەیەی کە تێیدا فەرموویەتی : " ولا تتخذوا قبري عيداً " ، وە هەرچ کەسێك بڕوات بۆ جێگایەکی دیاری کراو ، و لە کاتێکی دیاری کراودا ، ساڵانە یان مانگانە یاخود هەفتانە بێت ئەوە بۆ خۆی واتای جەژنە ، بۆیە دەبێت نەهی لە ورد و درشتی بکرێت . وە ئەمەش ئەوەیە کە پێشەوا ( أحمد ) ئینکاری دەکرد و لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد . فەرموویەتی ( مەبەست پێشەوا أحمد ە ) : وە خەڵکی زۆر زیاد ڕەویان کردووە لەمەدا بە زۆری . پاشان باسی ئەوە دەکات کە خەڵك لای گۆڕی ( حسين ) دا ئەنجامی ئەدەن رضي الله عنه .

پاشان شێخ دەفەرموێ : وە ئەوەش كە لە میسر لاى گۆڕى نەفیسە و جگە لەویش ئەنجام ئەدرێ دەچێتە ژێر ئەم نەهى لێ كردنەوە ، وە هەروەها ئەوەش كە لە عێراقدا ئەنجام ئەدرێ لاى ئەو گۆڕەى كە دەڵێن ئەوە گۆڕى ( علي ) یە ﷺ ، وە ئەوەش كە لاى گۆڕى ( حسين ) و ( حذيفة ) ى گۆڕى ( اليمان ) و ... و ... دەكرێت ، وە ئەوەش كە لاى گۆڕى ( أبو يزيد البسطامي ) ئەنجام ئەدرێ ، وە ئەوەش كە لاى گۆڕێكى زۆر لە وڵاتانى موسڵماندا كە ناتوانرێ كورت هەڵبهێنرێ و باس بكرێ .

دەفەرموێ : وە خوراهێنان بە سەردانى ئەو گۆڕانە لە كاتێكى دیارى كراودا ، و كۆبوونەوەى گشتى لەكاتێكى دیاریكرا و لایاندا ، بریتییە لە شوبهاندنى بە جەژن . وەك لە پێشدا باسكراوە ، وە ناشزانم كە ڕا جودایيەك هەبێت لە نێوان موسڵمانان و ئەهلى عیلمدا لەسەر ئەمە ، بۆیە هەڵمەخەڵەتێ و چەواشە مەبە بە زۆرى ئەو داب و نەریتە گەندەڵ و خراپانە ، چونكە ئەمە لە خۆشوبهاندنە بە خاوەن كیتابەكانەوە كە پێغەمبەر ﷺ هەواڵى پێداوین كە ئەمە دەبێ لەناو ئەم ئوممەتەدا . وە بنچینە و ڕەگى ئەمەش بڕوابوونە بەوەى كە پاڕانەوە لاى ئەو گۆڕانە چاكترە ، ئەگینا ئەگەر ئەم بیر وباوەڕە نەبوایە لە دڵەكاندا ئەوا هەمووى دەسڕایەوە و نەدەما . وە ئەگەر سەردان و ڕۆشتن بۆ لاى لە لاى ئەم خراپەیەى لێبكەوێتەوە ، ئەوا حەرام دەبوو ، وەك چۆن نوێژكردن لایدا حەرامە ، بەڵكو لە پێش تریش . وە ئەوەش فیتنەیەكە بۆ خەڵك وە كردنەوەى دەرگاى هاوەڵ دانان و داخەرى دەرگاى بیروباوەڕ و ئیماندارى و یەكتا پەرستییە .

دەڵێم ( ئەلبانى ) : وە ئەوەش كە ڕۆژانە دەبینرێ لاى گۆڕى پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە كە چۆن خەڵكى لەپاش هەموو نوێژەفەرزەكان بۆ سەلام كردن لەسەر پێغەمبەر ﷺ و پاڕانەوە لاى گۆڕەكەى و دەنگ بەرزكردنەوە لەپاڕانەوەیاندا دەڕۆنە لاى قەبرەكەى !!! تاكو مزگەوت پڕدەبێت بەغەڵبە غەڵب وهاتوو هاواریان ، بەتایبەت لەكاتى حەجدا تاكو وەك ئەوەى كە لە سوننەتەكانى نوێژ بێت ! بەڵكو زیاتر لە سوننەتەكان پارێزگارى لێدەكەن و بەردەوامن لەسەرى !!! وە ئەمە ڕودەدات و فەرمان ڕەوایان دەیبینن و دەیبیستن ، كەچى هیچ كەسێكیشیان ئینكارى و ڕێگرى لێ ناكەن . ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) وە بە پەژارە و داخەوە بۆ نامۆیى دین و هەڵگرانى ، تەنانەت لە مزگەوتى پێغەمبەردا ﷺ كە پێویستە پارێزراوترین و دوورترین جێگا بێت لەپاش كەعبەى پیرۆز كە ماڵى خواى گەورەى لەسەرپێچى فەرمان و ئاینەكەیەوە ﷺ .

ئەمەو لە وتەى شێخى پایەبەرزى ئیسلام ( ابن تيمية ) ڕابورد بوو كە هەندێ لە ئەهلى عیلم . واتە : زانایان . ڕێگەیان داوە بەڕۆشتن بۆ سەر گۆڕى ڕێزدارى پێغەمبەرى خوا بۆ سەلام كردن لێى لەكاتى چونە مزگەوتەوە بۆ نوێژ و هاوشێوەكانى ، وەك ئەوەى بڵێیت ئەو ڕێگە پێدانە پەیوەست كردبێت بەوەى بەزۆرى وبەردەوامى نەكرێت ، بە بەڵگەى ئەو وتەیەى كە لە دواییدا فەرموویەتى :

(( وأما قصده دائما للصلاة والسلام فما علمت أحدا رخص فيه )) ، واته : بەڵام ئەگەر مەبەستى بە سەلام كردن بەبەردەوامى بێت ئەوە پێنازانم كە هيچ كەسێك ڕێگەی پێدابێت .

ئەڵێم ( ئەلبانى ) : ئەم ڕێگەپێدانەی كە شێخى ئيسلام دەيگێڕێتەوە لەهەندێ ئەهلى عيلمەوە ئەوەيـە لـە كاتێكـدا پـشتى پێدەبەسـترێ و متمانـەی دەكرێتـە سـەر ئەگـەر پەيوەسـت بكـرێ بـەو مەرجەی كە باسمان كرد ، ئەوا دروستە ناو بەناو و جارجار بچن بۆ سەلام كردن لە گۆڕی پيرۆزی پێغەمبەر ﷺ ، چونكە ئەوە وەك ديـار و ئاشكرايە بەجەژن كردنـى گۆڕەكە نيە ، وە سـەلام كـردن لەسـەر پێغەمبـەر و دوو هاوەڵـە بەڕێزەكـەی دروسـت و ڕێگـە پێـدراوە بـە بەڵگـەی گـشتى ، بۆيـە دروست نييە ئەو ڕێگە پێدانە بەگشتى نەفى بكرێت لەبەر نەهيكردنى پێغەمبەر ﷺ لەسەر كردنى گۆڕەكەی بە جەژن ، ئـەوەش لـە بـەر تـوانينى كۆكردنـەوەی بەڵگـەكان ، لـە گـەڵ ئـەو تێبينيـەی كە باسمان كرد ، وە ئەوەشى لێنەكەوێتەوە كە ئێمە نازانين كە هيچ يەكێك لە پێشين ( سلف ) ئەوەيان ئەنجام دابێت ، چونكە ( عدم العلم بالشيء لا يستلزم العلم بعدمه ) ، واتـە : زانـست نـەبوون بەشـتێك ، نـەزانين بـە پێـچەوانەكەی پێويـست ناكـات ، وەك زانايـان دەفـەرمون ، بۆيـە لـەم شـێوە مەسـەلانەدا بەڵگـە گـشتيەكان بەسـن بـۆ چەسـپاندنى دروسـتى و ڕێگـە پێـدنى ، مـادام شـتێك بەپێـچەوانەيەوە نەچەسپاوە لەوەی كە هێنامانەوە . لەسەر ئەوەش شێخى ئيسلام لە ( نــافع ) ەوە دەگێڕێتـەوە كـە دەفەرموێ : (( كان ابن عمر يسلم على القبر ، رأيته مائة مرة أو أكثر يجيء إلى القبر فيقول : السلام على النبي ﷺ السلام على أبي بكر السلام على أبي ، ثم ينصرف )) ، واته : سەد جار يان زياتر بينيومە ( ابن عمر ) دەچـووە سـەر گۆڕەكـە و سـەلامى لەسـەر گـۆڕ دەكـرد و دەهـات بـۆ لای گـۆڕی پێغەمبـەر ﷺ و دەيفەرموو سەلام لەسەر پێغەمبەر ﷺ سەلام لەسەر ابو بكر سەلام لەسەر باوكم ، پاشان دەڕۆشت ، وا دەردەكەوێ كە ( ابن عمر ) ئەمەی لەكاتى نيشتەجێيدا ئەنجام ئەدا نەك لە كاتى سـەفەركردن ، چونكە وتەی سەد جار ئەوە دوور دەكاتەوە كە ئەم ڕيوايەتە لە سەر سەفەر كردن لێكبدرێتەوە .

١١ ـ سەفەركردن بۆ زيارەتى گۆڕ :

ئەمەش چەند فەرمودەيەكى لەسەر هاتووە لەوانەش :

يەكەم : ( أبو هريرة ) ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموويـەتى : " لا تـــشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد : المسجد الحرام ، ومسجد الرسول ﷺ ، ومسجد الاقصى " ، واته : كۆڵ و بار ناپێچرێتەوە بۆ سەفەركردن بەمەبەستى زيارەت كردن تـەنها بـۆ سـێ مزگـەوت نـەبێت : مزگـەوتى كەعبەی پيرۆز كە ماڵى خوايە ، و مزگەوتى پێغەمبەر ﷺ ، و مزگەوتى ئەقسا .

وە لە ڕيوايـەتێكى تـردا هـاتووە : " إنما يسافر إلى ثلاثة مساجد : مـــسجد الكعبـــة ، ومـــسجدي ،

ومسجد إيلياء " [٤٣٣] ، واتە : تەنها سەفەر بۆ سێ مزگەوت دەكرێت : مزگەوتی كەعبە ، و مزگەوتەكەی من ، و مزگەوتی ئیلیا .

دووەم : لە ( أبو سعيد الخدري ) ەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی : بیستوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " لا تشد ( وفي لفظ : لا تشدوا ) الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد : مسجدي هذا ، والمسجد الحرام ، والمسجد الأقصى " [٤٣٤] .

واتە : كۆڵ و بار مەپێچەوە ( لە گۆیەكی تردا هاتووە : كۆڵ و بار مەپێچنەوە ) بەمەبەستی سەفەركردن ئیللا بۆ سێ مزگەوت نەبێت ، كە ئەوانیش : ئەم مزگەوتەی من ، و مزگەوتی كەعبەی پیرۆز كە ماڵی خوایە ، و مزگەوتی ئەقسایە .

سێیەم : لە ( أبو بصرة الغفاري ) ەوە دەگێڕنەوە رۆژێكیان لە كاتی گەڕانەوەیدا چاوی بە ( أبو هريرة ) ﷺ كەوت ، و ئەویش پێی فەرموو : لە كوێوە دێت ؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی : لە كێوی ( طور ) ەوە هاتووم ، رۆشتم نوێژم تیا ئەنجام دا ، فەرمووی : بەڵام من ئەگەر پێت بگەشتایەم نەمدەهێشت برۆی ، چونكە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو : " لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد : المسجد الحرام ، ومسجدي هذا ، والمسجد الاقصى " [٤٣٥] .

---

[٤٣٣] اخرجه البخاري باللفظ الاول ومسلم باللفظ الاخر من طريق ثان عنه وأخرجه من الطريق الاول أصحاب السنن وغيرهم . وله طريق ثالث عند أحمد (٥٠١/٢) والدارمي (٣٣٠/١) وقد خرجت الحديث مبسوطا في (الثمر المستطاب) .

[٤٣٤] اخرجه الشيخان وغيرهما وله عنه أربعة طرق أوردها في المصدر السابق واللفظ الاخر لمسلم .

والطريق الرابعة : يرويها شهر بن حوشب وعنه اثنان :

أحدهما : ليث بن أبي سليم عنه قال : لقينا أبا سعيد ﷺ ونحن نريد الطور ، فقال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : " لا تعمل المطي إلا ... " الحديث .

والآخر : عبد الحميد بن بهرام عنه قال : سمعت أبا سعيد الخدري ﷺ وذكرت عنده صلاة الطور ، فقال : قال رسول الله ﷺ : " لا ينبغي للمطي أن تشد رحاله إلى مسجد يبتغى فيه الصلاة غير المسجد الحرام " الحديث . أخرجهما أحمد (٩٣٦٤/٣) .

وشهر ضعيف وقد تفرد بهذه الزيادة " إلى مسجد يبتغي فيه الصلاة " فهي منكرة لعدم ورودها في الطرق الاخرى عن أبي سعيد حتى ولا في طريق ليث عن شهر وكذلك لم ترد في الاحاديث الاخرى وهي ثمانية وغالبها لها أكثر من طريق واحد وقد سقتها كلها في (الثمر المستطاب) فعدم ورود هذه الزيادة في شئ من هذه الاحاديث على كثرتها وتعدد مخارجها لاكبر دليل على نكارة الزيادة وبطلانها . فهي من أوهام شهر بن حوشب أو الراوي عنه عبد الحميد فإن فيه بعض الضعف من قبل حفظه وقال الحافظ في ترجمة شهر من ( التقريب ) : (( صدوق كثير الاوهام )) .

[٤٣٥] اخرجه الطيالسي (١٣٤٨) وأحمد (٧/٦) والسياق له وإسناده صحيح . وله عند أحمد طريقان آخران إسناد الاول منهما حسن والاخر صحيح .

وأخرجه مالك والنسائي والترمذي وصححه من الطريق الثالث إلا أن أحد الرواة أخطأ في سنده فجعله من مسند بصرة بن أبي بصرة . وفي متنه حيث قال : ( لاتعمل المطي ) .

واتە : کۆڵ و بار مەپێچەوە ( لە گۆیەکی تردا هاتووە : کۆڵ و بار مەپێچنەوە ) بەمەبەستی سەفەرکردن ئیللا بۆ سێ مزگەوت نەبێت ، کە ئەوانیش : ئەم مزگەوتەی من ، و مزگەوتی کەعبەی پیرۆز کە ماڵی خوایە ، و مزگەوتی ئەقسایە .

چوارەم : ( قزعة ) بۆمان دەگێڕێتەوە ، و دەفەرموێت : ویستم دەرچم و بڕۆم بۆ کێوی ( طور ) ، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆم پرسیارم لە ( ابن عمر ) کرد ﷺ ؟ ئەویش فەرمووی : ئەما ئەوەی کەمن بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : ئایا نەتزانیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد : المسجد الحرام ، ومسجد النبي ﷺ ، والمسجد الاقصى " ، جا واز بێنە لە ڕۆشتنت بۆ کێوی ( طور ) نەڕۆی بۆ ئەوێ [٤٣٦] ، واتە : کۆڵ و بار ناپێچرێتەوە بۆ سەفەرکردن بەمەبەستی زیارەت کردن تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت : مزگەوتی کەعبەی پیرۆز کە ماڵی خوایە ، و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ، و مزگەوتی ئەقسا .

وەلەم فەرمودانەوە دەردەکەوێت کە سەفەر کردن بۆ هەر جێگایەك لە جێگا پیرۆزەکان ، وەك گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان ، چونکە ئەگەر چی شێوازی ڕستەکە نەفیە ( واتە : کۆڵ و بار ناپێچرێتەوە ) ، بەڵام واتی نەهی کردنە ، هەروەك پێشەوا ( الحافظ ) فەرموویەتی : ئەم ووتەیە لە سەر شێوازی ووتەی خوای گەورەیە کــە فــەرموویەتی : ﴿ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ ﴾ ( سورة البقرة : ١٩٧ ) ، وە هەروەکو ئەوەیە کە پێشەوا ( القرطبي ) فەرموویەتی : (( هو أبلغ من صـــريح النهي ، كأنه قال : لا يستقيم أن يقصد بالزيارة إلا هذه البقاع ، لاختصاصها بما اختصت به )) ، واتـە : ئەمـە لـە پێشترە لـەوەی کـە ئەگـەر نەهیەکە بەڕاشکاوی ببایـە ، هـەروەکو ئەوەیـە بڵێـت : دروسـت نیـە مەبەستت بەو سەردان وزیارەت کردنە هەر جێگایەك بێت ، تەنها ئەو جێگایانە نەبێت ، لەبەر ئەو تایبەت مەندیانەی کە تایبەت کراوە پێیان .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەوەش کە بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی کە نەفی کردنە لێرەدا بەواتای نەهی کردنە ، ئەو ڕیوایەتەی پێشەوا ( مسلم ) ە کە لە فەرموودەی دووەمدا یە ئەویش : ( لا تــشدوا ) ، واتە : سەفەرمەکەن ، پاشان پێشەوا ( الحـــافظ ) فەرموویـەتی : (( وتـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : ( إلا إلى ثلاثة مساجد ) جۆری ( الاستثناء ) ەکەی لە جۆری ( الاستثناء المفـــرغ ) ە ، ئەو کاتە ڕستەکە بەم شێوە دەبێت : ( لا تشد الرحـــال إلى موضـــع ) ، واتـە : کۆڵ و بـار ناپێچرێتەوە بەمەبەسـتی سـەفەر و زیـارەت کـردن بـۆ هـیچ شـوێنێك ، وە ئـەم وتەیـەش ئـەوە دەخوازێـت کـە

---

[٤٣٦] أخرجه الازرقي ( في أخبار مكة ) (ص ٣٠٤) بإسناد صحيح رجاله رجال الصحيح وأورد المرفوع منه الهيثمي في ( المجمع ) (٤/٤) ، وقال : (( رواه الطبراني في الكبير والاوسط ورجاله ثقات )) .

سەفەركردن قەدەغەیە بۆ هەموو شوێنێك جگە لەم شوێنانە ، چونكە ( المستثنى ) لە جۆری ( الاستثناء المفرغ ) دا بە تەواوترین گشتی تەقدیر دەكرێت ، بەڵام لێرەدا دەتوانرێت مەبەست بەو گشتی یە لێرەدا تایبەت بێت كە مزگەوتەكەیە )) .

ئەڵێم ( ئـەلبانی ) : ئەم ئەگەرەی پێشەوا ( الحـــافظ ) بۆچوونێكی لاوازە ، وتەی ڕاستیش تەقدیركردن و واتای یەكەمە ، ئەوەش لە بەر ئەوەی كە لە فەرموودەی ( أبو بصرة ) ەو ( ابن عمـــر ) هاتبوو لە ئینكار كردنی سەفەر كردن بۆ كێوی ( الطور ) .

پاشان پێشەوا : ( الحافظ ) دەفەرموێ : (( وفي هذا الحديث فضيلة هذه المساجد ، ومزيتها على غيرها لكونها مساجد الانبياء ، ولأن الأول قبلة الناس وإليه حجهم ، والثاني كان قبلة الأمم السالفة ، والثالث أســس على التقوى )) ، واتە : وە ئەم فەرمودانە ڕێز و پلە وپایەی ئەم مزگەوتانەی تێدایە ، وە ڕێزی داون بەسەر مزگەوتەكانی تردا لەبەر ئەوەی كە مزگەوتی پێغەمبەرانن . عليهم الصلاة والســلام ـ چونكە یەكەمیان ڕووگەی موسڵمانانە ، وەدیسان حەجیشیان هەر لەوێدایە ، وە دووەمیشیان ڕووگەی ئوممەتانی پێشوو بووە ، وە سێیەمیش لەسەر پارێزكاری وتەقوا بنیات نراوە .

ئەڵێم: ئەم بۆ چونە لاوازە وتەی هەڵبژاردە و ڕەوا بۆچونی دووەمە كـــە لـــە پێشدا ڕابوورد لە فــــەرمودەی ( أبو بصرة ) ، و ( ابن عمـــر ) دا كــــە ئینكاری سەفەركردنیان دەكـــرد بــــۆ كێوی ( طور ) ، وەك دەچینە سەری .

وە دەفەرمووێ ( واتە : پێشەوا الحافظ ابن حجر ) : (( واختلف في شد الرحال إلى غيرها ، كالذهاب إلى زيارة الصالحين أحياء وأمواتا وإلى المواضع الفاضلة ، لقصد التبرك بها ، والصلاة فيها ، فقال الشيخ أبو محمد الجويني [٤٣٧] : ( يحرم شد الرحال إلى غيرها عملا بظاهر الحديث ) ، وأشار القاضي حسين إلى اختياره ، وبه قال عياض وطائفة ، ويدل عليه ما رواه أصحاب السنن من إنكار أبي بصرة الغفاري على أبي هريـــرة خروجـــه إلى الطور ، وقال له : ( لو أدركتك قبل أن تخرج ما خرجت ) ، واستدل بهذا الحديث ، فدل على أنه يـــرى حمـــل الحديث على عمومه ، ووافقه أبو هريرة . والصحيح عند إمام الحرمين وغيره من الشافعية أنه لا يحرم ، وأجابوا عن الحديث بأجوبة :

١ ـــ منها أن المراد أن الفضيلة التامة إنما هي شد الرحال إلى هذه المساجد بخلاف غيرها فإنه جائز ، وقـــد وقع في رواية لاحمد سيأتي ذكرها بلفظ : ( لا ينبغي للمطي أن تعمل ) ، وهو لفظ ظاهر في غير التحريم .

٢ ـــ ومنها أن النهي مخصوص بمن نذر على نفسه الصلاة في مسجد من سائر المساجد غير الثلاثة ، فإنه لا

---

[٤٣٧] هو عبدالله بن يوسف شيخ الشافعية ووالد إمام الحرمين عبد الملك بن عبد الله ، كان إماما في التفسير والفقه والادب . مات سنة (٤٣٨) .

يجب الوفاء به ، قاله ابن بطال .

٣ ــ ومنها أن المراد حكم المساجد فقط ، وأنه لا تشد الرحال إلى مسجد من المساجد للصلاة فيه غير هذه الثلاثة ، وأما قصد غير المساجد لزيارة صالح أو قريب أو صاحب ، أو طلب عالم أو تجارة أو نزهة ، فلا يدخل في النهي ، ويؤيده ما روى أحمد من طريق شهر بن حوشب قال : سمعت أبا سعيد ــ وذكرت عنده الصلاة في الطور ــ فقال : قال رسول الله ﷺ : ( لا ينبغي للمطي أن تشد رحاله إلى مسجد تبتغى فيه الصلاة غير المسجد الحرام والمسجد الأقصى و مسجدي ) . وشهر حسن الحديث ، وإن كان فيه بعض الضعف )) .

وە ڕا وبۆچونی جیاواز هەیە بۆ سەفەرکردن و ڕۆشتن بۆ سەردانی جگە لەم سێ مزگەوتە ، وەکو سەردانی پیاوچاکان زیندوو بن یا مردوو ، وە بۆ ئەو جێگایانەی ڕێزدارن بۆ مەبەستی پیرۆزی و تەبەڕوك کردن پێیان ، و نوێژکردن تیایاندا ، شێخ ( محمد الجويني ) دەفەرموێ : حەرامە سەفەرکردن بۆ غەیری ئەو سێ مزگەوتانە بەکارکردن بەڕوکەشی فەرمودەکە ) وە ( قاضي حسين ) ئەو هەڵبژاردەیەی دەست نیشان کردووە وە ( قاضي عياض ) و دەستەیەکیش بەو شێوەیەیان وتووە ، وە ئەوەش دەبێتە بەڵگە لەسەری کە خاوەنی پەرتۆکەکانی سوننەتدا دەیگێڕنەوە کە ( أبو بصرة ) ی ( الغفاري ) ئینکاری دەرچونی ( أبو هريرة ) ی کرد بۆ کێوی ( طور ) وە پێی وت : ئەگەر پێت بگەشتمایە پێش ئەوەی دەرچم ئەوا دەر نەدەچووم ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ( أبو بصرة ) وای بینیوە کە ئەم فەرمودەیە بەڕووە گشتیەکەی لێك دەدرێتەوە ، وە ( أبو هريرة ) ش هاودەنگ بووە لە گەڵیدا . وە ڕەوا و ڕاست لای ئیمامی حەرەمەین [٤٣٨] و جگە لەویش لە زانا شافعی مەزهەبەکان ئەوەیە کە سەفەر کردن بۆ جگە لەسێ مزگەتەکە حەرامە نیە ، وە بەم شێوەیە لەسەر ئەم فەرمودەیە وەڵام ئەدەنەوە :

١ ـ لەوانە : مەبەست بەڕێز و پلەو پایەی تەواو کە تەنها سەفەرکردن بێت بۆ ئەو سێ مزگەوتانە بە پێچەوانەی مزگەوتی ترەوە دروستە . وە ئەمەش ڕوو دەدات لە گێڕاەنەوەیەك لە پێشەوا ( أحمد ) ەوە کە ئێستا دەچینە سەر باسکردنی بە گوێ : (( لا ينبغي للمطي أن تعمل )) وە ئەمەش گوێیەکی دیار و ڕوونە بۆ غەیری حەرام .

٢ ـ وە لەوانەش : نەهی کردنەکە تایبەتە بەو کەسەی کە نەزر لەسەر خۆی ئەکات نوێژ بکات لە مزگەوتێك لە ناو هەموو مزگەوتەکان جگە لەو سێ مزگەوتە ، ئەوە بۆی دروست نیە کە نەزرەکەی بەجێ بگەیەنێ ، ( ابن بطال ) ئەمەی فەرمووە .

---

[٤٣٨] عبدالله کوڕی یوسفی شێخی شافعی یەو باوکی ئیمامی حەرەمەین عبدالملك کوڕی عبدالله یە ، کە پێشەوا بووە لە تەفسیر و فیقە و ئەدەبدا لە (٤٣٨) دا وەفاتی کردووە .

٣ . وە لەوانەش مەبەست بەم حوکمە تەنها بۆ ئەو مزگەوتەکانەیە ، کە دروست نیە سەفەر بکرێت بۆ هیچ مزگەوتێك لە مزگەوتەکان بۆ نوێژ کردن تێیدا جگە لەو سێ مزگەوتە نەبێت ، بەڵام ئەگەر سەردانەکە بۆ جگە لەو مزگەوتەکان بێت ، بۆ زیارەت کردنی دۆستێك یان پیاوچاکێك یان هاورێیەك یان بۆ وەرگرتن و فێربوونی زانست و بازرگانی و سەیران ئەوا ئەمانە ناچنە ژێر ئەو نەهی لێ کردنەوە . وە ئەوەش کە پشت گیری ئەمە دەکات ئەو ریوایەتەیە کە پێشەوا ( أحمـد ) لە رێگەی ( شهر ) ی کوڕی ( حوشـب ) ەوە دەیگێڕێتەوە و دەفەرموویێت : لە ( أبـو سـعيد ) ەوە بیستوومە . لە کاتێکدا باسی نوێژکردنی لە لاکرا لە کێوی ( طور ) . ئەویش فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " لا ينبغي للمطي أن تشد رحاله إلى مسجد تبتغى فيه الصلاة غير المسجد الحرام والمسجد الأقصى و مسجدي " ، واتە : دروست نیە هیچ گوێدرێژێك ( مطي ) باری لێتووند بکرێت بە مەبەستی سەفەرکردن بۆ نوێژکردن لە مزگەوتێکدا جگە لە مزگەوتی حەرام ( کەعبەی پیرۆز ) ومزگەوتی ئەقصا ( قودس ) ، و مزگەوتەکەی من ( مزگەوتی مەدینە ) ، وە ( شـهر ) ناسراوە بەوەی کە فەرمودەکانی ( حسن ) ە ئەگەر چی هەندێ ( ضعف ) ی تێدایە .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ( حافظ ) . ڕەحمەتی خوای لێبێ . نەرمی و ئاسانی نواندووە لەوەی کە دەربارەی ( شهر ) دەیفەرموێ : کە ناسراوە بە ( حسن ) ێتی فەرمودە ، لەگەڵ ئەوەشدا لە ( تقريب ) دا دەربارەی دەفەرموێ : (( كثير الأوهام )) وەك لەپێشدا ڕابوورد ، وە زانراویشە کە هەرچ کەس بەو شێوەیە بێت ئەوای فەرمودەی لاوازە و پشتی پێ نابەسترێ ، وەك ( حافظ ) خۆی دانی پێداناوە لە ( شرح النخبة ) ، پاشان وادابنە کە پلەی فەرمودەی ( حسن ) بێت ، ئەوە لە کاتێکدا بەو شێوەیە دەبێت کە پێچەوانەی ریوایەتەکانی تر نەبێت ، ئەمما ئەو لێرەدا پێچەوانەی هەموو ئەو فەرمودە گێڕەرەوانەیە کە فەرمودەیان لە ( أبو سـعيد ) ەوە گێڕاوەتەوە ، وە ئەوانەش کە لەغەیری ئەوەوە فەرمودەکەیان لە هاوەڵانی ترەوە گێڕاوەتەوە وەك لەپێشدا ڕوونمان کردەوە . کەوابوو چۆن دەبێت فەرمودە ( حسن ) بێت لەگەڵ هەموو ئەو موخالەفەیشیدا !!؟ بەڵکو لەم حاڵەتەدا فەرمودەکە ( منكر ) دەبێت ، بەبێ هیچ گومان ودوو دڵی یەك ، زیاتریش لەسەر ئەمە ئەو زیادەیەی کە وتویەتی ( إلى مسجد ) لە فەرمودەکەدا لە ( شهر ) خۆیەوە نەسەلمێنراوە ، ( عبد الحميد ) لە ئەوەوە باسی دەکات ، بەڵام ( ليث ) ی کوڕی ( أبو سليم ) لە ( شهر ) ەوە باسی ناکات و نایگێڕێتەوە . ئەم ریوایەتەش لە ( شهر ) ەوە لە پێشترە لە بەر هاوکۆکێتی لە گەڵ ئەو ریوایەتانەی کە ( الثقات ) دەیگێڕنەوە هەروەك زانیت .

هەروەها بەتێڕامان و بیرکردنەوە لە فەرمودەکەی ( شـهر ) دەبینی بەڵگەیەکی تری تێدایە لەسەر بەتاڵی ئەم زیادەیەی کە لە فەرمودەکەدا باسکراوە ، وە ئەویش ئـەو وتەیەیە کە دەڵێ : ((

أن أبا سعيد الخدري احتج بالحديث على شهر لذهابه إلى الطور )) كەوا ( أبو سعيد الخدري ) ئەو فەرمودەیەی كردووە بە بەڵگە بەسەر ( شهر ) ەوە لە ڕۆشتنیدا بۆ كێوی ( طور ) ، جا ئەگەر ئەو زیادەیەی تێدا بێت كە حوكمەكە تایبەت دەكات بە مزگەوتەوە جگە لە جێگا ڕێزدارەكان ، ئەوا دروست نەبو بۆ ( أبو سعيد ) ئەو فەرمودەیە بكات بەبەڵگە بەسەریەوە ، چونكە كێوی ( طور ) بریتی نیە لە مزگەوت ، بەڵكو تەنها ئەو كێوە پیرۆزەیە كـە خوای گەورە لەسەری قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ( موسى ) دا كرد . عليه السلام . . ئەگەر ئەم زیادەیەی فەرمودەكە سەلماو بێت ئەوا فەرمودەكە كێوی ( طور ) ناگرێتەوە . وە یان بە بەڵگە كردنی ئەم فەرمەدەیە لە لایەن ( أبو سعيد ) ەوە بەو سەهوە و بڕوا پێكراو نیە ، و نابێت ( شهر ) و ئەوانەی لە گەڵیدان لێی بێدەنگ بن . ئا هەموو ئەمانە ئەوە دووپات دەكەنەوە كە ئەم زیادەیە بەتاڵە و هیچ بنچینەیەكی نیە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێت ، بەمەش لەوانەی كە پێشدا ڕابوورد ئەوە جێگیر بوو كە هیچ بەڵگەیەك نیە فەرمودەكە تایبەت بكات بە مزگەوتەكانەوە ، وە پێویستە نەهیەكە لەسەر گشتیەتیەكەی خۆی بهێڵرێتەوە ، ئەوەی كە ( أبو محمد الجويني ) وئەوانەش كە لە گەڵیدا باسكران ، وە هەر ئەوەشە كە وتەی ڕەوا بێت .

**ئەوەمان لەسەر ماوە كە وەڵام وەڵامی یەكەم ودووەم بدەینەوە ، بۆیە ئەڵێم ( ئەلبانی ) :**

١ . ئەو وەڵامە هەڵەیە لەدوو ڕووەوە :

یەكەم : ئەو گۆیەی كە كردوویانە بە بەڵگە (( لا ينبغي ... )) نەسەلمێنراوە لە فەرمودەكەدا ، چونكە تەنها ( شهر ) باسی كردووە كە ئەویش ( ضعيف ) ە ، وەك پێشتر ڕوونكرایەوە .

دووەم : ئەگەرچی ئەو گۆیە سەلمێنراو ( ثابت ) بوو ، ئەوە دیسان مل كەچ نابین بۆ ئەوەی كە لە ڕووكەشدا وادەردەكەوێ كە حەرام نیە . بەڵكو وتەی ڕەوا و ڕاست پێچەوانەكەیەتی ، وە بەڵگەش لەقورئان وسوننەتدا لەسەر ئەوە زۆرە كە هەندێكیان دەهێنمەوە بە بەڵگە :

أ . ووتەی خوای گەورە كە فەرموویەتی : ﴿ قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ ﴾ ( سورة الفرقان :١٨ ) .

ب . فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی : " لا ينبغي أن يعذب بالنار إلا رب النار " [٤٣٩] ، واتە : دروست نیە بۆ هیچ كەسێك كەسێك سزا بدات بە ئاگر ، تەنها پەروەردگاری ئاگر نەبێت .

ج . وە " لا ينبغي لصديق أن يكون لعانا " [٤٤٠] ، واتە : دروست نیە بۆ كەسێكی ڕاست گۆ نەفرەت كاربێت .

---

[٤٣٩] رواه أبو داود (٢٦٧٥) من حديث ابن مسعود والدارمي (٢٢٢/٢) من حديث أبي هريرة .

[٤٤٠] رواه مسلم .

د . وە " إن الصدقة لا تنبغي لآل محمد ... " [٤٤١] ، واتە : بەڕاستی سەدەقە و بەخشین بۆ کەس وکار و ئال وبەیتی پێغەمبەر ﷺ دروست نیە .

هـ . وە " لا ينبغي لعبد أن يقول : إنه خير من يونس بن متى " [٤٤٢] ، واتە : دروست نیە بۆ بەندەیەك بڵێت : من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتی .

سێیەم : واش دابنە کە فەرموودەکە لەڕووکەشدا وادەرکەوت کە حەرام نیە ، ئەوە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەکروهە ، لە کاتێکدا کە ئەوان بەم شێوەیە یـــــان نەفەرمووە ، پێشەوا ( النووي ) لە ( شرح مسلم ) دا دەفەرموێ : (( الصحيح عند أصحابنا أنه لا يحرم ولا يكـره )) ، واتە : وتەی ڕاست لای هاوەڵانمان ئەوەیە کە نەحەرامە و نەش مەکروهە ! کەواتە لە هەموو حاڵەتێکدا فەرمودەکە بەڵگەیە بەسەریانەوە .

٢. بێگومان ئەم وەڵامەش وەکو ئەوەی پێشتر هەڵەیە هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت ، چونکە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر تایبەت مەندێتی ، بۆیە پێویستە لەسەر گشتییەکەی بمێنێتەوە ، بەتایبەت ئەگەر پشت گیر کرابێ بەتێگەیشتنی ئەو هاوەڵانەی کـــە فەرمودەکەیان گێڕاوەتەوە : ( أبو بصرة ، أبو هريرة ، ابن عمر ، أبو سعيد ، ئەگەر ئەوەی ئەمیش ڕاست وسەحیح بێت ) هەموو ئەمانە کردوویانە بە بەڵگە لەسەر ڕێگری لە سەفەرکردن بۆ کێوی ( طـور ) ، بێگومان ئەوانیش شارەزا تربوون بەمەبەستی فەرمودەکە لەکەسانی تـر ، لەبەر ئەوەیە کە پێشەوا ( الصنعاني ) لــــە ( سبل السلام : ٢ / ٢٥١ ) دەفەرمووێت : (( وذهب الجمهور إلى أن ذلك غير محرم ، واستدلوا بما لا ينهض وتأولوا أحاديث الباب بتأويل بعيدة ، ولا ينبغي التأويل إلا بعد أن ينهض على خلاف ما أولوه الدليل )) ، واتە : وە زۆرینەی زانایان بۆ ئەوە ڕۆشتوون کە ئەوە حەرام نیە ، بەڵام شتی وایان کردووەتە بەڵگە کە ناکرێت بکرێتە بەڵگە ، وە فەرمودەکانی ئەم باسە تەئویل دەکەن بەتەئویلێکی دوور ، وە دروست نیە تەئویل بکرێ مەگەر لەپاش ئەوەی کە بەڵگەیەکت بۆ دەرکەوێ بە پێچەوانەیەوە تەئویل کراوە .

پاشان ئەوەشی بۆ زیاد کردووە لە ( فتح العلام : ١ / ٣١٠ ) : (( ولا دليل والأحاديث الواردة في الحث على الزيارة النبوية وفضيلتها ليس فيها الأمر بشد الرحل إليها ، مع أنها كلها ضعاف أو موضـوعات ، لا يصلح شيء منها للاستدلال ، ولم يتفطن أكثر الناس للفرق بين مسألة الزيارة وبين مسألة السفر إليها ، فـصرفوا حديث الباب عن منطوقه الواضح بلا دليل يدعو إليه )) ، واتە : وە هیچ بەڵگەیەك نیە لەو بارەیەوە ، و ئەو فەرمودانەش کە لەبارەی هاندانەوە هاتوون بۆ زیارەت کردنی گۆڕ پێغەمبەر ﷺ و پلە و

---

[٤٤١] رواه مسلم .

[٤٤٢] رواه البخاري .

پایەی زیارەت کردن ، فەرمانی ئەوەی تێدا نیە کە سەفەری بۆ بکرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ئەو فەرمودانە ( ضعيف ) یاخود ( موضوع ) ن ، وە هیچ لەو فەرمودانە دروست نیە بکرێت بەبەڵگە ، لەبەر نەتوانینی زۆربەی خەڵکی بۆ جیاوازی کردن لەنێوان مەسەلەی زیارەت کرن وسەفەر بۆ کردنیدا ، لەبەر ئەوە فەرمودەی ئەم باسە لادەدەن لەواتا ڕوونەکەی بەبێ بەڵگەیەك کە بیخوازێ و پێویستی بکات .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : لەبەر ئەو بێ ئاگاییەی کە ئاماژەی بۆ کرا ، شێخ ( السبكي ) ـ خوای پەروەردگار لە ئێمە و ئەویش ببورێت . شیخی ئیسلام ( ابن تيمية ) تۆمەتبار دەکات بەوەی کە ئینکاری زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەکات ئەگەر بەبێ سەفەر بۆ کردن بێت ، لەگەڵ ئەوەی یەکێکە لەوانەی کە سەردانی گۆڕەکەی باس کردووە لەگەڵ ڕێز وپلە وپایە وئادابی سەردان کردنی ، ئەوەش لە زیاتر لە کتێبێك لە کتێبە چاکەکانی [٤٤٣] .

وە ( الحافظ محمد بن عبدالهادي ) یش ڕونکردنەوەی ئەم ڕاستیە و ڕەتکردنەوەی ئەم تۆمەتەی ( السبكي ) خستوەتە ئەستۆی خۆی و پێی هەستاوە لە نوسینێکی گەورەدا کە ناوی ناوە ( الصارم المنكي في الرد علي السبكي ) ، کە تێیدا چەندەها دەقی تێدا لە ( ابن تيمية ) وە گێڕاوەتە لەسەر دروستی زیارەت کردنی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بەبێ سەفەر بۆ کردنی ، وە چەندین فەرمودەی لەبارەی ڕێز وپلە وپایەی گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ تێدا هێناوەتەوە ، وە بەدوور و درێژی لەسەری دواوە ، وە ئەوەشی کە ( ضعيف ) و هەڵبەستراوە تێیدا ڕونی کردۆتەوە ، وە چەندین سودی زۆری فیقهی و فەرمودەیی وتاریخی تری تێدایە ، کە شایانی ئەوەیە هەموو قوتابیەکی زانست خواز بیزانێ و ئاگاداری بێت .

پاشان بەڕاستی سەرنجی ڕاست ودروست ئەوەیە کە حوکم دەدرێت بەدروستی وتەی ئەوانەی کە بۆ ئەوە ڕۆشتوون فەرمودەکە لەسەر گشتێتی یەکەیەتی ، چونکە ئەگەر بەپێی گۆکراوەکەی بێت ئەوە ڕێگری سەفەر کردن دەکات بۆ هەموو مزگەوتێك جگە لە سێ مزگەوتەکە نەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا زانراوە کە پەرستن لە هەرمزگەوتێکدا بێت چاکترە لە دەرەوەی مزگەوت بکرێت . وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : " أحب البقاع إلى الله المساجد " ، واتە : خۆشەویست ترین جێگا لەلای خوای گەورە مزگەوتەکانە ... ئەگەر چی مزگەوتەکەش ئەو مزگەوتە بێت کە لەسەر تەقوا بنیات نراوە کە ئەویش مزگەوتی قوبائە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێ : " صلاة في مسجد قباء كعمرة " ، واتە : نوێژکردن لەمزگەوتی قوبا وەکو عومرە کردنێك وایە . جا

---

[٤٤٣] وەکو کتێبی ( مناسك الحج ) مەکەی ( ٣ / ٣٩٠ ) لە ( مجموعة الرسائل الكبرى ) دا .

ئەگەر بەو شێوەیە بێت ئەوە ئەولاتر ئەوەیە کە فەرمودەکە ڕێگری سەفەرکردن بکات بۆ غەیری ئەو جێگایە ، بەتایبەت ئەگەر سەفەرەکە بۆ مزگەوتێ بێت لەسەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ یان گۆڕی پیاوچاکێ بنیات نرابێ بەمەبەستی نوێژکرن تیایدا و پەرستن لایدا ، وە ئەوەشت زانی نەفرەت کراوە لەو کەسەی ئەمە ئەنجام ئەدات ، ئایا دەچێتە عەقڵەوە کە خوای گەورەی کار بەجێ ودانا چاو پۆشی کردبێ لە سەفەرکردن بۆ هاوشێوەی ئەمانە وڕێگری ومەنعی سەفەرکردنی کربێ بۆ مزگەوتی قوبا ءا؟

پوختەی وتە ئەوەیە کە شێخ ( محمد الجويني ) شافعی مەزهەب و جگە لەویش بۆی ڕۆشتوون ، کە سەفەر بۆ کردن جگە لە سێ مزگەوتەکان حەرامە ، وەك شوێنە پیرۆز و ڕێزدارەکان ، وە ئەوەش ئەوەیە کە پێویستە هەڵبیژرێت ، بێگومان هەر ئەوەشە کە هەڵبژاردەی زانایانی لێکۆڵەر و ناسراوەکانە ، ئەو زانایانەی کە ناسراوون بەسەربەخۆییان لە تێگەیشتنیاندا ، و ڕۆچون و وردبوونەوەیان لە فیقهدا لە خوای گەورە و پێغەمبەرەوە ﷺ ، وەك : دوو شێخی پایەبەرزی ئیسلام ( ابن تيمية ، و ابن القيم ) ڕەحمەتی خوایان لێبێت ، کە چەندین توێژینەوە و بەدوادا چونی بەسود و زۆریان هەیە لەم مەسەلە گرنگەدا . وە لەو بەڕێزانەش شێخ ( ولي الله الدهلوى ) ، وە لە وتەکانی کە لەسەر ئەمە لە ( الحجة البالغة : ١ / ١٩٢ ) فەرمویەتی : ((كان أهل الجاهلية يقصدون مواضع معظمة بزعمهم يزوروها ويتبركون بها ، وفيه من التحريف والفساد ما لا يخفى ، فسد ﷺ الفساد ، لئلا يلحق غير الشعائر بالشعائر ، ولئلا يصير ذريعة لعبادة غير الله ، والحق عندي أن القبر ، ومحل عبادة ولي من الاولياء والطور كل ذلك سواء في النهي )) ، واتە : نەفامەکان سەردانی هەندێك جێگا دەکەن کە گەورەیان کردووەتەوە بە گومانی خۆیان بۆ زیارەت و سەردان کردن وتەبەرووك پێوە کردن و پیرۆزی ، وەئەمەش چەندان خراپە و گەندەڵی و لادانی تێدایە کە شاراوە نیە . پێغەمبەری خوا ﷺ بەربەستی ئەم فەسادەی کردووە ، بۆ ئەوەی ئەوانەی لە درووشمەکانی ئیسلام نین نەنوسێن و پەیوەست نەکرێن بە درووشمەکانیەوە ، وە بۆ ئەوەش سەرنەکێشێ بۆ پەرستنی جگە لەخوای گەورە ، وەحەق و ڕاستی لای من ئەوەیە کە گۆڕ ، وە جێگای عیبادەتی دۆستێك لە دۆستانی خوای گەورە وە هەروەها کێوی ( طور ) هەر هەموویان یەکسانن لە نەهی کردنەکەدا .

وە چاکوایە لە کۆتایی ئەم توێژینەوە و بەدواداچونەدا ئاگاداری ئەوە بدەین سەبارەت بەوەی کە سەفەر کردن بۆ بازرگانی وەرگرتنی زانست ناچنە ژێر ئەم نەهی لێ کردنەوە . بە ڕاستی گەر سەفەر تەنها بۆ بەدەست هێنانی پێویستیەکە نەك بۆ تایبەت کردنی جێگایەك وە هەروەها سەفەرکرد بۆ سەردانی برایەکت بێت لەبەر خوا ئەوە مەبەستە ، وەك ( ابن تيمية ) لە ( الفتاوي : ٢ / ١٨٦ ) دا فەرموویەتی .

١٢ ـ داگیرساندنی چرا ( هاوشێوەکانی ) لە لای گۆڕدا . بەڵگەش لەسەر ئەمە چەن شتێکە :

یەکەم : بیدعەیکی نوێە و پێشتر پێشینە پیاوچاکان ( السلف الصالح ) ئەمەیان نەزانیوە و پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : " کل بدعة ضلالة ، وکل ضلالة في النار " [444] ، واتە : هەموو بیدعەیەك گومڕاییە ، وە هەموو گومڕاییەکیش لە ئاگردایە .

دووەم : ماڵ بەفیڕۆدانە کە ئەویش نەهی لێ کراوە بەدەقی فەرمودە وەك لە پێشدا ڕابورد لە : ( بابەتی : ، پەڕەی : ) .

سێیەم : خۆ شوبهاندنی تێدایە بە مەجوسە ئاگر پەرستەکانەوە ، شەرع زان ( ابن حجر الهيتمي ) لە ( الزواجر : ١ / ١٣٤ ) دا فەرموویەتی : (( صرح أصحابنا بحرمة السراج على القبر ، وإن قل حيث لم ينتفع به مقيم ولا زائر وعللوه بالإسراف وإضاعة المال والتشبه بالمجوس ، فلا يبعد في هذا أن يكون كبيرة )) ، واتە : هاوەڵانمان بە ڕاشکاوی وتویانە کە داگیرساندنی مۆم و چرا لەسەر گۆڕ گەرچی کەمیش بێت حەرامە لەکاتێکدا کە سود بە مردووان و زیارەت کارانیش ناگەیەنێت ، وە ئەم حەرامەیان پەیوەست کردووە بەوەی کە زیادە ڕەوی و ماڵ بەفیڕۆدانە ، وە خۆ شوبهاندن و لاسایی کردنەوەی ئاگر پەرستانە وە دووریش نیە لەوەی کە لەتاوانە گەورەکان بێت .

ئەڵێم : بەڵگەی یەکەمی نەهێناوەتەوە لە گەڵ ئەو ( تەعلیل ) کردنەی کە باسمان لێوەکرد لەگەڵ ئەوەی کە بەڵگەیە لەو بارەیەوە ، بەڵکو بگرە بەهێزترین بەڵگەشە لەسەر ئەوە ، چونکە ئەوانەی کە چرا و هاوشێوەکانی دادەگیرسێنن لەسەر گۆڕەکان تەنها . بەگومانی . خۆیان مەبەستیان بەو کارەیان خۆنزیك کردنەوەیانە لەخوای گەورە ، نەك مەبەستیان ڕوناککردنەوە بێت بۆ ئەوانەی کە تێیدا دەمێننەوە یان ئەوانەی لەوێدان لەزیارەت کاران ، بە بەڵگەیەی ئەوەی ئەوان ئەو شتانە لەکتێکدا دادەگیرسێنن کە خۆر ڕوناکە و لە ناوەڕاستی ئاسماندایە و نیوەڕۆیە ! جا لەبەر ئەمەیە ئەو کارەیان بیدعە و گومڕاییە .

ئەگەر وترا بۆچی بەڵگە ناهێننەوە بەو فەرمودە مەشهورەی کە پێشەوایانی خاوەن سوننەکان وجگە لەوانیش لە ( ابن عباس ) ەوە رضي الله عنه دەیگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: " لعن الله زائرات القبور ، والمتخذين عليها المساجد والسرج " .

واتە : نەفرەتی خوا لەو ئافرەتانە بێت کە زۆر سەردانی گۆڕەکان دەکەن ، وە ئەوانەش کە مزگەوتیان لەسەر دروست دەکەن ، ومۆم وچرای لەسەر دادەگیرسێنن .

وە وەڵامم بۆ ئەوە : ئەم فەرمودەیە لەگەڵ ئەوەی کە مەشهورە کەچی لە ڕووی ئیسنادەوە ( ضعيف ) ە و ناکرێت بەبەڵگە ، ئەگەر چی زۆرێك لە نووسەران لەم باسەدا نەرمیان نواندووە و

---

[444] رواه النسائي وأبن خزيمه في ( صحيحه ) بسند صحيح .

هێناویانەتەوە و لەسەر هۆكارەكەشی بێدەنگ بوون ، هەروەك ( ابن حجر الهيتمي ) وایكردووە لە ( الزواجر ) دا وە ( ابن القيم ) یش لەپێش ئەو لە ( زاد المعاد ) دا ، وە زۆرێك لە سەلەفیەكان و ئەهلی حەدیس بەم فەرمودەیە فریویان خواردووە و بەڵگەیان پێهێناوەتەوە لە كتێب ونووسراو و وتارەكانیاندا .

وە لەسەر ئەمە من پێشتر ڕەخنەم لە ( ابن القيم ) گرتووە لە ( تعليق ) ێكمدا لەسەر كتێبەكەیدا ، وە بەدرێژی لەوێدا هۆی فەرمودەكەم ڕوون كردۆتەوە ، پاشان لە ( سلسلة الأحاديث الضعيفة ، برقم : ٢٢٣ ) ، پاشان بینیم كە ( ابن القيم ) لە ( تهذيب السنن : ٤ / ٣٤٢ ) دا لە ( عبدالحق الإشبيلي ) یەوە گێڕاویەتیەوە كە لە سەنەدی فەرمودەكەدا ( باذام ) ی هاوەڵی ( الكلبي ) هەیە كەلای ئەوان زۆر ( ضعيف ) ە و ( ابن القيم ) یش دانی پێدا ناوە ، سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر سەرخستنی .

بەڵام ڕستەی یەكەم لە فەرمودەكە ( صحيح ) ە و دوو ( شاهد ) یشی هەیە لە فەرمودەكەی ( أبو هريرة ) ، و ( حسان ) ی كوڕی ( ثابت ) كە هەردووكیانم هێناوەتەوە لەم بابەتی ( ١٩ ) دا .

بەڵام ڕستەی دووەمیش دیسان ( صحيح ) ە ، و واتاكەشی ( متواتر ) ە ، وە لەم بەشەدا باسم كردووە لە بابەتی حەوتەم كە حەوت فەرمودەی ( صحيح ) دەبن بە ( شاهد ) بۆی .

١٣ــ شكاندنی ئێسكی مردوو : بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ كە فەرموویەتی : " إن كسر عظم المؤمن ميتا ، مثل كسره حيا " [٤٤٥] ، واتە : شكاندنی ئێسكی ئیماندار

---

[٤٤٥] أخرجه أبو داود (٢/٦٩) وابن ماجه (١/٤٩٢) والطحاوي في ( المشكل ) (٢/١٠٨) وابن حبان في ( صحيحه ) (رقم ٧٧٦ موارد) وابن الجارود في ( المنتقى ) ( ص ٥٥١ ) والدار قطني في سننه (٣٦٧) والبيهقي (٤/٥٨) وأحمد (٦/٢٦٤٠٠٢٨٢٦١٥٠١٨٥) واللفظ له وأبو نعيم في ( الحلية ) (٧/٩٥) والخطيب في ( تاريخ بغداد ) (١٢/١٠٦١٣: ١٢٠) من طرق عن عمرة عنها .

قلت : وبعض طرقه صحيح على شرط مسلم وقواه النووي في ( المجموع ) (٥/٣٠٠) وقال ابن القطان : ( سنده حسن ) كما في ( المرقاة ) (٢/٣٨٠) . وله طريقان آخران عن عائشة رضي الله عنها .

الاول : عند أحمد (٦/١٠٠) :

والاخر: عند الدار قطني ( ٣٦٧ ) .

وله شاهد من حديث أم سلمة . أخرجه ابن ماجه ( الحاشية : وعزاه في ( الامام ) لمسلم ورد عليه كما في ( فيض القدير ) و ( الامام ) كتاب عظيم جدا في الاحكام لابن دقيق العيد ، قال الذهبي : ( ولو كمل تصنيفه وتبييضه لجاء في خمسة عشر مجلدا ) .) وزاد في آخره : ( في الاثم ) .

لكن إسناده ضعيف وهي عند الدار قطني في الحديث الاول في بعض طرقه من الوجه الاول . لكن الظاهر أنها مدرجة في الحديث فإن في رواية أخرى له بلفظ : ( يعني في الاثم ) . فهذا ظاهر في أن هذه الزيادة ليست من الحديث بل هي من تفسير بعض الرواة ويؤيده رواية لاحمد بلفظ : ( قال : يرون أنه في الاثم . قال عبد الرزاق أظنه قول داود ) .

قلت : يعني داود بن قيس وهو شيخ عبد الرزاق فيه . ومن الظاهر أن هذا التفسير هو المراد من الحديث وبه جزم الطحاوي وعقد له بابا

به مردووی وەكو ئەوە وایە كە بە زیندوویی بشكێنرێت .

فەرمودەكەش بەڵگەیە لە سەر حەرامێتی شكاندنی ئێسكی مردووی بڕوادار ، بۆیە لە پەرتوكی حەنبەلیٚ یەكاندا هاتووە كە : (( ويحرم قطع شيء من أطراف الميت ، وإتلاف ذاته ، وإحراقه ، ولو أوصى به )) ، واتە : حەرامە شتێك لە ئەندامەكانی مردوو ببڕدرێت ، یان لەش و جەستەی لە ناو بدرێت ، یان بسووتێنرێت ، ئەگەر چی وەسێتیشی بەوە كردبێت .

بەهەمان شێوە لە ( كشاف القناع : ٢ / ١٢٧ ) وە بەهەمان شێوەش لەهەموو مەزهەبەكاندا هاتووە ، بەڵكو شەرع زان ( ابن حجر ) لە ( الزواجر : ١ / ١٣٤ ) دا لە تاوانە گەورەكانی داناوە ، و فەرموویەتی : (( لما علمت من الحديث أنه ككسر عظم الحي )) [٤٤٦] .

---

خاصا في ( مشكله ) فليراجعه من شاء .

[٤٤٦] حەنبەلیەكان زیادەڕۆیان لەمەدا كردووە هەتاكو گەشتە ئەوەی كە بڵێن هەروەك ئەوەی كە لە ( الكشاف : ٢ / ١٣٠ ) دا هاتووە دەڵێن : (( وإن ماتت حامل بمن يرجى حياته حرم شق بطنها من أجل الحمل ، مسلمة كانت أو ذمية ، لما فيه من هتك حرمة متيقنة ، لإبقاء حياة موهومة ، لأن الغالب والظاهر أن الولد لا يعيش ، واحتج أحمد على ذلك في رواية أبي داود بما روت عائشة ... )) ، واتە : ئەگەر ئافرەتێكی حامیلە بمرێ و منداڵێكی لە سكدا بێ كە هیوای ژیان و نەمردنی لێبكرێ ئەوە حەرامە سكی بدڕیٚ بۆ دەرهێنانی منداڵەكەی ، موسڵمان بێت یاخود ئەهلی زیمە ، چونكە هەتك كردنی حورمەتی گومان لیٚ نەكراوێكە ، بۆ ژیانی شتێك كە گومان لە مان و نەمانی بكرێت ، چونكە زۆرتر و ئاشكراتر ئەوەیە كە منداڵكە نامێنێت ، وە ئەوەی كە پێشەوا ( أحمد ) كردوویەتی بە بەڵگە لەسەر ئەم باسە ئەو فەرموودەیەیە كە ( أبو داود ) لە ( عائشة ) وە گێڕاویەتیەوە .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : پاشان نووسەر فەرمودەكە و دەقی وتەی ( أبو داود ) باس دەكات لە پرسیارەكانیدا لە پێشەوا ( أحمد ) ( المسائل : ص ١٥٠ ) دا كە فەرموویەتی : (( سمعت أحمد سئل عن المرأة تموت والولد يتحرك في بطنها أيشق عنها ؟ قال : لا ، كسر عظم الميت ككسره حيا )) ، واتە : لە پێشەوا ( أحمد ) م بیست كە پرسیاری ئافرەتێكیان لێكرا مردبێت ومنداڵەكەشی لەسكیدا بجوڵیٚ ، ئایا سكی بدڕیٚ بۆ دەرهێنانی منداڵەكەی ؟ فەرموی : نەخێر ، شكاندنی ئێسكی مردوو وەك شكاندنێتی بەزیندوویی .

محمد رشيد ( رضا ) تەعلیقی لەسەر ئەمە داوە ودەفەرمویٚ : (( والاستدلال به على ترك الجنين الحي في بطن أمه يموت مطلقا فيه غرابة من وجهين : أحدهما : أن شق البطن ليس فيه كسر عظم للميت .

وثانيهما : أن الجنين إذا كان تام الخلق ، وأخرج من بطن أمه بشقه فإنه قد يعيش كما وقع مرارا ، فههنا إنقاذه ، وحفظ حياته ، مع حفظ كرامة أمه بناء على أن شق البطن ككسر العظم . ولا شك أن الأول أرجح ، على أن شق البطن بمثل هذا السبب لا يعد إهانة للميت ، كما هو ظاهر في عرف الناس كلهم . فالصواب قول من يوجب شق البطن وإخراجه إذا رجح الطبيب حياته بعد خروجه ، وقد صرح بهذا بعضهم )) .

واتە : كردنی ئەو فەرمودەیە بەبەڵگە لەسەر وازهێنان لە كۆرپەی زیندو و لە سكی دایكیدا كە مردبیٚ بەگشتی نامۆیە لەدوو ڕووەوە : یەكەم : بەڕاستی دڕاندنی سكی مردوو شكاندنی ئێسكی تێدا نیە .

دووەم : بەڕاستی ئەگەر كۆرپەلە بەتەواوی دروست بوونی تەواو بووبێت ، وە بەدڕاندنی سكی دایكی دەربهێنرێ ئەوا دەژی ، وەك چۆن چەندان جار شتی واڕووی داوە . ئا لەو كاتەدا ڕزگار دەكریٚ و ژیانی دەپارێزریٚ لەگەڵ پاراستنی

واتە : لەبەر ئەوەی كە لەو فەرمودەیەوە وەردەگیرێت و دەزانرێت كە شكاندنی ئێسكی مردوو وەكو شكاندنی ئێسكی زیندووە .

**وە ئەم سودانە لەم فەرمودەوە بەدەست دێن :**

١ـ حەرامێتی دەركردنی تەرمی موسڵمان لە گۆڕەكەی و تێكدانی گۆڕەكەی ، لەبەر ئەوەی ئێسكەكانی تووشی شكاندن دەبێت ، لەبەر ئەوەیە هەندێ لەپێشین ( سلف ) ئەوەیان پێ باش نەبوو كە گۆڕیان بۆ هەڵكەندرێ لە گۆڕستانێكدا كە مردووی زۆری تێدا نێژرابێ ، پێشەوا شافعی لە ( الأم : ١ / ٢٤٥ ) دا دەفەرموێ : (( أخبرنا مالك عن هشام بن عروة عن أبيه قال : ما أحب أن أدفن بالبقيع ! لأن أدفن في غيره أحب الي ، إنما هو أحد رجلين ، إما ظالم فلا أحب أن أكون في جواره ، وإما صالح فلا أحب أن ينبش في عظامه ، قال : وإن أخرجت عظام ميت أحببت أن تعاد فتدفن )) ، واتە : ( مالك ) ی كوڕی ( هشام ) هەواڵی دایێ لە ( عروة ) وە ، ئەویش لە باوكیەوە فەرمویەتی : پێم خۆش نیە كە مردم لە گۆڕستانی بەقیع بنێژرێم ! ئەگەر لە جێگایەكی تر بێجگە لەبەقیع بێ ئەوە پێم خۆشترە . ئەوەش تەنها یەكێكە لەم دوو پیاو یان كەسێكی ستەم كارە ئەوە پێم خۆش نیە ، لەتەنیشتیەوە بنێژرێم و ببمە دراوسێی ، وەیان كەسێكی چاكە ئەوە پێم خۆش نیە ئێسك وپروسكی تێكدەم ولێكیان هەڵوەشێنم . وە دەفەرموێ : ئەگەر لە كاتی گۆڕكەندنەكەدا ئێسكی مردوویەك دەركرا ئەوا پێم خۆشە دووبارە بینێژرێتەوە .

وە پێشەوا ( النووي ) لە ( المجموع : ٥ / ٣٠٣ ) دا وتەیەك دەفەرمووێ كە ئەمە كورتەكەیەتی : (( ولا يجوز نبش القبر لغير سبب شرعي باتفاق الأصحاب ، ويجوز بالأسباب الشرعية كنحو ما سبق ( في المسألة

---

كەرامەتی دایكیشی .

وە بێگومان یەكەمیان راشكاو ترە ، وە لەسەر ئەوەشەوە دڕینی سك بەهۆی شتێكی بەو شێوەیەوە بە سوكایەتی كردن ناژمێرێ بۆ مردوو . وەك چۆن باوو ڕوونە لەناو هەموو خەڵكیدا . وەحەق وڕاستی وتەی ئەوانەیە كە دڕینی سك و دەرهێنانی منداڵەكە بە پێویست دەزانن گەر پزیشك بۆی ڕوون و ئاشكرا بوو كە لەدوای دەرهێنانی دەژێت . وە هەندێكیان ئەمەیان ڕاگەیاندووە .

وە لە ( منار السبيل : ١ / ١٧٨ ) دا دەفەرموێ : (( وإن خرج بعضه حيا شق للباقي لتيقن حياته بعد أن كانت متوهمة )) ، واتە : وە ئەگەر هەندێك لە جەستەی منداڵەكە بەزیندوویی دەرچوو ئەوە بۆ ئەوەی كە ماتەوە سكی دەدڕێت ، دوای ئەوەی كە مانی گومان بوو .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەوەی كە سید محمد رشید هەڵیبژاردووە ڕاست تریانە بە لای شافعیەكانەوە ، هەروەك پێشەوا ( النووي ) دەفەرموێ : ( ٥ / ٣٠١ ) ، وە ئەمەش دەداتە پاڵ وتەی ( أبو حنيفة ) و زۆرینەی شەرع زانان ، هەر ئەوەشە مەزهەبی ( ابن حزم ) ە ( ٥ / ١٦٦ – ١٦٧ ) ، وە ( إن شاءالله ) هەر ئەوەش ڕاسە .

: ١٠٩ ) ومختصره : أنه يجوز نبش القبر إذا بلى الميت وصار ترابا ، وحينئذ يجوز دفن غيره فيه ، ويجوز زرع تلك الأرض وبناؤها وسائر وجوه الإنتفاع والتصرف فيها باتفاق الأصحاب ، وهذا كله إذا لم يبق للميت أثر من عظم وغيره ، ويختلف ذلك باختلاف البلاد والارض ، ويعتمد فيه قول أهل الخبرة بها )) ، واته : دروست نیە گۆڕ تێك بدرێ بەبێ هۆكارێكی شەرعی و ئەوەش بە یەك دەنگی هاوەڵان ، وە ئەگەر لەبەر هۆیەكی شەرعی بوو ئەوا دروستە هەڵبوەشێنرێ وتێك بدرێ وەك لەپێشدا لەباسی ( ١٠٩ ) دا باسمان كرد ، كە ئەمەش كورتەكەیەتی : دروستە گۆڕی موسڵمان تێكبدرێ ئەگەر ئێسكەكەی ڕزاو بوو بەگڵ وە لەو كاتەشدا دروستە مردوویەكی تری تێدا بنێژرێ ، وە دروستە ئەو زەویە بكرێتە زراعەت و خانووی لەسەر دروست بكرێ ، و بۆ چەندان شتی بەسوودی كەش بەكارببرێ بەیەك دەنگی هاوەڵان . وە هەموو ئەمانەش لە كاتێكدا دەكرێ كەبەهیچ شێوەیەك شوێنەوار و ئێسك وهیچ شتێكی تری مردووەكە نەمابێ . وە ئەمەش جیاوازە بەپێی جیاوازی شوێن وولاتەوە . وە لەم كارەشدا پشت بەوتەی شارەزایان و پسپۆڕ و خاوەن ئەزمون دەبەسترێ .

ئەڵێم ( ئەلبانی ) : ئەمەش ئەوەی لێوە فێر دەبین كە ئەوەی هەندێك لە حكومەتە ئیسلامیەكان ئەنجامی ئەدەن حەرامە ، كە هەڵدەستن بە تەخت كردردنی هەندێك گۆڕستانی موسڵمانان و تێكدانی لەبەر ڕژێمی ڕێكخستنی بنیات نان و بوژانەوە و ڕازاندنەوە بەبێ هیچ گوێدانێك بەكەرامەت وڕێزی مردووانی موسڵمان ، یان بەبێ گرنگی دان بەو نەهی یەی لەبارەی تێكدانی گۆڕی مردووان پاپیانان وشكاندنی ئێسكیان وهاوشێوەی ئەمانەوە هاتووە . وە كەسیش گومانی ئەوە نەكات كە ڕژێمی ڕێكخستنی بنیات نان و بوژانەوە بڕو بیانوویەكی شەرعی بێت بۆ ئەو پێچەوانەكاریانە ، نەخێر ئەمانە لە پێداویستی و شتە گرنگەكان نین ، بەڵكو تەنها لە بۆ كەمالیات وڕازاندنەوەن كە دروست نیە بەهۆیانەوە دەست درێژی بكرێتە سەر مردووان ، بەڵكو زیندووان لەسەریانە كە خۆیان كاروباری خۆیان ڕێك خەن بەبێ ئازاردانی مردووانیان .

وە لەو سەیر وسەمەرانەی كە سەرج ڕادەكێشن و جێی تێڕامانن ئەوەیە كە دەبینی ئەو حكومەتانە زیاتر ڕێزی ئەو دار وخانووانەی دەگرن كە لەسەر گۆڕی مردووان دروست كراوە ، وەك لە مردووان خۆیان زیاتر ، بۆیە گەر هەندێ لەو خانوو گومەزی ( قوبە ) و بینایانەی كە لەسەر گۆڕن ڕێگای ڕژێمی ڕازاندنەوە بگرێ ئەوە لەسەر شێوەی خۆی دەیهێڵنەوە و نەخشەیەكی تر دادەڕێژن و ئەوانەی تێدا دەهێڵنەوە چونكە بەشوێنەواری كۆنی دادەنێن ! بەڵام گۆڕی خودی مردووان شایستەی ئەوەنیە كە پیلانەكەیان بۆ بگۆڕدرێ ! بەڵكو هەندێ لەو حكومەتانە هەوڵی ئەوە دەدەن . بەپێی ئاگاداریم لەو بارەیەوە . گۆڕەكانیان بخاتە دەرەوەی شار ، وە ڕێگری ناشتنی مردوو دەكەن لە گۆڕستانە كۆنەكاندا ، وە ئەمەش بەڕای من سەرپێچی یەكی ترە ، چونكە موسڵمانان

سوننەتی سەردانی گۆڕستان لەدەست دەدەن ، چونکە ئاسان نیە لەسەر خەڵکی بەگشتی کە ئەو ڕێگا دوورە ببڕن و بگەنە گۆڕستان و سەردانی بکەن و دوعای خێر بۆ مردووان بکەن !

وە بەڕای من ئەوەی وایکردووە کە ئەم سەرپێچییانە بکرێ تەنها لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ئەوروپا و ڕۆژئاوای بێباوەڕی مادین ، کە ئەیانەوێ هەرچی دیاردە هەیە لە دیاردەکانی ئیمان هێنان بە دواڕۆژ ڕیشە کێش کەن . و هەروەها هەموو ئەو شتانەش کە دواڕۆژ بیردەخاتەوە ، وە ئەمەش بۆ ڕەچاوکردنی باری تەندروستی نیە وەك ئەوان وای بۆ دەچن وگومانی بۆ دەبەن ، وە ئەگەر ئەمە ڕاست بوایە ئەوا دەبوو دەست پێشخەریان کردبا بۆ دژایەتی کردنی هۆکاری نەخۆشی کە هیچ ژیرێك گومانی لەزیانەکانی نیە ، وەك : کڕین و فرۆشتنی مەی و خواردنەوەی و تاوان وخراپە و فاسقێتی بەهەموو شێوە و ناوەکانیەوە ، بۆیە گوێ نەدان وبایەخ نەدانیان بەڕیشە کێشکردنی ئەو تاوانانە و هەوڵ دانیان بۆ لابردنی هەموو ئەو شتانەی کە دواڕۆژ بیر دەخەنەوە لە پێش چاوان گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان لاف بۆ لێدەدەن و بانگەشەی بۆ ئەکەن وە ئەوەش کە شاردوویانەتەوە گەورەترە .

٢ ـ ئەوەی کە هیچ ڕێز و ئیحترامێك نیە بۆ ئێسکی جگە لە باوەڕداران ( واتە : بێباوەڕان ) ، لەبەر ئەوەی کە وشەی ( ئێسك ) دراوەتە پاڵ ( بڕوادار ) لەو وتەیەی کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ " عظم المؤمن " ، واتە ئێسکی ئیماندار ، ئەمەش ئەوەی لێفام دەکرێ کە ئێسکی کافر و بێباوەڕان بەو شێوەیە ڕێزدار نین ، وە پێشەوا ( الحافظ ابن حجر ) ئاماژەی بەم واتایە کردووە لە ( الفتح ) دا ، بەو وتەیەی کە دەفەرموێ : (( يستفاد منه أن حرمة المؤمن بعد موته باقية كما كانت في حياته )) [٤٤٧] ، واتە : ئەو سودە لەفەرمودەکەوە وەردەگیرێ کە ڕێزی ئێسکی ئیماندار لەدوای مردنیشی دەمێنێتەوە ، وەك چۆن لەژیندا بێت .

وە لەمەشەوە وەڵامی ئەو پرسیارە ئەزانرێ کە دووپات دەبێتەوە لەسەر زاری زۆربەی خوێندکارانی بەشی پزیشکی کە ئایا دروستە ئێسکی مردوو بشکێنرێ بۆ پشکنین وتاقیکاری لەسەری ؟ وەڵامیش ئەوەیە کە دروست نیە لە ئێسکی بڕواداران ئەوە بکرێ ، بەڵام لە ئێسکی بێباوەڕان دروستە ئەوە ئەنجام بدرێ ، ئەوەش کە لەمەو دوا باسی دەکەین زیاتر پشتگیری ئەمە دەکات .

١٢٩ ـ دەرکردنی تەرمی گۆڕستانی بێباوەڕان ( نبش قبور الكفار ) ناشتنی لە شوێنێکی تر دروستە ، چونکە ڕێزو حورمەتیان نیە وەك فەرمودەکەی پێشوو دەلالەت لەسەر دەکات ، و فەرمودەکەی ( أنس ) ی کوڕی ( مالك ) ﷺ پاڵپشتی دەکات ، و دەفەرموێ : " قدم النبي ﷺ المدينة

---

[٤٤٧] ذكره في ( الفيض ) ( ٤ / ٥٥١ ) .

فنزل أعلى المدينة في حي يقال لهم : بنو عمرو بن عوف ، فأنام فيهم أربع عشرة ليلة ثم أرسل إلى بـني النجـار فجاؤوا متقلدي السيوف كأني أنظر إلى النبي ﷺ على راحلته وأبو بكر ردفه وملأ من بني النجار حوله حتى أتى بفناء أبي أيوب كان يحب أن يصلي حيث أدركته الصلاة ، ويصلي في مرابض الغنم ، وكان أمر ببناء المسجد ، فأرسل إلى ملأ من بني النجار ، فقال : يا بني النجار ثامنوني بحائطكم هذا ، قالوا : لا والله لا نطلب ثمنه إلا إلى الله ، قال : فكان فيه قبور المشركين وخرب ونخل فأمر النبي ﷺ بقبور المشركين فنبشت ، ثم بالخرب فسويت ، وبالنخل فقطع فصفوا النخل قبلة المسجد وجعل عضاديته الحجارة ، وجعلوا ينقلون الصخر وهم يرتجزون والنبي ﷺ معهم وهو يقول [ وهو ينقل اللبن :

هذا الحمال [٤٤٨] لا حمـال خيبر　　　　هذا أبر ربنـــا وأطهـر ]

اللهم لا خير إلا خير الآخـــرة　　　　فـاغفر للأنصار والمهاجرة " [٤٤٩] .

واتە : پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە لە بەرزترین شوێندا دابەزی لەگەڕەكێك كە پێی ئەڵێن گەڕەكی بەنو عەمری كوڕی عەوف ، و چواردە شەو لەناویاندا مایەوە ، پاشان ناردی بەدوای بەنی نەجاردا و ئەوانیش هاتن و شیرەكانیان بە بەرۆكەوە بوو ، منیش وەك ئەوەی سەیری پێغەمبەر ﷺ بكەم كە لەسەر سواریە كەی بوو ، وە ئەبو بەكریش لەپشتیەوە بوو ، وە كۆمەڵێ لەبەنو نەجار لەچواردەوری بوون ، تاكو هاتە حەوشەكەی ئەبو ئەیوبی ئەنساری ئەویش لەهەرجێگایەك نوێژی بەسەردا بهاتایە دەیكرد ، وە نوێژی لە پەچەڕانی مەڕومالاتدا دەكرد ﷺ ، وە پێشتر فەرمانی بەدروست كردنی مزگەوتەكە كردبوو ، ناردی بۆ لای كۆمەڵێ لەبەنی نەجار وفەرموی : ئەی بەنی نەجار ئەم زەویەم بۆ بنرخێنن وپێم بفرۆشن ، ئەوانیش فەرمویان : نەخێر سوێند بەخوا نرخەكەیمان ناوێ و دەمانەوێ بۆ خوای گەورە بێ : ڕاوی دەڵێت : ئەو زەویە گۆڕستانی بێباوەڕان

---

[٤٤٨] بالكسر من الحمل ، والذي يحمل من خيبر التمر ، أي أن هذا في الاخرة أفضل من ذاك وأحمد عاقبة ، كأنه جمع حمل ( بكسر الميم ) أو حمل ( بفتح الميم ) ، ويجوز أن يكون مصدر حمل أو حامل ، كما في ( النهاية ) .

[٤٤٩] أخرجه الشيخان وغيرهما من حديث أنس والسياق له والبخاري من حديث عائشة وما بين القوسين من حديثها وقد أخرجت الحديثين في( الثمر المستطاب ) .

قال الحافظ في (( الفتح )) : ( وفي الحديث جواز التصرف في المقبرة المملوكة بالهبة والبيع وجواز نبش القبور الدارسة إذا لم تكن محترمة وجواز الصلاة في مقابر المشركين بعد نبشها وإخراج ما فيها وجواز بناء المساجد في أماكنها ) .

واتە : وە لەم فەرمودەیەوە دەردەكەوێ كە دروستە دەستكاری تەصەروف بە گۆڕستانێ بكرێ كە موڵكی كەسێكە ، بە بەخشین وفرۆشتن ، و تێكدانی ئەو گۆڕستانانەی كە ئاسەواریان دیارنەماوە ، ئەگەر خاوەن ڕێز نەبێ ، وە نوێژكردنیش دروستە لە گۆڕستانی بێباوەڕان لەپاش تێكدان ودەرهێنانی ئەوەی كە تێیدایە ، وە دروستیشە مزگەوت لەجێگاكەی بنیات بنرێ .

، و كەلاوەیەك و چەند دارە خورمایەكی تێدا بوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بەدرەكردنی تەرمی ناو گۆڕی هاوەڵ دانەران و ناشتنیان لە شوێنێكی تردا ، وتێكدان و تەخت كردنی كەلاوەكە وبڕینی دارخورماكان زەویەكەیان تەخت كردوو دارخورماكانیان ڕیزكرد بەرەو ڕووی مزگەوت، پشتیان بە بەرد پتەوكرد ، وە لە كاتی گواستنەوەی بەرددا ڕەجەزەیان دەووت ، و پێغەمبەریش ﷺ لە گەڵیاندا خشتی دەگواستەوە و دەیفەرموو :

هذا الحمال لا حمال خيبر هذا أبر ربنا وأطهر

اللهم لا خير إلا خير الآخرة فاغفر للأنصار والمهاجرة

وە لە ڕیوایەتێكی تردا لە فەرمودەی (عائشة) وە . ڕەزای خوای لێ بێت . بەم شێوەیە هاتووە :

" اللهم إن الأجر أجر الآخرة فارحم الأنصار والمهاجرة " .

وە ئەمەش كۆتایی ئەوەبوو كە خوای گەورە یارمەتی دام بۆ كۆكردنەوەی لە (( أحكام الجنائز : **ئەحكامەكانی جەنازە** )) .

وسبحانك اللهم وبحمدك ، أشهد أن لا إله إلا أنت ، أستغفرك

وأتوب إليك ، والحمد الله رب العالمين ، دمشق ١ / ٧ / ١٣٧٣ هـ

وانتهى تبيضه : ظهر الاحد ١٩ / ٤ / ١٣٨٢ [٤٥٠]

---

[٤٥٠] وجرت المباشرة بطبعه عام ١٣٨٥ ولكن قدر الله توقف الطبع في إحدى مطابع المكتب الاسلامي مدة ثلاث سنوات وانتهى طبعه في شعبان سنة ١٣٨٨ ، والله اسأل ان يكتب السداد والتوفيق لهذا المكتب وصاحبه .

## بیدعەكانی جەنازە
## بدع الجنائز :

وە منیش لێرەدا بۆ تەواكردن سودەكان وام بە باش زانی بۆ سوودمەند بوونی كتێبەكە ، پاشكۆیەكی تایبەتی بە دوادا بنووسم سەبارەت بە بیدعەكانی جەنازە ، بۆ ئەوەی موسڵمان لێیان بە ئاگا بێت ، و كردەوەكەی تەنها بە پێی سوننەت بێت ، شاعیری داناش فەرموویەتی :

عرفت الشر لا للشر لكن لتوقيه
و من لا يعرف الخير من الشر يقع فيه

وە لە فەرموودەكەی ( حذيفة ) ەی كوڕی ( اليمان ) هاتووە كە فەرموویەتی : " كان الناس يسألون رسول الله ﷺ عن الخير وكنت أسأل عن الشر ، مخافة أن يدركني " [٤٥١] .

واتە : خەڵكی پرسیاری چاكەكانی دەكرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵام من پرسیاری خراپەكان ، لە ترسی ئەوە نەكو تووشم بن .

وە ئەگەر ئەم بەشەی كە ئامارژەم پێكرد بابەتەكانی ئامادە نەبوایە ، ئێستا كاتی ئەوەم نەدەبوو كە كۆی بكەمەوە ، و بیكەمە پاشكۆی كتێبەكەم ، بەڵام ئامادەبوو پێشتر لە لام ، كە بەشێكە لە بابەتێكی فراوان ، كە پێشتر . لە ساڵێك زیاتر بوو . دەستم كردبوو بە كۆكردنەوەی ، بۆ ئەوەی بیكەم بە كتێبێكی كۆكەرەوە تێیدا زۆربەی جۆرەكانی بیدعە كۆبكەمەوە ، شیاو بێت وەكو فەرهەنگێكی بیدعەی لێ بێت ، لە دەیەها كتێب و سەرچاوە وە كۆم كردبوونەوە ، و دەرمهێنابوون ، وە هەر ئەوەندەی مابوو كە چەند كتێبێكی تریش بخوێنمەوە ، و دوای ئەوە دەست بكەم بە ڕێكخستنی هەمووی و ئامادەردنی ، بەڵام وازم لەوە هێنا و ئەم بۆنەیەم بە هەڵ زانی ئەم بەشەم لێ دەرهێنا ، و ڕێكم خستن لە سەر ئەو بنەوایەی كە نیتەم هەبوو بنەواكەی لە سەر ڕێك بخەم ، هەروەكو دەبینیت كە چۆن بیدعەكە دەگێڕمەوە لەو كتێبەی كە لێیمەوە وەرم گرتووە . دەقاو دەق بێت یان بە واتا . ، پاشان بەدوایدا ئامارژە بە ژمارەی بەش و لاپەڕەی ئەو كتێبە كە لێیمەوە وەرگرتووە ، وە ئەگەر بە دوایدا هیچ ئامارژەیەكم نەدابوو ئەوا ئامارژەیە بەوەی كە ئەو وتەیە لە

---

[٤٥١] أخرجه البخاري (١٣/٢٩) وغيره .

منەوەیە ، و بەپێی زانستی خۆم بۆم دەرکەوتووە کە ئەو شتە بیدعەیە ، ئەو جۆرەشیان زۆر کەمە ئەگەر بەراورد بکرێت لە گەڵ ئەو بابەتە زۆرەی کە باسی لێوە کراوە ، یان بە بەراورد کردنی لە گەڵ خودی کتێبەکەدا .

وە پێش ئەوەی کە دەست بکەینە ڕیز بەندی کردنیان ، پێویستە ئەو ڕێسا و بنەوایانە باس بکەین کە ئەم بەشەی لە سەر بنیات نراوە ، وەکو پاشکۆیەك بۆ بنەواکە ، جا دەڵێم : ئەو بیدعەیەی کە شەریعەت بە گومڕایی داناوە ئەوەیە :

ا . هەموو ئەو شتانەی کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوان ﷺ ، وتە بن یان کردار یان سەبارەت بە بیروباوەڕ بن ، ئەگەر لە ڕێگەی ئیجتیهادیشەوە وترابێتن .

ب . هەموو شتێك کە بە هۆیەوە نزیك ببێتەوە لە خوای پەروەردگار ، و پێغەمبەری خواش ﷺ نەهی لێکردبێت .

ج . هەموو ئەو شتانەی کە ناتوانرێت بە شەرعی دابنرێت ئیللا بە دەقی قورئانی پیرۆز و سوننەت نەبێت ، کەچی هیچ دەقێکی لە سەر نەهاتبێت ، ئەوا ئەو شتە بیدعە و تازەگەریە ، مەگەر لە لایەن هاوەڵانی پێغەمبەرەوە بێت ﷺ .

د . ئەو داب و نەریتانەی کە تایبەتن بە بێ باوەڕان ، و دراونەتە پاڵ ئایین .

هـ . ئەوانەی کە هەندێك لە زانا بەتایبەت دواییەکان فەرموویانە سوننەتە وهیچ بەڵگەیەکی لە سەر نەبێت .

و . هەموو پەرستشێك کە لە فەرموودەی ( ضـــعیف ) ، و ( موضـــوع ) نەبێت چۆنیەتیەکەی نەهاتووە .

ز . زیادڕەوی کردن لە پەرستشەکاندا .

ح . هەموو پەرستشێك کە لە شەرعدا بە گشتی و ڕەهایی هاتووە ، و خەڵکی تایبەت ، و پەیوەستیان کردووە بە شوێن ، و کات ، و شێوە ، و ژمارەیەکی دیاریکراودا .

وە درێژەی باسی ئەم بنەوایانەش لە کتێبی ناوبراوی تایبەتدا دەبێت . بە پشتیوانی خوای پەروەردگار . جا ئێستا دەست بکەین بە ئەم مەبەستە ، و دەڵێم :

## بیدعەكانی پێش مردن
## ( قبل الوفاة ) :

١ ـ بیروباوەڕی هەندێك بەوەی كە شەیتانەكان دێنە لای ئەو كەسەی كە لە سەرە مەرگدایە لە سەر شێوەی دایك و باوكی ئەو كەسە ، و بە پۆشاك و جلی گاور ( الیهود ) یان خاچ پەرەستانەوە ( النصاری ) بۆ ئەوەی هەریەكەیان و ئایینەكەی خۆی بخاتە ڕووی بۆ ئەوەی گومڕای بكەن . ( قال ابن حجر الهیتمي في ( الفتاوی الحدیثیة ) ، نقلا عن السیوطي : ( لم یرد ذلك ) ) .

٢ ـ دانانی قورئانی پیرۆز لە لای سەری ئەو كەسەی كە لە سەرە مەرگدایە .

٣ ـ هەوڵدان لە گەڵ ئەو كەسەی كە لە سەرە مەرگدایە بۆ ئەوەی دان بنێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، و ئیمامەكانی ئەهل و بەیت ـ علیهم السلام ـ بڕوانە : ( مفتاح الكرامة : ١ / ٤٠٨ ) كە كتێبێكە لە كتێبەكانی شیعە .

٤ ـ خوێندنەوەی سورەتی ( یس ) بەسەر ئەو كەسەی كە لە سەرە مەرگدایە . ( انظر المسألة : ١٥ ) .

٥ ـ ڕووكردنی ئەو كەسەی كە لە سەرە مەرگدایە بەرەو قیبلە . ( أنكره سعید بن المسیب ، كما في ( المحلی : ٥ / ١٧٤ ) ، ومالك كما في ( المدخل : ٣ / ٢٢٩-٢٣٠ ) ، و هیچ فەرموودەیەكی ( صحیح ) لەو بارەیەوە نەهاتووە .

## بیدعەكانی دوای مردن
## ( بعد الوفاة ) :

٦ ـ ئەو وتەیەی شیعەكان كە دەڵێن : مرۆڤ بە مردن پیس دەبێت جگە لە مەعصوم [٤٥٢] و شەهیدان نەبێت ، یان ئەو كەسەش كە كوشتنی پێویست بێت بە مەرجێ خۆی بشوات پێش

---

[٤٥٢] مەبەستیان پێشەوا و ئیمامانی خۆیانە ، كە بیروباوەڕیان بەرامبەریان وایە ( معصوم ) ن ، ( معصوم ) یش بە كەسێك دەووترێت كە پارێزراو بێت لە تاوان ، وەڵە هەروەكو پێغەمبەران ـ علیهم السلام ـ پارێزراون لە تاوان ، وەڵە .

مردنی ، پاشان بەو هۆکارەوە بکوژرێت ، نەك بۆ هۆکارێکی تر [٤٥٣] بڕوانە : ( الحديث الاول ، من المسألة (٣١) ) .

٧ - دەرکردنی هەمو ئەو ئافرەتانەی کە لە بێنوێژی یان لەخوێنی زەیسانیدان ، و ئەوانەش کە لەشیان گرانە لە لای تەرمەکە !

٨ - وازهێنانی ئەو کەسانەی کە ئامادەی دەرچوونی ڕووحی مردووەکە بوون ، لە ئیش وکار ، تاکو حەوت ڕۆژی بە سەردا دەچێت ! ( المدخل لابن الحاج : ٣ / ٢٧٦ - ٢٧٧ ) .

٩ - بیروباوەڕی هەندێك بەوەی : کە ڕۆحی مردووەکە دەسوڕێتەوە لە دەور و بەری ئەو شوێنەی کە تیایدا مردووە .

١٠ - داگیرسان ، و هێشتنەوەی مۆم لە لای مردووەکە لە شەوی مردنیدا ، تاکو ڕۆژ دەبێتەوە ( المدخل : ٣ / ٢٣٦ ) .

١١ - دانانی پەلە ( چڵە ) دارێکی سەوز و تەڕ ، لەو ژوورەی کە مردووەکە تێیدا مردووە .

١٢ - خوێندنەوەی قورئان لە لای مردووەکە تاکو کاتی دەست پێکردنی شۆردنی .

١٣ - نینۆك کردنی ، و لابردنی مووی عەورەتی مردووەکە . ( المدونة ، للإمام مالك ( ١/١٨٠) ، و ( مدخل : ٣ / ٢٤٠ ) .

١٤ - لۆکە خستنە ناو کۆم و لوت و قوڕگی مردووەکەوە !

١٥ - خۆڵ کردنە ناو چاوی مردووەکەوە و لە گەڵ وتنی ئەم ڕستەیە لەو کاتەدا : ( لا يملا عين ابن آدم إلا التراب ) ، واتە : هیچ شتێك چاوی نەوەی ئادەم تێر ناکات جگە لە خۆڵ نەبێت . ( المدخل : ٣ / ٢٦١ ) .

١٦ - واز هێنانی کەسوکاری مردووەکە لە خواردن تاکو لە بە خاك سپاردنی دەبنەوە ( منه : ٣ / ٢٧٦ ) .

١٧ - پابەند بوون بەگریانی بەیانیان و ئێواران .

١٨ - دادڕینی جل و بەرگ لە کاتی مردنی باك و برادا [٤٥٤] ، بڕوانە : ( الحديث المتقدم في ( الفقرة بج ) ، من المسألة ٢٢ ) .

١٩ - خەمباری دەربڕینی ئافرەتان بۆ ماوەی یەك ساڵی تەواو لەسەر مردووەکە ، بەوەی کە خەنەی تیادا بەکار ناهێنن و جل و بەرگی جوان لەبەر ناکەن و خۆیانی تیا ناڕازێننەوە ،

---

[٤٥٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١ / ١٥٣ ) کۆڕا ، و یەك دەنگی شیعە لە سەر ئەو بابەتە دەگێڕێتەوە ! کەچی پێچەوانەی فەرمودەی ئاماژە پێکراوە .

[٤٥٤] ئەوەش بۆچوونی شیعەی دوانزە ئیمامیە لە ( مفتاح الكرامة : ١ / ٥٠٩ ) .

کاتێکیش کە ساڵەکە بە سەر دەچێت ، و تەواو دەبێت لەو نەخش و نوسینانەی کە پێشتر دەیانکرد ، و زۆربەشیان لە شەرعدا قەدەغەکراون لە سەریان ! ئەو ئافرەتانە و ئەوانەی کە پابەند بوونە لە گەڵیاندا بەو خەمبارییەوە ، ناویشیان لێ ناوە بە ( فك الحزن ) ، واتە : ( پرسە شکاندن ) . ( المدخل : ٣ / ٢٧٧ ) .

٢٠ - هێشتنەوەی ڕیش لە لایەن هەندێك کەسەوە ، بۆ دەربڕینی خەمباری لەسەر مردووەکە . ( انظر المسألة : ٢٢ (( فقرة )) و ) .

٢١ - هەڵگێڕانەوەی قاڵی و فەرشی ناو ماڵ ، و بەرماڵ ، و داپۆشینی ئاوێنە ، و سورەیاکان [٤٥٥] .

٢٢ - وازهێنان لە سود وەرگرتن لەو ئاوەی کە ماوەتەوە لە ماڵدا ، لە کوپ و هاوشێوەکانی ، واش ئەبینن کە ئەو ئاوە پیسە ، وە واش لەیەکی ئەدەنەوە کە ڕوحی مردووەکە لە کاتی دەردەچوونیدا دەڕواتە ناو ئەو ئاوەوە قوتکەی تێدا دەخواتەوە ! ( المدخل ) .

٢٣ - ئەگەر لە سەر خواردن یەکێکیان بپژمێت ، پێی ئەڵێن : قسە لە گەڵ فلانە کەسدا بکە نێرینە بێت یان مێینە ، لەوانەی کە خۆشیان دەوێت ، بە ناو هێنانیان ، بە بیانووی ئەوەی نەکو بمرێت ، وبکات بە مردووەکە ( منه ) !

٢٤ - وازهێنان لە خواردنی گوشتاو ( شلە ، یان شۆربا ) ، و ماسی ، بە درێژایی کاتی خەمباریان لە سەر مردووەکەیان . ( منه : ٣ / ٢٨١ ) .

٢٥ - وە هەروەها وازهێنانیان لە خواردنی گۆشت و جگەری سورکراوە ، و کوبەش .

٢٦ - وە وتە صۆفیەکان کە دەڵێن : هەرکەسێك لەسەر مردووەیك بگریت ، ئەوا لە ڕێگەی کەسانی خاوەن مەعریفە دەردەچێت . ( تلبيس إبليس لابن الجوزي : ص٣٤٠ - ٣٤٢ ، انظر : الأحاديث في المسألة : ١٨ ) .

٢٧ - دانان و وازهێنان لە جل و بەرگی مردووەکە . تاوەکو ڕۆژی سێیەم . بەبێ شۆردن ، بەگومانی ئەوەی کە سزای گۆڕی لێ دوور دەکاتەوە . ( المدخل : ٣ / ٢٧٦ ) .

٢٨ - وتەی هەندێکیان کە دەڵێن : هەرکەسێك ڕۆژی هەینی ، یان شەوی هەینی بمرێت ئەوا تەنها یەك کات ژمێر لە گۆڕەکەیدا سزا ئەدرێت پاشان سزای لەسەر هەڵدەگیرێت ، و دەبڕێتەوە ، و جارێکی تر ناگەڕێتەوە تاکو ڕۆژی دوایی . ( حكاه الشيخ علي القاري في ( شرح الفقه الأكبر : ص ٩٦ ) ورده ، وانظر الحديث تحت الفقرة : ( الثالثة ) ، من المسألة : ٢٥ ) .

---

[٤٥٥] لە ناو کوردەواری خۆشماندا دیاریدەی داپۆشینی تەلەفزیۆن ئامێرەکانی تری هاوشێوەی ئەنجام دەدرێت ، کە ئەویش دەچێتە ڕیزی ئەو بیدعانەوە کە شێخ باسیان دەکات ( مامۆستا عدنان ) .

٢٩ ـ وتەیەکی تر کە دەڵێت : باوەڕداری تاوانبار ، و سەرپێچیکار لە ڕۆژ و شەوی هەینی دا سزای گۆڕی لەسەر لا دەبرێت ، و ناگەڕێتەوە تاکو ڕۆژی دوایی [٤٥٦] .

٣٠ ـ بانگەوازکردن و ئاگادارکردنەوەی خەڵك بە مردنی کەسێك ، لە سەر مینبەری مزگەوتەکانەوە ( ٣ / ٢٤٥ ــ ٢٤٦ : من المدخل ) ، وراجع : ( المسألة : ٢٢ ، ( فقرة : ز ) .

٣١ ـ وتنی : فاتیحە بۆ ڕوحیانەتی فڵانە کەس ، لە کاتی بیستن و خەبەرپێدانی یەکێکیان بە هەواڵی مردنی ئەو کەسە ( انظر : المسألة : ٢٤ ) .

## بیدعەکانی شۆردنی مردووە ( غسل الميت ) :

٣٢ ـ دانانی هەندێك نان و گۆزەیەك ئاو لەو جێگایەی کە مردووەکەی تێدا شۆراوە ، بۆ ماوەی سێ شەو پاش مردنی . ( المدخل : ٣ / ٢٧٦ ) .

٣٣ ـ داگیرسانی چرا یان لاڵە لەو شوێنەی کە مردووەکەی تێدا شۆراوە ، بۆ ماوەی سێ شەو ، لە کاتی خۆر ئاوا بوونەوە تاکو کاتی خۆر هەڵاتن ، وە هەندێکیان حەوت شەو ئەو کارە ئەنجام دەدەن ، وە هەندێکی تریان زیاد لە سەر ئەوە ئەنجام دەدەن ، هەموو ئەوەش لەو شوێنەی کە مردووەکەی تێدا مردووە ( منه ) .

٣٤ ـ وتن و کردنی هەندێك زیکری تایبەت لە لایەن مردوو شۆرەوە ، لە کاتی شۆردنی هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی مردووەکە ( منه : ٣ / ٣٢٩ ) .

٣٥ ـ دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکرکردن ، لەکاتی شۆردنی مردووەکە و لە کاتی شوێنکەوتن ، و بەڕێ کردنی جەنازەکە . ( الخادمي في : ( شرح الطريقة المحمدية : ٤ / ٢٢ ) .

٣٦ ـ دانانی پرچی ئافرەتی مردوو لە نێوان مەمکەکانی . ( بڕوانە : فەرموودەی : ( أم عطية ) ، لە بابەتی : ( ٢٨ ) دا .

---

[٤٥٦] نقله الشيخ علي القاري في : ( شرح الفقه الأكبر : ص٩١ ) ورده بقوله : ( إنه باطل ) ، وأوضح منه في البطلان القول الآخر : (( إن عذاب القبر يرفع عن الكافر يوم الجمعة وشهر رمضان بحرمة النبي ﷺ ! )) ، حكاه الشيخ أيضا ورده .

## بیدعەكانی كفن كردن و كاتی دەركردنی تەرم لەماڵدا ( الكفن والخروج بالجنازة ) :

٣٧ ـ گواستنەوەی مردووەكە بۆ شوێنانێكی دوور بۆ ناشتنی لە لای گۆڕستانی پیاوچاكان وەكو ئەهل و بەیت و هاوشێوەی ئەوان [٤٥٧] .

٣٨ ـ وتەی هەندێكیان كە دەڵێن : مردووان خۆیان هەڵدەكێشن لە گۆڕەكانیاندا بە كفن و جوانی كفنەكانیان ، وە واش لێكی دەدەنەوە كە هەر یەك لە مردووان كەم وكورتیەك لە كفنەكانیدا هەبێت ، ئەوا تانەی لێ دەدەن بە هۆیەوە و بە عەیبی دەزانن . ( المدخل : ٣ / ٢٧٧ ) [٤٥٨] .

٣٩ ـ نوسینی ناوی مردووەكە ، و ئەوەش كە شایەتومانی هێناوە ، و ناوی ئەهل و بەیتی پێغەمبەر ـ علیهم السلام ـ بە خۆڵی گۆڕەكەی حسین ـ علیه السلام ـ ئەگەر خۆڵەكە دەست كەوێت و پاشان فڕێدانی نووسراوەكە بۆ ناو كفنەكە [٤٥٩] .

٤٠ ـ نوسینی نزا و پاڕانەوە لە سەر كفنەكە [٤٦٠] .

٤١ ـ ڕازاندنەوەی تەرمەكە . ( الباعث على إنكار البدع والحوادث لأبي شامة ص ٦٧ ) .

٤٢ ـ هەڵگرتنی ئاڵا ( بەیداخ ، و پەرچەم ، و عەلەم ) لە پێش تەرمەكەوە .

٤٣ ـ دانانی عەمامە ( سەروێن ، و مشكی ) لە سەر تابووت یان ئەو ئامێرەی كە مردووەكەی پێ دەگوێزرێتەوە . (( صرح ابن عابدين في ( الحاشية : ١ / ٨٠٦ ) بكراهة هذا وكذا الذي قبله )) . كڵاو ( الطربوش ) ، و تارای سەر چاوی بووك ( إكليل العروس ) ، هەموو ئەو شتانەی كە ئاماژە بە كەسایەتی مردووە دەكەن هەمان حوكمیان دەبێت .

٤٤ ـ هەڵگرتنی تاجە گوڵینە وبخور ، وچەپكە ودەستە گوڵ ، ووێنەی مردووەكە لە پێش تەرمەكەدا !

---

[٤٥٧] هەروەكو كردەوەی ڕافیزەكان كە لە عێڕاقدا ئەنجامی دەدەن ( مامۆستا عدنان ) .

[٤٥٨] قلت : روي شيء من هذا في بعض الاحاديث الضعيفة ، وأقربها إلى هنا حديث جابر : أحسنوا كفن موتاكم فإنهم يتباهون ويتزاورون بها في قبورهم . رواه الديلمي وفي سنده جماعة لم أعرفهم ، وبنحوه حديثان آخران ذكرهما ابن الجوزي في ( الموضوعات ) وتعقبه السيوطي في ( اللالي:٢/٢٣٤) بما لا يجدى .

[٤٥٩] عليه الامامية كما في ( مفتاح الكرامة : ١ / ٤٥٥ – ٤٥٦ ) .

[٤٦٠] وقد شرع ذلك بعضهم قياسا على كتابة : ( لله ) في إبل الزكاة ! ورده في ( التراتيب الادارية : ١ / ٤٤٠ ) نقلا عن ( المحتار على الدر المختار ) كذا في نقل عنه وسقط مني أو الطابع لفظة ( رد ) لان الكتاب باسم ( رد المحتار ) والبحث المذكور في المجلد الاول منه ( ١ / ٨٤٧ – ٨٤٨ ) .

٤٥ـ سەربڕینی مەڕ وماڵات لە کاتی دەرکردنی تەرمەکەدا ، لە بەر دەرگای ماڵدا . ( الإبداع في مضار الإبتداع ، للشيخ علي محفوظ : ص ١١٤ ) ، وە بیروباوەڕی هەندێکیان کە ئەگەر ئەو کارە ئەنجام نەدرێت ، ئەوا سێ کەس لە کەس و کاری مردووە دەمرێت !

٤٦ـ هەڵگرتنی نان و مەڕو ماڵاتی زیندو لە پێش تەرمەکەدا ، و سەربڕینیان پاش ناشتنی و دابەشکردنی گۆشتەکەی لە گەڵ نانەکەدا . ( المدخل : ٢٦٦ ـ ٢٦٧ ) !

٤٧ـ بیروباوەڕی هەندێکیان بەوەی کە : ئەگەر مردووەکە چاکەکار بێت ، ئەوا قورسیەکەی سووک دەبێتەوە لە سەر هەڵگرانی و بە پەلە بە ڕێ دەکرێت .

٤٨ـ صەدەقە کردن لە گەڵ دەرکردنی تەرمەکە . ( الاختيارات العملية : ص٥٣ ) ، و (کشاف القناع : ٢ / ١٣٤) . لەو شتانەش کە دەکرێنە صەدەقە بەخشینی (العرقسوس) ، و لیمۆیە ، یان هاوشێوەکانی .

٤٩ـ پابەند بوون لە کاتی دەست پێکردن هەڵگرتنی تەرمەکە بە دەستی ڕاست ( المدونة : ١٧٦ ) .

٥٠ـ هەڵگرتن و نانی دە هەنگاو بە تەرمەکە لە هەموو چوار لایەکیەوە [٤٦١] .

٥١ـ بە هێواشی بە لەسەرخۆیی بەڕێکردنی تەرمەکە . ( الباعث لابي شامة : ص ٥١ ٦٧ ) ، و ( زاد المعاد ١/٢٩٩ ) .

٥٢ـ قەرەباڵغی کردن لەسەر تابوت و ئەو دارەی کە مردووەکەی پێ دەگوێزرێتەوە . ( المحلى لابن حزم : ٥ / ١٧٨ ) [٤٦٢] .

٥٣ـ وازهێنان لە نزیك بوونەوە لە تەرمەکە . ( الباعث : ص ٦٧ ) .

٥٤ـ قسە کردن و وازهێنان لە بێدەنگی . ( منه ، وحاشية ابن عابدين ١ / ٨١٠ ) .

ئەم وتەیە دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکریش دەگرێتەوە ، هەروەکو لە خاڵی دوای ئەمە باسی لێوە دەکرێت ، و قسەکردنی خەڵکیش لە گەڵ یەکدا ، و هاوشێوەی ئەوانەش .

٥٥ـ بەدەنگی بەرز و ئاشکرا زیکرکردن و قورئان خوێندن ، یان بوردەی مەدیح ( البردة ) خوێندن ، یان ( دلائل الخيرات ) ، هاوشێوەکانیان . ( الابداع ص١١٠ اقتضاء الصراط المستقيم ص ٥٧

---

[٤٦١] واستدل لذلك بعض الفقهاء بحديث : ( من حمل جنازة أربعين خطوة كفرت عنه أربعين كبيرة ) نقله في البحر الرائق (٢/٢٠٧ – ٢٠٨) عن ( البدائع ) . وفي ( شرح المنية ) : ( رواه أبو بكر النجاد ) كما في الحاشية ( ١ / ٨٣٣ ) وهكذا يتناقله بعضهم عن بعض دون أن يشيروا إلى حالة الحديث وهو لا يصح لان فيه على بن أبي سارة وهو ضعيف وهذا الحديث مما أنكر عليه كما قال الذهبي ولذلك جعلناه من ( موضوعات الجامع الصغير ) ومع هذا فالحديث لا يدل على هذه البدعة فتنبه .

[٤٦٢] ثم روى عن قتادة : شهدت جنازة فيها أبو السوار ـ هو حريث بن حسان العدوي ـ فازدحموا على السرير فقال أبو السوار : أترون هؤلاء أفضل أو أصحاب محمد ﷺ ! كان الرجل منهم إذا رأى محملا حمل ، وإلا اعتزل ولم يؤذ أحدا .

الاعتصام للامام الشاطبي (١/٣٧٢ شرح الطريقة المحمدية١/ ١١٤وانظر المسألة ٤٨) .

٥٦ ـ زیكركردن لە دوای جەنازەكە بە ( الجلالة ) ، یان بە بوردەی مەدیح ( البردة ) ، یان ( دلائل الخيرات ) ، یان بە خوێندنەوەی ناوە پیرۆزەكانی خوای پەروەردگار ( الأسماء الحسنى ) ( السنن والمبتدعات للشيخ محمد بن أحمد خضر الشقيري ص ٦٧ ) .

٥٧ ـ دوو جار ، وتنی ئەم زیكرە : ( الله أكبر ، الله أكبر ، أشهد أن الله يحيي ويميت ، وهو حي لا يموت ، سبحان من تعزز بالقدرة والبقاء ، وقهر العباد بالموت والفناء ) ، بە دوای مردووەكەوە [٤٦٣] .

٥٨ ـ هاواركردن لە پاش تەرمەكەوە بە وتنی : ( داوای لێخۆشبونی بۆ بكەن خوای گەورە لێتان خۆش بێت ) ، و هاوشێوەكانی . ( المدخل : ٢/٢٢١ ) ، و ( الابداع : ص١١٣) .

٥٩ ـ هاواركردن و دەنگ بەرزكردنەوە بە ووتنی ( الفاتحة ) ، لە كاتی تێپەڕ بوون بەلای گۆڕی پیاوچاكێكدا ، یان لە كۆتایی ڕێگەكاندا .

٦٠ ـ وتنی ئەم زیكرە لە لایەن ئەوانەی كە تەرمەكە دەبینن : (( الحمد لله الذي لم يجعلني من السواد المخترم )) [٤٦٤] .

واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی كەنەمی گێڕاوە لە ئەوانەی كە زەمانە پارچە پارچەی كردن و لە ناوی بردن ، و ڕیشە كێشی كردن .

٦١ ـ بیروباوەڕی هەندێكیان بەوەی كە : تەرمەكە ئەگەر تەرمی كەسێكی چاك بێت بە بێ ویستی هەڵگرانی ئەوەستێ لە كاتی تێپەڕ بوونی بە تەنیشت گۆڕی پیاوچاكێك .

٦٢ ـ وتنی ئەم زیكرە لە كاتی بینینی تەرمەكە : (( هذا ما وعدنا الله ورسوله ، وصدق الله ورسوله ، اللهم زدنا إيمانا وتسليما )) [٤٦٥] .

واتە : ئەمەیە كە خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ بەڵێنیان پێداوین ، بەڕاستی خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ ڕاستیان فەرمووە ، ئەی پەروەردگار زیاتر باوەڕ و ملكەچیمان زیاد بكەی .

٦٣ ـ شوێن كەوتنی مردوو بە هەڵگرتنی مەقاڵەیەك ( یان : ئاگردانێك ) ( مجمرة ) . ( المدونة : ١/١٨٠ ) ، وە بڕوانە بابەتی : ( ٤٧ ) .

---

[٤٦٣] استحبه في ( شرح شرعة الاسلام ) ! ( ص ٦٦٥ ) .

[٤٦٤] صرح في ( مفتاح الكرامة ) ( ٩١ / ٤٦ – ٤٧١ ) بأنه مستحب !

[٤٦٥] أورده في شرح الشرعة ( ٦٦٥ ) تمام حديث أوله : ( الموت فزع فإذا رأيتم الجنازة فقوموا وقولوا فذكره . ولا أعرفه بهذا التمام وأوله في المسند ( ٣ / ٣١٧ ) والبيهقي ( ٤ / ٢٦ ) من حديث جابر ورجاله ثقات والاحاديث في الامر بالقيام كثيرة وهي وإن كانت منسوخة كما سبق بيانه في محله ، فليس فيها هذه الزيادة فدل على إنكارها .

٦٤ ـ تەواف پێکردن و سوڕاندنی تەرمەکە بەدەور مەرقەد و مەزەرگاکاندا ( واتە : مەزەرگای پیاوچاکان ) . ( الابداع : ١٠٩ ) .

٦٥ ـ تەواف پێکردن و سوڕدانی تـەرمەکە بـەدەوری کـەعبەی پیرۆز ( واتـە : ماڵی خوا ) . ( المدخل : ٢ / ٢٢٧ ) .

٦٦ ـ ناساندنی تەرمەکە بە خەڵك لە بەر دەرگاکانی مزگەوتەوە ( المدخل : ٢٢١/٢، ٢٦٢، ٢٦٢ – ٢٦٣ ) .

٦٧ ـ بردنـە ژورەوەی مردووەکە لـە دەرگای ( الرحمة ) ەی مزگەوتی ( الأقـصی ) وە ، ودانانی لـە نێوان دەرگاکە و بەردەکەدا ، وکۆبونەوەی هەندێك لە مەشایخەکانی ئەوی بۆ خوێندنەوەی هەندێك زیکری تایبەت .

٦٨ ـ پیا هەڵدان و وەسفکردن ( الرثاء ) ی مردووەکە لە کاتی هێنانی تەرمەکە بۆ مزگەوت ، وپێش نوێژکردن لەسەری ، یان پاش نوێژکردن لەسەری ، یان پێش بەرزکردنەوەی ، یان پاش ناشتنی مردووەکە ولە لای گۆڕەکەیدا ( الابداع : ١٢٤ ــ ١٢٥ ) .

٦٩ ـ پـابەندبون بـە هـەڵگردنی تەرمەکە بـەسەر سەیارەوە ، و شوێن کـەوتنی بـەسەیارەوە . بڕوانە بـابەتی : ( ٥٤ ) .

٧٠ ـ هەڵگردنی هەندێك مردوو ، و گواستنەوەی بە سەر عەرەبانەی پاڵنانەوە !

## بیدعەکانی نوێژکردن لەسەر جەنازە ( الصلاة علیها ) :

٧١ ـ نوێژی غایب کردن لە سەر تەرمی مردووی موسڵمانان ، ئەوانەی لە سەرانسەری زەویدا مردون ، دوای خۆر ئاوابون لە هەموو ڕۆژێکدا . ( الاختیارات : ٥٣ ، و المدخل : ٢١٤/٤ ، والسنن : ٦٧ ) .

٧٢ ـ نوێژکردن لە سەر غایب لە گەڵ ئەوەی کە دەزانرێت کە لە شوێنی خۆیدا نوێژی لە سەر کراوە . ( انظر المسألة : ٥٩ ، فقرة : ( السابع ) ) .

٧٣ ـ وتنی ئەم زیکرە لە لایەن هەندێك لە نوێژگەران لەکاتی نوێژکردن لە سەری : (( سبحان من قهر عباده بالموت ، وسبحان الحي الذي لا يموت )) ، واتە : پاکی وبێگەردی بۆ خوا کە بەندەکانی مل کەچ کردووە بەمردن ، وە پاکی وبێگەردی بۆ خوای زیندووی نەمر . ( السنن والمبتدعات : ٦٦ ) .

٧٤ ـ داکەندنی نەعل و پێڵاو لە کاتی نوێژکردن لە سەری ، ئەگەرچی پیسیەکی ئاشکراشیان پێوە نەبێت ، پاشان دانایان لە ژێر پێ و وەستان بە سەریانەوە !

٧٥ ـ وەستانی پێشنوێژ لە ناوەندی پیاوانەوە ، و وەستانی لە ئاستی سینگی ئافرەتانەوە . ( انظر المسألة : ٧٣ ) .

٧٦ ـ خوێندنی پارانەوەی دەست پێكردنی نوێژ ( دعـاء الاستفتاح ) لە نوێژی جەنازەدا . ( انظر التعليق على المسألة : ٧٧ ، ص ١١٩ ) .

٧٧ ـ وازهێنان و هەوڵنەدان بۆ خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە ، و سورەتێكی تر لە نوێژەكەدا . ( انظر التعليق على المسألة السابقة : ص ١٢٠ ) .

٧٨ . وازهێنان وهەوڵنەدان بۆ سەلامدانەوە لە نوێژەكەدا [٤٦٦] .

٧٩ ـ وتنی هەندێك لە نوێژگەران لە پاش نوێژكردن لە سەر مردووەكە ، و بە دەنگێكی بەرز : گەواهی و شایەتی چی بۆ دەدەن ؟! وەڵام دانەوەی ئامادە بووانیش بە هەمان شێوە دەڵێن : لە پیاوچاكان بووە ، یان هەر وتەیەكی تری هاوشێوەی ئەو وتەیە بێت . ( الإبداع : ١٠٨ ، و السنن : ٦٦ ، و راجع المسألة : ٢٦ ، ص ٤٤ ) .

## بیدعەكانی بەخاك سپاردن وئەوانەی كە بەدوایدا دێن ( بدع الدفن وتوابعه ) :

٨٠ ـ سەربڕینی گامێشێك لە كاتی گەیشتنی تەرمەكە بۆ گۆڕستان ، و پێش ناشتنی و دابەشكردنی گۆشتەكە بەسەر ئەوانەی كە ئامادەی بوون . ( الإبداع : ١١٤ ) .

٨١ ـ ناشتن و دانانی خوێنی ئەو سەربڕاوەی كە لەكاتی دەركردنی تەرمەكە لەماڵدا سەربڕاوە لەناو گۆڕی مردووەكە .

٨٢ ـ زیكر كردن لە چواردەوری تابووتی مردووەكە پێش ناشتنی . ( السنن : ٦٧ ) .

٨٣ ـ بانگدان لەو كاتەی كە مردووەكە دەخرێتە ناو گۆڕەكەیەوە ( حاشية ابن عابدين : ١ / ٨٣٧ ) .

٨٤ ـ دابەزاندنی مردووەكە بۆ ناو گۆڕەكەی لای سەری گۆڕەكەوە ( راجع المسألة : ١٠٣ ، ص١٥٠ ) .

٨٥ ـ دانانی هەندێ خۆڵی قەبری حسين . عليه السلام . لەگەڵ مردووەكەدا لە كاتی دابەزاندنەكەی ( داهێلاندنی ) دا بۆ ناو گۆڕەكەی ، بە بیانووی ئەوەی كە پارێزەر ، و ئەمانە لە هەموو ترسێك [٤٦٧] .

٨٦ ـ ڕاخستنی لم لەژێر مردووەكە بەبێ هیچ پێویستیەك . ( المدخل : ٣ / ٢٦١ ) .

---

[٤٦٦] هو من متفردات الامامية عن سائر المسلمين كما في ( مفتاح الكرامة ) ( ١ / ٤٨٣ ) من كتبهم .

[٤٦٧] كذا زعم في ( مفتاح الكرامة ) ! ( ١ / ٤٩٧ ) .

٨٧ ـ دانانی سەرینێك یان هاوشێوەی لەژێر سەر مردووەکە لەناو گۆڕەکەدا . ( منه : ٣ / ٢٦٠ ) .

٨٨ ـ پرژاندنی گولاو بەسەر مردووەکەدا لەناو گۆڕەکەی . ( المدخل : ٣ / ٢٦٢ ، ٢ / ٢٢٢ ) .

٨٩ ـ خۆڵ هەڵدانە سەر گۆڕی مردووەکە بەسەر دەست و وتنی : ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) [٤٦٨] !

٩٠ ـ خوێندنی : ﴿ مِنهَا خَلَقْنَاكُمْ ، واتە : لەمەوە دروستمان کردوون ﴾ ، لە یەکەم خۆڵ کردن سەری ، وە خوێندنی : ﴿ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ ، واتە : دوبارە دەتان گێڕینەوە بۆ ناوی ﴾ لە دووەمیاندا ، وە خوێندنی : ﴿ وَمِنهَا نُخرِجُكُمْ تَارَةً أُخرَى ، واتە : هەر لەوێشەوە جارێکی تر دەرتان دەکەینەوە ﴾ لە سێیەمیاندا . ( راجع المسألة : ١٠٦ ) .

٩١ ـ وتنی : ( بسم الله ) لە یەکەم خۆڵ کردنە سەرمردووەکەدا ، و ( الملك لله ) لە دووەمدا ، و ( القدرة لله ) لە سێیەمیاندا ، و ( العزة لله ) لە چوارەمدا ، و ( العفو والغفران لله ) لە پێنجەمدا ، و ( الرحمة لله ) لەشەشەمدا ، پاشان لە حەوتەمیاندا ئایەتی : ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾ دەخوێنێتەوە ، لە گەڵ خوێندنەوەی ئایەتی : ﴿ مِنهَا خَلَقْنَاكُمْ ﴾ .

٩٢ ـ خوێندنەوەی ئەم حەوت سورەتە : ﴿ الفاتحة ﴾ ، و ﴿ المعوذتان ﴾ ، و ﴿ الإخلاص ﴾ ، و ﴿ إذا جاء نصر الله ﴾ ، و ﴿ قل يا أيها الكافرون ﴾ ، و ﴿ إنا أنزلناه ﴾ ، لە گەڵ ئەم پاڕانەوەیە : (( اللهم إني أسألك باسمك العظيم ، وأسألك باسمك الذي هو قوام الدين ، وأسألك ... وأسألك ... وأسألك باسمك الذي إذا سئلت به أعطيت ، وإذا دعيت به أجبت ، رب جبرائيل وميكائيل وإسرافيل وعزرائيل ... الخ )) ، هەموو ئەو خوێندنەوەیانەش لە کاتی ناشتنی مردووەکە دەبێت [٤٦٩] .

٩٣ ـ خوێندنەوەی سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ لە لای سەری مردووەکە ، و ئایەتەکانی سەرەتای سورەی ﴿ البقرة ﴾ لای قاچەکانی [٤٧٠] .

٩٤ ـ خوێندنەوەی قورئان لەکاتی خۆڵ کردن بەسەر مردووەکەدا . ( المدخل : ٣ / ٢٦٢ ـ ٢٦٣ ) .

٩٥ ـ تەلقین کردنی مردووەکە . ( السنن : ٦٧ ، وسبل السلام للصنعاني ، وانظر المسألة : ١٠٣، ص ١٥٤) .

٩٦ ـ دانانی دوو بەرد لەسەر گۆڕی ئافرەت . ( نيل الاوطار للشوكاني : ٤ / ٧٣ ) .

---

[٤٦٨] هو مذهب الامامية كما في ( مفتاح الكرامة ) ( ١ / ٤٩٩ ) ، وكأنهم أرادوا بهذه الصورة مخالفة أهل السنة الذين يحتجون كما كان ﷺ يحثو بباطن الكفين ! راجع المسألة ١٠٣ ص ١٥١ .

[٤٦٩] استحب هذا وما قبله في ( شرح الشرعة : ص ٥٦٨ ) ، ومما يدل على اختراع هذا أن فيه ذكر اسم ( عزرائيل ) ولا أصل لــه في السنة مطلقا كما سبق التنبيه عليه ( ص ١٥٦ ) .

[٤٧٠] روي هذا في حديث عن ابن عمر مرفوعا ، ضعفه الهيثمي (٣/٤٥) . وروى عنه موقوفا وهو ضعيف أيضا كما سبق في المسألة (١٢٢ ص ١٩٢) .

**٩٧ـ پیاهەڵدان و وەسفكردنی مردووەكە ( رثاء الميت ) پاش ناشتنی لەلای گۆڕەكەیدا .**
( الإبداع : ١٢٤ ـ ١٢٥ ) .

**٩٨ـ گواستنەوەی مردووەكە پێش ناشتنی یان پاش ناشتنی بۆ مەزرگا پیرۆزەكان** [471] . ( راجع المسألة : ١٠٦ ، ص ١٥٩ ) .

**٩٩ـ مانەوە ، و نیشتەجی بوون لە لای قەبری مردووەكە ، یان لە نزیكی قەبرەكەی ، دوای بەخاك سپاردنی ، لە خانوویەكی بە قوڕ درووست كراو .** ( المدخل : ٣ / ٢٧٨ ) .

**١٠٠ـ بەرگری كردن لەچونە ماڵەوە لەكاتی گەڕانەوە لەناشتنی ، تاكو ئەندامەكانیان نەشۆن لەشوێنەواری مردووەكە .** ( منه : ٣ / ٢٧٦ ) .

**١٠١ـ دانانی خواردن ، و خواردنەوە لە سەر گۆڕەكە ، بۆ ئەوەی خەڵكی بیبات .**

**١٠٢ـ سەدەقە كردن لەسەر گۆڕ .** ( الاقتضاء : ١٨٣ ، وكشف القناع : ٢ / ١٣٤ ) .

**١٠٣ـ ئاو كردنە سەر گۆڕەكە لە لای سەریەوە ، پاشان خولانەوە بە دەوریدا ، و كردنی پاشماوەی ئاوەكە بە ناوەڕاستی گۆڕەكەدا** [472] **!**

## تەعزیە و سەرەخۆشی كردن و پاشكۆكانی ( التعزية وملحقاتها ) :

**١٠٤ـ تەعزیە و سەرەخۆشی كردن لە گۆڕستاندا** ( حاشية ابن عابدين : ١ / ٨٤٣ ) .

**١٠٥ـ كۆبوونەوە لە جێگە و شوێنێكدا بۆ تەعزیە و سەرەخۆشی لێ كردن .** ( زاد المعاد :١/٣٠٤ ، وسفر السعادة ، للفيروز آبادي : ص ٥٧ ، وإصلاح المساجد عن البدع والعوائد ، للقاسمي : ص ١٨٠ـ١٨١ ، وراجع المسألة : ١١٠ ، ص ١٦١ ) .

**١٠٦ـ دیاری كردنی تەعزیە بە سێ ڕۆژ .** ( راجع المسألة : ١١٣ ، ص ١٦٥) .

**١٠٧ـ وازهێنان لەو جێگەیانەی كە لە ماڵی مردووەكەدا ڕادەخرێن بۆ ئەوەی ئەو كەسانەی كە دێن بۆ سەرەخۆشی كردن لە سەری دادەبنیشن لە تەعزیەكەدا ، ئا بەو شێوەیە وازی لێ دێنن تاكو حەوت ڕۆژی بەسەردا ئەچێت پاشان دوای ئەوە لای دەبەن و هەڵی دەگرن .** ( المدخل : ٣ / ٢٧٩ ـ ٢٨٠ ) .

**١٠٨ـ سەرەخۆشی كردن بەم وتەیە :** (( أعظم الله لك الأجر ، وألهمك الصبر ، ورزقنا وإياك الشكر ،

---

[471] هما من مذهب الامامية كما في ( مفتاح الكرامة : ١ / ٥٠٧ ، ٥٠٠ ) .

[472] هما من مذهب الامامية كما في ( مفتاح الكرامة : ١ / ٥٠٧ ، ٥٠٠ ) .

فإن أنفسنا وأموالنا وأهلينا وأولادنا من مواهب الله عز وجل الهنية ، وعواريه المستودعة ، متعك بـه في غبطـة وسرور ، وقبضه منك بأجر كبير : الصلاة والرحمة والهدى إن احتسبته ، فاصبر ولا يحبط جزعك أجرك ، فتندم واعلم أن الجزع لا يرد شيئا ، ولا يدفع حزنا ، وما هو نازل ، فكأن قد )) [٤٧٣] .

١٠٩ ـ هەروەها سەرخۆشی کردن بەوتنی : (( إن في الله عزاء من كل مصيبة ، وخلفا من كل فائت ، فبالله فثقوا ، وإياه فارجوا ، فإنما المحروم من حرم الثواب )) [٤٧٤] .

١١٠ ـ هەستانی خاوەن مردوو بە دروستکردنی خواردن بۆ میوانداریێتی ئەو کەسانەی کە هاتوون بۆ تەعزیە ، و سەرەخۆشی کردن . ( تلبيس ابليس : ٣٤١ ، و فتح القدير ، لابن الهمام : ١/ ٤٧٣ ، و المدخل : ٣/ ٢٧٥ ـ ٢٧٦ ، و إصلاح المساجد : ١٨١ ، وراجع المسألة : ١١٤ ) .

١١١ ـ دروستکردنی خواردەمەنی و میوانداریێتی لە ڕۆژی : یەکەم ، و هەفتە ، و چلە ، و سەرساڵی مردووەکە . ( الخادمي في شرح الطريق المحمدية : ٤٣٢٢ ، والمدخل : ٢/ ١١٤ ٣/ ٢٧٨ ـ ٢٧٩ ) .

١١٢ ـ دروست کردنی خواردن لەلایەن کەسوکاری مردووەکەوە لەیەکەم پێنج شەممەی مردنیدا .

١١٣ ـ بەدەمەوە هاتنی کەس وکاری مردووەکە بۆ ئەو دەعوەت و خواردنە . ( الإمام محمد البركوي ، في : جلاء القلوب : ٧٧ ) .

١١٤ ـ وتەی هەندێك کە ئەڵێن : نابێت سفرەی خواردن لە ماوەی سێ ڕۆژ هەڵ بگیرێت جگەی لەلایەن ئەو کەسانە نەبێت کە دایاننناوە . ( المدخل : ٣ / ٢٧٦ ) .

١١٥ ـ هەستان بە دروست کردن زەلابیە و شیرینی یان کڕینیان ، و کڕینی ئەوەش کەپێی دەخورێت لە ڕۆژی حەوتەمی مردووەکە . ( المدخل : ٣ / ٢٩٢ ) .

١١٦ ـ وەسیەت کردنی مردوو بە دروست کردنی خواردن ومیوانداریێتی لە ڕۆژی مردنی یان پاش مردنی ، وە وەسیەت کردن بە دانی پارەیەکی دیاری کراو بۆ ئەو کەسەی کە قورئانی بۆ دەخوێنێت ، یان ( سبحان الله ) ، و ( لا إله إلا الله ) ی بۆ دەکات . ( الطريقة المحمدية : ٤ / ٣٢٥ ) .

١١٧ ـ وەسیەت کردن بەوەی کە چەند پیاوانێك چل شەو زیاتر یان کەمتر بمێننەوە لە لای گۆڕەکەی . ( منه : ٤/ ٣٢٦ ) .

---

[٤٧٣] استحسنهما في ( شرح الشرعة : ص ٥٦٢ ، ٢٦٣ ) وغيره . والأول روي عن النبي ﷺ أنه عزى به معاذ بن جبل في ابنه ، لكنه حديث موضوع ، والآخر روي من تعزية الخضر بوفاته ﷺ لأهل بيته ﷺ وهو ضعيف كما تقدم التنبيه عليهما في التعليق على المسألة ( ١١٢ ، ص ١٦٥ ) .

[٤٧٤] استحسنهما في ( شرح الشرعة : ص ٥٦٢ ، ٢٦٣ ) وغيره . والأول روي عن النبي ﷺ أنه عزى به معاذ بن جبل في ابنه ، لكنه حديث موضوع ، والآخر روي من تعزية الخضر بوفاته ﷺ لأهل بيته ﷺ وهو ضعيف كما تقدم التنبيه عليهما في التعليق على المسألة ( ١١٢ ، ص ١٦٥ ) .

١١٨ ـ دانان وەقفكردنی شتێلێك بە تایبەت پارە ، ئەوەش بۆ خوێنەری قورئان یان بۆ ئەوانەی كە نوێژی سوننەتی بۆ دەكەن یان ( لا إلـه إلا الله ) ی بۆ دەكەن ، یان صەڵاوات دەدەن لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و پاشان پاداشتەكەی پێشكەشی ئەو كەسە بكەن كە وەقفەكەی كردووە یان بۆ گیانی ئەو كەسەی كە سەردانی ئەكات . ( منه : ٤ / ٣٢٣ ) .

١١٩ ـ صەقە بۆ كردنی لەلایەن خاوەنەكەیەوە پێش ئەوەی كە شەوی یەكەمی بەسەردا بچێ ، بەهەر شتێك كە توانای هەبێت ، و بۆی برەخسێ ، ئەگەر لە توانایدا نەبوو ئەوا دوو ڕكات نوێژ بكات لە هەر ڕكاتێكیدا سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بخوێنێ و یەك جار ئایەتی ﴿ الكرسـي ﴾ و دەجار سورەتی ﴿ التكاثر ﴾ یش ، ئەگەریش لێ بوویەوە بڵێت : (( اللهم صليت هذه الصلاة وتعلم مـا أردت بها ، اللهم ابعث ثوابها إلى قبر فلان الميت )) [٤٧٥] !

١٢٠ ـ صەدەقەكردن بۆی بەو خواردنانەی كە حەزی لێكردووە !

١٢١ ـ صەدەقە كردن بۆ ڕوحیانەتی مردووان لە سێ مانگی : ( رجب ، و شعبـان ، و رمضـان ) .

١٢٢ ـ لە سەر خستنی نوێژ ( ئیسقا ) ، ( واتە : إسقاط ) . ( إصلاح المساجد : ٢٨١ ـ ٢٨٣ ، وراجع التعليق : ص ١٧٤ ، مسألة : ١١٣ ) .

١٢٣ ـ خوێندنەوەی قورئان بۆ مردووان یان بە سەریاندا . ( السنن : ٦٣ ـ ٦٥ ، وانظر المسألة : ١١٧، ص ١٧٣، والمسألة : ١٢٢ ، ص ١٩١ ) .

١٢٤ ـ تەسبیحات كردن ( واتە : خەتمەكردن بە تەسبیح ) بۆ مردوو ( منه : ١١ ، و ٦٥ ) .

١٢٥ ـ كردنی ( العتـاقـة ) بۆ مردووەكە ، كە بریتیە لە هەزار جار خوێندنەوەی سورەتی : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ [٤٧٦] .

١٢٦ ـ خوێنەوەی قورئان بۆی ، و دەورەكردن وخەتم كردنی لە لای گۆڕەكەی . ( سفر السعادة : ٥٧ ، والمدخل : ١/ ٢٦٦ ـ ٢٦٧ ) .

١٢٧ ـ بەیانی زوو هەستان لەبەر مردووەكە : ئەویش ئەوەیە كە بەیانی زوو دەچن بۆ لای گۆڕی مردووەكە یان كە دوێنی بەخاكیان سپاردووە ، خۆیان وكەس و كارو ناسراویان . ( المدخل : ٢/ ١١٣ ـ ١١٤ ، ٣ / ٢٧٨ ، وإصلاح المساجد : ٢٧٠ ـ ٢٧١ ) .

---

[٤٧٥] ومن الغرائب أن الكتاب الذى نقلت عنه هذه البدعة وهو ( شرح الشرعة : ص ٥٦٨ ) قال : ( والسنة أن يتصدق ولي الميت ... الخ ) ولا أصل هذا في السنة قطعا فلعله يعني سنة المشايخ ، كما فسر هذا بعض المحشين قول أحد الشراح : أن من السنة التلفظ بالنية عند الدخول في الصلاة !

[٤٧٦] وقال : وحديث : ( من قرأ قل هو الله أحد ألف مرة فقد اشترى نفسه من النار ) موضوع .

١٢٨ـ ڕاخستنی فەرش یان هەر شتێكی تر لە ناو خۆڵدا ، بۆ ئەوانەی كە بەیانی زوو دێن ، و بۆ جگە لەوانیش . ( المدخل : ٣ / ٢٧٨ ) .

١٢٩ . هەڵدانی خێمە و چادرێك لەسەر گۆڕەكە . ( منه ) .

١٣٠ـ بەشەو مانەوە لە لای گۆڕەكە چل شەو كەمتر یان زیاتر ( جلاء القلوب : ٨٣ ) .

١٣١ـ كـۆڕی ماتەمینی بـۆ بەستن لـە چلەدا ، یـان لـە هەموو ساڵێك بـە ناوی یادگاریەوە . ( الابداع : ١٢٥ ) .

١٣٢ـ هەڵكەندنی گۆڕ پێش مردن وەكو خۆئامادە كردنێك بۆی ( انظر المسألة : ١١٠ ) .

## بیدعەكانی سەردانی گۆڕستان ( زیارة القبور ) :

١٣٣ـ سەردانی گۆڕستان پاش مردنی بەسێ ڕۆژ ، ناویشیان لێناوە : ( الفـرق ) ، وە سەرداندنی لە كۆتایی هەموو هەفتەیەك ، پاشان لە ڕۆژی پانزەیەمدا ، پاشان لە چلەدا ، وناویـان لێناوە : ( الطلعات ) و هەشیانـە تەنهـا دووانەكەی كۆتاییدا دەڕۆن . ( نور البيان في الكشف عن بدع آخر الزمان : ص ٥٣ ـ ٥٤ ) .

١٣٤ـ سەردانی گۆڕی دایك و باوك لە ڕۆژی هەینی دا . ( والحديث الوارد فيه موضوع ،كما تقـدم قبيل المسألة : ١٢١ ، ص ١٨٧ ) .

١٣٥ـ وتەی هەندێكیان كە دەڵێن : مردوو ئەگەر سەردان نەكرێت لە شەوی هەینی دا ئەوا دڵی دائەمێنێ ، گومانیشیان وایە كە مردووەكە دەیان بینێ لە كاتی دەرچونیان لە سنوری ناوچەكەی . ( المدخل : ٣ / ٢٧٧ ) .

١٣٦ـ سەردان و ڕۆشتنی ئافرەتان بۆ مزگەوتی گەورەی ئومەوی لە بەرە بەیانی ڕۆژی شەممەدا تاكو كاتی چێشتەنگا ، بۆ زیارەتكردن و سەردانی شوێنی مانـەوەی پێغەمبەر ( یحـیى ) ، واش گومان دەبەن كە بەردەوام بوونی چل شەو لەسەر ئەنجامدەری ئەوەی بۆ دەبێت كە لـە نیەتیدایە ! ( إصلاح المساجد : ٢٣٠ ) .

١٣٧ـ سەردانی گـۆڕی شێخ ( ابـن عـربي ) مـاوەی چـل حەفتە بەگومانی ئـەوەی كـە پێویستی یەكان جێبەجی ئەكات !

١٣٨ـ سەردانی گۆڕستان لە ڕۆژی عاشورادا . ( المدخل : ١ / ٢٩٠ ) .

١٣٩ ـ سەردانی مردوو لە شەوی نیوەی مانگی شەعبان ، و كردنەوەی ئاگر لە لایدا . ( تلبيس ابليس : ٤٢٩ ، و المدخل : ١/٣١٠ ) .

١٤٠ ـ ڕۆشتنيان بۆ گۆڕستان لە هەردوو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان ، و لەمانگی ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزاندا . ( السنن : ١٠٤ ) .

١٤١ ـ سەردانی گۆڕستان لە ڕۆژی جەژندا . ( المدخل : ١ / ٢٨٦ ، والابداع : ١٣٥ ، والسنن : ٧١ ).

١٤٢ ـ سەردانی گۆڕستان لە ڕۆژی دووشەممە و پێنج شەممەدا .

١٤٣ ـ وەستانی هەندێك لە زيارەتكاران بۆ ماوەيەكی كەم لە سەردانەكەياندا بەو پەڕی خوشوع و دڵكزيـەوە ، لـە تەنيـشت دەرگاكەيـدا وەك ئـەوە بڵێـت : داوای ڕوخـسەت دەكـەن بـۆ چـونە ژوورەوەيان ! پاشان دەچنە ژوورەوە . ( الابداع : ٩٩ ) .

١٤٤ ـ وەستان ڕووبەڕووی گۆڕەكە ، و دانانی دەستەكان بەشێوەيەك هەروەكو كەسی نوێژگەر ، و پاشان دادەنيشێت . ( منه ) .

١٤٥ ـ تەيەمموم كردن بۆ سەردانی گۆڕەكە .

١٤٦ ـ كردنی دوو ڕكات نوێژ لەكاتی سەردانی گۆڕستاندا ، بە شێوەيەك سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ لـە هــەموو ڕكاتێكيدا و : ﴿ آية الكرسي ﴾ يش يەك جــار ، و سورەتی : ﴿ الإخلاص ﴾ يش سێ جار ، و ئەجر و پاداشتەكەشی هەديە دەكات و دەينێرێت بۆ مردووەكە [٤٧٧] !

١٤٧ ـ خوێندنی سورەتی : ﴿ الفاتحة ﴾ بۆ مردووان . ( تفسير المنار : ٨ / ٢٦٨ ) .

١٤٨ ـ خوێندنەوەی سورەتی : ﴿ يس ﴾ لەسەر گۆڕستان [٤٧٨] .

١٤٩ ـ يانزە جار خوێندنی : ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ لەسەر گۆڕستـان . ( حديثها موضوع كما مــر في آخر المسألة : ١٢٢ ، ص : ١٩٣ ) .

١٥٠ ـ وتنی ئەم پاڕانەوەيیە : (( اللهم إني أسألك بحرمة محمد ﷺ ! أن لا تعذب هذا الميت )) [٤٧٩] .

---

[٤٧٧] ذكره في ( شرح الشرعة : ص ٥٧٠ ) بقوله : ( والسنة في الزيارة أن يبدأ فيتوضأ ويصلي ركعتين يقرأ في كــل ركعــة ... الخ ) ! وليس في السنة شئ من هذا بل فيها تحريم قصد الصلاة عند القبور كما سبق ، وانظر ما علقناه قريبا .

[٤٧٨] وحديث : ( من دخل المقابر فقرأ سورة ( يس ) خفف الله عنهم وكان لهم بعدد من فيما حسنات ) لا أصل في شئ من كتب السنة ، والسيوطي لما أورده في ( شرح الصدور : ص ١٣٠ ) لم يزد في تخريجه على قوله : ( أخرجه عبد العزيز صاحب الخلال بسنده عن أنس ) ! ثم وقفت على سنده فإذا هو إسناد هالك كما حققته في ( الاحاديث الضعيفة : ١٢٩١ ) .

[٤٧٩] أورده البركوي في ( أحوال أطفال المسلمين : ص ٢٢٩ ) فقال : ( وفي الخبر : من زار قبر مؤمن وقال : اللهم اني أســألك ... الخ رفع الله عنه العذاب إلى يوم ينفخ في الصور ) ! وهذا حديث باطل لا أصل له في شئ من كتب السنة ولا أدري كيف استجاز البركوي رحمه الله نقله دون عزوه لاحد من المحدثين مع ما فيه من التوسل المبتدع والمحرم والمكروه تحريما عنده كما قرر ذلك في رسالته المذكورة ( ص ٣٥٢ ) .

١٥١ـ سەلام كردن لە كاتی سەردانی گۆڕستان بەم شێوەیە : ( علیكم السلام ) بە پێش خستنی ( علیكم ) بەسەر ( السلام ) ەكەدا ، كەچی سونەتیش پێچەوانەی ئەوەیە ، هەروەك لە هەموو ئەو فەرمودانەدا هاتووە كە هاتوون لەم بارەیەوە ، و لە پێشتریش لە باسی (١٢١) دا باسمان لێوەكردن [٤٨٠] .

١٥٢ـ خوێندنی ئەم ئایەتە : ﴿ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ﴾ ( سورة التغابن : ٧ ) تاكو كۆتایی ئایەتەكە ، لەسەر گۆڕستانی خاوەن كتێبە ئاسمانیەكان ( أهل الكتاب ، كە گاور و خاچ پەرستان دەگرێتەوە ) [٤٨١] .

١٥٣ـ وەعز و ئامۆژگاری كردن لە گۆڕستاندا بەسەر مینبەر وكورسیەوە لە شەوانی مانگەشەودا . ( المدخل : ١/٢٦٨ ) .

١٥٤ـ هات و هاواركردن دەنگ بەرزكردنەوە بە وتنی : ( لا إله إلا الله ) لە كاتی تێپەڕ بوون بە نێوان گۆڕەكانی گۆڕستاندا [٤٨٢] .

١٥٥ـ ناو لێنانی ئەوانەی كە سەردانی هەندێك گۆڕستان دەكەن بە : ( حاجي ) [٤٨٣] !

١٥٦ـ ناردنی سەلام بۆ پێغەمبەران بەرێگەی ئەوانی كە سەردانیان دەكەن !

١٥٧ـ ڕۆشتنی ئافرەتان لەڕۆژی هەینیدا بۆ چەن مەزارگایەك كە لە ( صالحية ) ی دیمەشقدایە ، لەگەڵ بەشداریكردنی پیاوانیش بۆیان بەهەمان شێوە بە هەموو چین و توێژێكیانەوە . ( إصلاح المساجد : ٢٣١ ) .

---

[٤٨٠] وشبهة القائل بهذه البدعة ومنهم شارح ( الشرعة ) ( ص ٧٥٠ ) حديث جابر بن سليم قال : لقيت رسول الله ﷺ ... فقلت عليك السلام ، فقال : عليك السلام تحية الميت .. ! الحديث . أخرجه أبو داود ( ٢ / ١٧٩ ) والترمذي ( ٢ / ١٢٠ طبع بولاق ) والحاكم ( ٤ / ١٨٦ ) وصححه ووافقه الذهبي وهو كما قالا . قال الخطابي :

( وإنما قال ذلك القول منه إشارة إلى ما جرت به العادة منهم في تحية الاموات – يعني في الجاهلية – – إذ كانوا يقدمون اسم الميت على الدعاء وهو مذكور في أشعارهم كقول الشاعر : عليك سلام الله قيس بن عاصم ورحمته ما شاء أن يترحما

فالسنة لا تختلف في تحية الاحياء والاموات . وأيده ابن القيم في ( التهذيب ) وعلي القارئ في ( المرقاة : ٢ / ٤٠٦ و ٤٧٩ ) فراجعهما .

[٤٨١] استحبه في ( شرح الشرعة ) ( ص ٥٦٨ ) ولا أصل له في السنة ، بل فيها خلافه فراجع ( المسألة ١٢٥ ) .

[٤٨٢] لقد رأيت ذلك من أحدهم غير مرة يقف صباح كل يوم قبيل طلوع الشمس قائما على قبر . فجمع بين محرم وبدعة !

[٤٨٣] قال شيخ الاسلام في ( الاختيارات : ١٨١ ) : (( ويعزر من يسمي من زار القبور والمشاهد حاجا إلا أن يسمى حاجا بقيد كحاج الكفار والضالين ، ومن سمى زيارة ذلك حجا أو جعل له مناسك فانه ضال مضل وليس لاحد أن يفعل في ذلك ما هو من خصائص حج البيت )) .

ئەو وتەی ئێرانیەكانیش كە بە كەسێك سەردانی كەربەلا بكات دەڵێن : ( كەلایی ) ، یان وتنی : ( مەشەیی ) بەو كەسەی كە سەردانی مەشهەد بكات ، هەمان حوكم دەیانگرێتەوە ( مامۆستا عدنان ) .

١٥٨ - سـەردان و زیـارەتكردنی شـوێنەواری ئـەو پێغەمبەرانـەی كـە لـە شـامدا هـەن ، وەك ئەشكەوتی پێغەمبەر ( إبراهيم ) . عليه السلام . ئـەو سێ شوێنەوارەش كە لـە شـاخی ( قاسيون ) دان لە ڕۆژئاوای ( الربوة ) دا . ( تفسير الاخلاص : ١٦٩ ) .

١٥٩ - سـەردانی گۆڕی سەربـازی نادیار ( الجندي المجهول ) یـان شەهیدی نادیـار ( الشهيد المجهول ) !

١٦٠ - پێشكەش كردن و ئیهدا كردنی پاداشتی پەرستشەكان وەك : نوێژ و خوێندنی قورئان بە مردووی موسڵمانان ( راجع التعليق على المسألة : ١١٧ ، ص ١٧٣) .

١٦١ - پێشكەش كـردن و ئیهدا كـردنی كـردەوەی چاك بۆ پێغەمبـەری خوا ﷺ . ( القاعـدة الجليلة : ٣٢١١١ ، والاختيارات العلمية : ٥٤ ، وشرح عقيدة الطحاوي : ٣٨٦ ـ ٣٨٧ ، وتفسير المنار : ٨ / ٢٤٩ ، ٢٥٤ ، ٢٧٠ ، ٣٠٤ ، ٣٠٨ ) [٤٨٤] .

١٦٢ - پارەپێدان یان كرێ دان بەو كەسەی كە قورئان ئەخوێنێت و پێشكەش و ئیهدای دەكات بە مردووەكە . ( فتاوى شيخ الاسلام : ٣٥٤ ) .

١٦٣ - وتـەی ئـەو كەسانەی كـە دەڵێن : دوعـا وپـاڕانەوە گیرایە لـە لای گۆڕی پێغەمبەران وپیاوچاكان . ( الفتاوى ) .

١٦٤ - سەردانی گۆڕ بۆ پاڕانەوە لە لایدا بەهیوای وەڵام دانەوەی . ( الاختيارات العلمية : ٥٠ ) .

١٦٥ - داپۆشینی گـۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكان جگە لەوانیش [٤٨٥] . ( منه : ٥٥ ، والمدخل : ( ٣ / ٢٧٨ ) ، والابداع : ٩٥ ـ ٩٦ ) .

١٦٦ - بیروباوەڕی هەندێكیان بەوەی كە ئەگەر گۆڕی پیاوچاكێك لە دێیەكدا بێت ئەوا بەهۆی بەرەكەتی ئەوەوە ڕزق دەدرێن و سەردەكەون ، وە دەڵێن : ئـەو پیاوچاكـە پـارێزەر و پەنادەری ( خفير ) ی ئەو دێیەیە ، هەروەك دەڵێن : ( نفيسة ) پارێزەر و پەنادەری قاهیرەیە ، و شێخ ( رسلان ) پـارێزەر و پـەنادەری دیمەشـقە ، و فـلان و فلانـیش پـارێزەر و پـەنادەری بەغـدادن ، و جگـە لـە ئەوانیش ( الرد على الاخنائي : ٨٢ ) .

١٦٧ - بیرو بـاوەڕی هەنـدێكیان بـەوەی : كـە زۆربـەی مەرقـەد و قـەبری ئـەولیا و پیاوچـاكان تایبەتمەندییان هەیە بۆ چاككردنەوەی هەندێك نەخۆشی ، هەروەك چۆن پزیشكەكان تایبەتمەندی

---

[٤٨٤] بەڵام بە داخەوە دبینیت لە قوربانی ئەم ساڵدا پرسیار لە بە ناو مامۆستایەك لە كەلاردا دەكرێت : كە ئایا دەتوانرێت قوربانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بكرێت ؟! ئەویش لە وەڵامدا . و لە سەر كەناڵـەكانی ڕاگەیاندندا . دەڵێت : بـەڵێ دەتوانرێت قوربانی بۆ بكرێت !!! ( مامۆستا عدنان ) .

[٤٨٥] وفي حاشية عابدين ( ١ / ٨٣٩ ) ان ذلك مكروه . يعني كراهة تحريم .

هەیە لە نێواناندا ، بۆ نموونە دەبینین هەندێکیان بەسودە بـۆ چاوئێشە ، و هەندێکیان بۆ تاو هتد . ( الابداع : ٢٦٦ ) .

١٦٨ ـ وتـەی هـەندێکیان کە ئەڵێن : قـەبری ( معروف ) تلیاکێکی بەکار هێنراو . ( الرد على البكري : ٢٣٢ ــ ٢٣٣ ) .

١٦٩ ـ وتەی هەندێك لە شێخانی تەریقەت بۆ موریدانی : ئەگەر پێویستیەکت بە خوا هەبوو ئەوا هانا بۆ من بێنە و داوای فریاکەوتن لە من بکە یان ئەڵێ : هانا بۆ لای گۆڕەکەی من بێنە . ( منه ) .

١٧٠ ـ بە پیرۆز دانانی ئەو شتانەی لە دەور و بەری گۆڕی پیاوچاکاندایە لە دار و بەرد ، و باوەڕبوون بەوەی کە ئەگەر یەکێك شتێك لەوانە ببڕێت توشی بەڵاو ئەزیەت دەبێت .

١٧١ـ وتەی هەندێکیان کە ئەڵێن : هەر کەسێك ( آية الكرسي ) بخوێنێ بەشێوەیەك کە ڕوی لە گۆڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی بێت ، و حەوت جاریش سەلامی لێ بکات ، لە گەڵ هەموو سەلامێکیشدا هەنگاوێك بڕواتە پێشەوە بەرەو لای گۆڕەکەی ، ئەوا پێویستیەکەی بەجێ دێت ! ( الفتاوى : ٤ / ٣٠٩ ) .

١٧٢ ـ ئاوپڕژێنکردنی گۆڕی ئەو ژنەی کە مردووە ، و لەدوای مردنی پیاوەکەی ژنی هێناوە ، بە گومانی ئەوەی کە ئەو کارە گڕی غەیرەی دەکوژێنێتەوە ! ( الابداع : ٢٦٥ ) .

١٧٣ ـ سەفەر کردن بە مەبەستی زیارەت کردنی گـۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان . ( الفتاوى : ١/ ١١٨١٢٢٤ / ٣١٥ ، ومجموعة الرسائل الكبرى : ٣٩٥٢ ، والرد على البكري : ٢٣٣ ، والابـداع : ١٠٠ ــ ١٠١ ، والرد على الاخنائي : ٤٥١٢٣١٢٤١٢٤٢١٩٣٨٤ ، وراجع المسألة : ١٢٨/ ١١ ) .

١٧٤ ـ لێدانی تـەپڵ ومـۆسیقا و بـوق و شمشاڵ و سەما کردن لە لای گۆڕی پێغەمبەر ( إبراهيم ) . عليه السلام . بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خوای گەورە ( المدخل : ٤ / ٢٤٦ ) .

١٧٥ ـ زیارەت کردنی پێغەمبەر ( إبراهيم ) . عليه السلام . لە ناو بیناکەیدا . ( منه :٢٤٥/٤) .

١٧٦ ـ دروست کردنی خانوبەرە لە ناو گۆڕستاندا و مانەوە تیایدا . ( منه : ١ / ٢٥١ – ٢٥٢ ) .

١٧٧ ـ دانانی مەڕمەڕی سپی یان پارچە لەوحێکی دارین لەسەر گۆڕ . ( منه : ٣/ ٢٧٢ ، ٢٧٣ ) .

١٧٨ ـ دانانی ( الدرابزين ) لەسەر گۆڕەکە . ( منه : ٣ / ٢٧٢ ) .

١٧٩ ـ ڕازاندنەوەی گۆڕەکە . ( شرح الطريقة المحمدية : ١/ ١١٤، ١١٥) .

١٨٠ ـ هەڵگرتن و بردنی قورئان بۆ سەر گۆڕ و خـوێندنەوەی لەسەر مردووەکە . ( تفسير المنار : عن أحمد : ٨ / ٢٦٧ ) .

١٨١ ـ دانانی قورئان لەسەر گۆڕەکان بۆ هـەر کەسێك کـە بیەوێت لـەوێدا قورئان بخوێنێت

. ( الفتاوی : ١ / ١٧٤ ، والاختیارات : ٥٣ ) .

١٨٢ ـ بۆن خۆش کردنی دیوار و کۆڵەکەکانی گۆڕەکە . ( الباعث لابي شامة : ١٤ ) .

١٨٣ ـ خستنە ڕوی عەریزەی سکالاکان و فڕێدانی بۆ ناو مەرقەدکە ، بە گومانی ئەوەی کە خاوەنی مەرقەدەکە یەکلا و لێکیان دەداتەوە . ( الابداع : ٩٨ ، والقاعدة الجليلة : ١٤ ) .

١٨٤ ـ بەستنی پارچە قوماش بەپەنجەرەی گۆڕی پیاوچاکانەوە بۆ ئەوەی لەبیریان بن و پێویستیەکانیان جێ بەجێ بکەن .

١٨٥ ـ لێدانی تابوتی ئەولیا و پیاوچاکان لەلایەن ئەو کەسانەی کە سەردانیان دەکەن ، و خۆ پێوە هەڵواسینیان . ( الابداع : ١٠٠ ) .

١٨٦ ـ فڕێدانی دەسڕ و جل وبەرگ بۆ ناو گۆڕەکە بەمەبەستی تەبەڕك پێکردنیان ( المدخل : ١ / ٢٦٣ ) .

١٨٧ ـ خۆڕاکشان و خۆخستنە سەر گۆڕەکە لە لایەن هەندێك لە ئافرەتانەوە ، لە گەڵ خشاندن پیاهێنانی فەرجیان بە سەر گوڕەکەدا بۆ ئەوەی سکیان پڕ بێت !

١٨٨ ـ دەست پیاهێنان و ماچکردنی گۆڕ ( الاقتضاء : ١٧٦ ، والاعتصام : ٢/ ١٣٤١٤٠ ، وإغاثة اللهفان ، لابن القيم : ١/ ١٩٤ ، والبركوى في أطفال المسلمين : ٢٣٤ ، والباعث : ٧٠ ، و الابداع : ٩٠ ) [٤٨٦] .

١٨٩ ـ سك وپشت نوساندن بە دیواری گۆڕەکەوە . ( الباعث : ٧٠ ) .

١٩٠ ـ نوساندنی لەش یان بەشێکی بەگۆڕەکەوە یان بە هەرشتێکی دەوروبەری گۆڕەکە دار بێت یان هەرشتێکی هاوشێوەی . ( الفتاوی : ٤/ ٣١٠ ) .

١٩١ ـ ڕومەت هێنان بە سەر گۆڕەکە . ( الاغاثة : ١ / ١٩٤ ــ ١٩٨ ) .

١٩٢ ـ سوڕخواردن تەوافکردن بە دەور گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان . ( مجموعة الرسائل الكبرى : ٢/٣٧٢ ، و الابداع : ٩٠ ) .

١٩٣ ـ پێناساندن لە لای گۆڕ ، کە بریتیە لە ڕۆشتن بۆ لای گۆڕی هەندێك کە گومانی چاکیان پێ دەبرێت ، لەڕۆژی عەرەفەدا ، و کۆبونەوەی گەورە لە لای گۆڕەکەی ، هەروەکو لە ڕۆژی عەرەفەدا ڕوو دەدات . ( الاقتضاء ١٤٨ ) .

١٩٤ ـ سەربڕین و قوربانی کردن لە لای گۆڕدا ( منه : ١٨٢ ، والاختیارات : ٥٣ ، ونور البيان : ٧٢ ) .

١٩٥ ـ هەوڵدان بۆ ڕووکردن لە ئەو شوێنەی کە گۆڕی پیاوچاکەکەی تێدایە لە کاتی پاڕانەوەدا

---

[٤٨٦] وقد أنكر ذلك الغزالي في ( الاحياء : ١ / ٢٤٤ ) وقال : ( انه عادة النصارى واليهود ) . وراجع المسألة ( ١٢٤ ص ١٩٥ ) .

. ( الاقتضاء : ١٧٥ ، والرد على البكري : ٢٦٦ ) .

١٩٦ ـ خۆگرتنەوە ، و خۆپاراستن لە پشت تێكردنى ئەو شوێنانەى كە گۆڕى هەندێك لە پیاوچاكانى تیایە . ( منه ) .

١٩٧ ـ سەردانى گۆڕستانى پێغەمبەران و پیاوچاكان بە مەبەستى پاڕانەوە لە لایاندا بەهیواى وەڵام دانەوەى [٤٨٧] . ( القاعدة الجليلة : ١٧ ١٢٦-١٢٧ ، والرد على البكري : ٢٧ ـ ٥٧ ، والرد على الاخنائي : ٢٤ ، والاختيارات العلمية : ٥٠ ، والاغاثة : ٢٠١١ ـ ٢٠٢ ـ ٢١٧ ) .

١٩٨ ـ سەردانى بە مەبەستى نوێژكردن لە لایدا . ( الرد على الأخنائي : ١٢٤ ، والاقتضاء : ١٣٩ ) .

١٩٩ ـ سەردانى بەمەبەستى نوێژكردن بەرەو ڕووى . ( الرد على البكري :٧١ ، والقاعدة الجليلة : ١٢٥ ـ ١٢٦ ، والاغاثة :١ / ١٩٤ ـ ١٩٨ ، والخادمي على الطريقة : ٣٢٢/٤ ) .

٢٠٠ ـ سەردانى بەمەبەستى زیكركردن و قورئان خوێندن و ڕۆژو گرتن و سەربڕین ( الاقتضاء : ١٨١١٥٤ ) .

٢٠١ ـ تەوەسول كردن بەخاوەن گۆڕەكە ( الاغاثة : ١/ ٢٠١- ٢٠٢ ٢١٧ السنن ١٠ ) .

٢٠٢ ـ سوێن خواردن پێى لەسەر خوا ( تفسير سورة الاخلاص لابن تيمية ١٧٤ ) .

٢٠٣ ـ وتنى ئەوە بە مردووەكە یان كەسى ئامادە نەبوو لە پێغەمبەران و پیاوچاكان ، كە داوام بۆ بكە لە لاى خواى بەرز و بڵند و پایە بەرز . ( القاعدة : ١٢٤ ، و زيارة القبور لـه : ١٠٨ ، ١٠٩ ، والرد على البكري : ٥٧ ) .

٢٠٤ ـ داواى فریاكەوتن یارمەتى دان لە مردوان ، هەروەك دەڵێن : ئەى فلانى گەورەم فریام كەوە !! یان سەرمخە بەسەر دوژمنمدا . ( القاعدة : ١٤ ١٧ ١٢٤ ، والرد على البكري : ٣٠ ـ ٣١ ٣٨ ٥٦ ١٤٤ ، والسنن ١٢٤ ) .

٢٠٥ ـ بیروباوەڕیان بەوەى كە مردوان دەست و توانا و ڕۆڵیان هەیە لە بووندا جگە لەخواى باڵا دەست ! ( السنن : ١١٨ ) .

٢٠٦ ـ ئیعتیكاف و مانەوە لە لاى گۆڕەكە . ( الاقتضاء : ١٨٣ ، ٢١٠ ) .

٢٠٧ ـ دەرچون دواى سەردان و زیارەت كردنى ئەو گۆڕستانانەى كە بەگەورەیان دەزانى لە سەر شێوەى پشتاو پشت ( القهقري ) ! ( المدخل : ٤ / ٢٣٨ ، والسنن : ٦٩ ) .

---

[٤٨٧] قال في ( الاغاثة : ١ / ٢١٨) وغيرها : ( والحكاية المنقولة عن الشافعي : أنه كان يقصد الدعاء عند قبر أبي حنيفة من الكذب الظاهر ) . وقال شيخ الاسلام في الفتاوى ( ٤ / ٣١٠ ، ٣١١ ، ٣١٨ ) : ( ويقرب من ذلك تحري الصلاة والدعاء قبلي شرقي جامع دمشق عند الموضع الذي يقال أنه قبر هود ، والذي عليه العلماء أنه قبر معاوية بن أبي سفيان . أو عند المثال الخشب الذى تحته رأس يحي بن زكريا ) .

٢٠٨ ـ ئەو وتەیەی هەندێ لە دەروێشان دەیڵێن کە دێن بۆ شارەکان بەمەبەستی زیارەت کردنی گۆڕی ئەو پیاوچاکانەی کە لەشارەکاندا هەن ، لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ وڵاتانی خۆیان ئەڵێن : فاتیحە بۆ ڕۆحیانەتی هەموو خەڵکی ئەم شارە و سەید و سەروەرم فلأنە کەس ، و سەید و سەروەرم فلأنە کەس لە گەڵ ناوهێنانیان و ڕوو تێکردنیان و ئاماژەبۆکردنیان و لە کۆتاییدا دەست دەهێنێ بەڕوویدا ! ( منە ٦٩ ) .

٢٠٩ ـ ئەو وتەیەیان کە ئەڵێن سەلامت لەسەر بێت ئەی پیاوچاکی خوا ، فاتیحە خوێندن زیادەیە بۆ بەرزی پلە وپایەی پێغەمبەر ﷺ ، و ( الأقطاب الأربعة ، والأنجاب ، والأوتاد ، وحملة الكتاب ، والأغواث ، وأصحاب السلسلة ، وأصحاب التعريف ، والمدركين بالكون )[٤٨٨] وەسەرجەم پیاوچاکانی خوا بەگشتی و بەکۆ ، ( ياحي ياقيوم ) ، پاشان فاتیحە دەخوێنن و ڕوومەتی پێ مەسح دەکەن و پشتاو و پشت دەڕۆنەوە ! ( منە ) .

٢١٠ ـ بەرزکردنەوەی گۆڕ ، و بیناکردن لەسەری . ( الاقتضاء : ٦٣ ، وتفسير سورة الاخلاص : ١٧٠ ، وسفر السعادة : ٥٧ ، وشرح الصدور للشوكاني : ٦٦ ، وشرح الطريقة المحمدية : ١/١١٤ ١١٥ ) .

٢١١ ـ وەسێت کردن بەدروست کردنی بینا لەسەر گۆڕەکەی ( الخادمي على الطريقة المحمدية : ٤/٣٢٦ ) .

٢١٢ ـ سپیکاری کردنی گۆڕەکان . ( الاغاثة : ١ / ١٩٦ ـ ١٩٨ ، والخادمي على الطريقة : ٤/٣٢٤ ) .

٢١٣ ـ نوسینی ناوی مردووەکە و مێژوی مردنی لەسەر گۆڕەکە . ( المدخل : ٣/ ٢٧٢ ، والذهبي في تلخيص المستدرك ، والاغاثة : (١/ ١٩٦ـ ١٩٨) ، والخادمي على الطريقة : ٤/٣٢٢ ، والابداع : ٩٥ ، والمسألة : ١٢٨ ، فقرة : ١ ـ ٦ ) .

٢١٤ ـ دروست کردنی مزگەوت و مەزارگا لەسەر گۆڕ و شوێنەوارەکان . ( تفسير سورة الاخلاص : ١٩٢ ، والاقتضاء : ٦ ١٥٨ ، والرد على البكري : ٢٣٣ ، والابداع : ٩٩ ) .

٢١٥ ـ کردنی گۆڕستانەکان بە مزگەوت بە نوێژ کردن لە سەری یان لە لایدا . ( الابداع : ٩ ،

---

[٤٨٨] ئەم زاراوە و ناوانە کۆمەڵە ناوێکی داهێنراوە لە لایەن سوفیگەرانەوە ، کە باوەڕیان وایە پیاوچاکان و ئەولیاکانی خوای پەروەردگار توانا و دەسەڵاتیان هەیە لە بەڕێوە بردنی گەردوون ، و کاروباری موسڵمانان !!! کە ئەمەش ئاشکرایە هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای پەروەردگار لە یەکخوا پەرستە پەروەردگاریتی کە تێیدا موسڵمان دەبێت باوەڕی بەوە هەبێت کە تەنها خوای پەروەردگار بەڕێوە بەری گەردوونە و هەرئەویشە کاروباری موسڵمانان بەڕێوە دەبات ، وە ئەوەش بزانرێت کە شێخی پایەبەرزی ئیسلام ( ابن تيمية ) فەرموویەتی : هەموو ئەو ڕیوایەتانەی کە باس لەو زاراوە و ناوانە دەکەن داهێنراون و هیچ بنەوایەکیان نیە لە شەرعدا .

والفتاوى : ١٨٦/٢ ١٧٨ ٣١١/٤ ، والاقتضاء : ٥٢ ، وراجع المسألة : ١٢٨ ، فقرة : ٨ و ٩ ) .

٢١٦ ـ ناشتنی مردوو لە مزگەوتدا یان دروست کردنی مزگەوت لەسەری . ( إصلاح المساجد : ١٨١ ، والمسألة : ١٢٨ ، فقرة : ٩ ) .

٢١٧ ـ ڕووکردنە گۆڕ لە کاتی نوێژدا ، لە گەڵ پشتکردن لە کەعبە ! ( الإقتضاء : ٢١٨ ) .

٢١٨ ـ کردنی گۆڕستان بە جێگەی جەژن گێڕان . ( منه : ١٤٨ ، و الإغاثة : ١٩٠/١ ـ ١٩٣ ، و الإبداع : ٨٥ ـ ٩٠ ، و راجع الفقرة : ١٠ من المسألة : ١٢٨ ) .

٢١٩ . هەڵواسینی چرا بە سەر گۆڕەکەوە بۆ ئەوەی خەڵکی بێت بۆ زیارەتکردنی ( المدخل ٣ / ٢٧٣ ـ ٢٧٨ ، الاغاثة ١٩٤ ـ ١٩٨ ، الطريقة المحمدية ٤ / ٢٣٦ ، الابداع : ٨٨ ، المسألة المشار إليها آنفا فقرة : ل ) .

٢٢٠ ـ کردنی زەیت بە صەدەقە و نەزر بۆ بەکارهێنانی لە ڕووناکردنەوەی گۆڕ و شاخ و دارەکان . ( الاصلاح : ٢٣٢ ـ ٢٣٣ ، والاقتضاء : ١٥١ ) .

٢٢١ ـ بوونی مەبەستی زیارەتکردی قەبرەکەی لە لایەن خەڵکی مەدینەوە لە هەموو چوونە مزگەوت و دەرچوونێکیان . ( الرد على الاخنائي : ٢٤١٥٠ ـ ١٥١ و ١٥٦ و ٢١٧ و ٢١٨ ، و الشفا في حقوق المصطفى للقاضي عياض ( ٢ / ٧٩ ) ، المسألة المتقدمة فقرة : ١٠ ) [٤٨٩] .

٢٢٢ . سەفەرکردن بە مەبەستی زیارەت کردنی گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ ( انظر : البدعة رقم :١٧٢) .

٢٢٣ . سەردانی قەبری پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەجەبدا .

٢٢٤ . ڕۆشتن و ڕووکردنە قەبری پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ڕۆشتنە ژوورەوە بۆ مزگەوت ، وەستان تیایدا بەوپەڕی خوشوعەوە و بەشێوەیەك دەستی ڕاستی دادەنات لە سەر دەستی چەپی هەروەکو بڵێت لە نوێژدایە ! ( انظر البدعة ١٩٤ ) [٤٩٠] .

٢٢٥ . داوای ئەوە بکرێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە داوای لێخۆشبوون بکات بۆی ، لە گەڵ خوێندنەوەی ئەم ئایەتە : ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾ ( سورة النساء : ٦٤ ) . ( الرد على الاخنائي : ١٦٤ و ١٦٥ و ٢١٦ : السنن : ٦٨ ) .

---

[٤٨٩] وقد كره مالك ذلك فقال : ( لم يبلغني عن أول هذه الامة وصدرها أنهم كانوا يفعلون ذلك ، ويكره إلا لمن جاء من سفر أو أراده ) . كذا نقله القاضي عيض .

[٤٩٠] وقد رأيت ذلك سنة ٦٨ فقف شعري لكثرة من يفعل ذلك سيما من الغرباء .

٢٢٦ . تەوەسول پێکردنی پێغەمبەر ﷺ . ( أنظر البدع : ٢٠٠ ــ ٢٠٣ ) .

٢٢٧ . سوێندخواردن پێی لە سەر خوای پەروەردگار .

٢٢٨ ـ داوالێکردنی بەوەی کە بێتە هانەیەوە ، کە ئەو کارە تایبەتە بە خوای پەروەردگار ونابێت بۆ جگە لە ئەو ئەنجام بدرێت .

٢٢٩ . پرچ برین و فڕێدانی بۆ ناو ئەو چرا گەورەیەی کە لە نزیك خۆڵی سەر قەبری پێغەمبەر ﷺ دانراوە . ( الابداع في مضار الابتداع ١٦٦ ، الباعث ٧٠ ) .

٢٣٠ . دەست هێنان بە قەبری پیرۆزیدا ( المدخل ١ / ٢٦٣ السنن ٦٩ الابداع ١٦٦ ) .

٢٣١ . ماچکردنی قەبرەکەی . ( منهما ) .

٢٣٢ . تەوافکردن بە دەوریدا . ( مجموعة الرسائل الكـبرى : ٢ /١٠١٣ ، والمـدخل : ٢٦٣/١ ، و الابداع ١٦٦ و السنن ٦٩ و الباعث ٧٠ ) [٤٩١] .

٢٣٣ . پێوە نـووسـان و لکاندنی سك و پشت بـە دیـواری قـەبری پیرۆزیەوە ( الابـداع ١٦٦ الباعث ٧٠ ) .

٢٣٤ . دەست دانان لە سەر پەنجەرەی ژووری قەبری پیرۆزی ، و سوێند خواردنی هەندێکیان بەوەی کە بڵێت : بە حەقی ئەو کەسەی کە دەستت لە سەر پەنجەرەکەی داناوە ، وە تۆش بڵێت : شەفاعەتمان بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ !

٢٣٥ . زۆر وەستان بە پێوە بە مەبەستی پاڕانەوە بۆ خۆی لە لای قەبری پێغەمبەر ﷺ ، وڕووتێکردنی لەو کاتەدا ( القاعدة الجليلة ١٢٥، والرد على البكري ١٢٥ ٢٣٢ ٢٨٢ ، ومجموعة الرسائل الكبرى ٢/ ٣٩١ ) .

٢٣٦ . خۆنزیکردنە لە خوای پەروەردگار بە خواردنی خورمای ( الصيحاني ) لە ڕەوزەی شەریفدا کە دەکەوێتە نێوان قەبر و مینبەرەکەیەوە . ( الباعث : ٧٠ ، والابداع : ١٦٦ ) .

٢٣٧ ـ کۆبوونـەوە لـە لای قـەبری پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە مەبەسـتی خەتمـە خوێندنـەوە و ئینشادکردنی هونراوە و قەصیدە ( مجموعة الرسائل الكبرى : ٢ / ٣٩٨ ) .

٢٣٨ . دوعای باران بارین ، بەلابردنی داپۆشەری سەر قەبری پێغەمبـەر ﷺ یـان جگـە لـەو لە پێغەمبەران ، و پیاوچاکان . ( الرد على البكري : ٢٩ ) [٤٩٢] .

---

[٤٩١] ونقل عن ابن الصلاح أنه قال : ( ولا يجوز أن يطاف بالقبر الشريف ) .

[٤٩٢] قلت : وأما ما روى أبو الجوزاء أوس بن عبد الله قال : قحط أهل المدينة قحطا شديدا فشكوا إلى عائشة فقالت : أنظروا قبر النبي ﷺ فاجعلوا منه كوة إلى السماء حتى لا يكون بينه وبين السماء سقف ، قال : ففعلوا فمطرنا مطرا حتى نبت العشب ، وسمنت الابل حتى تفتقت من الشحم فسمي عام الفتق ) فلا يصح ، أخرجه الدارمي في سننه ( ١ / ٤٣ – ٤٤ ) وفيه أبو النعمان وهو محمد بن الفضل المعروف بعارم وقد كان اختلط في آخر عمره كمـا قـال

٢٣٩ ـ ناردنی هەندێك پارچە كاغەز و نوسراو ، كە تێیدا باسی پێویستی و ئیحتیاجاتی خۆیانی تێدا دەخەنە ڕوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .

٢٤٠ ـ وتەی هەندێكیان كە دەڵێن : پێویست ناكات بەوەی كە پێویستیەكان و داوای لێخۆشبوون بۆ تاوانەكانی خوێ بە زمان بخەیتە ڕوو لە كاتی سەردانی قەبری پێغەمبەر ﷺ ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترە لە خۆیان بە پێویستی و ئەو شتانەی كە چاكەی ئەوانی تێدایە ! [٤٩٣] .

٢٤١ . وتەی ئەوانەی كە دەڵێن : هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ژیانی لەوەی كە ئوممەتەكەی دەبینێت ، و بە ئاگایە بە حاڵ و ئەحواڵ و نیازەكانیان و ئەفسوز و ختوورەكانی ناو دڵیان ! [٤٩٤] .

وە ئەمەش دوا بیدعەیە لە بیدعەكانی جەنازە كە توانیبێتم كۆی بكەمەوە ، وە بەوەش ئەم كتێبە تەواو دەبێت ، و شوكریش بۆ خوای پەروەردگار لە سەر سەرخستنی ، و داواكاریشم لە خوای پەروەردگار كە زیاترم پێ كەرەم كات لە چاكەكانی ، و خۆشویستنی ئەوەشم پێ كەرەم كات كە حەزم لە پێگەیشتنی بێت لەو كاتەی كە ماڵئاوای دەكەم لەم دونیا كۆتایی هاتووە بۆ مەنزڵگا و ماڵی هەتاهەتا و كۆتایی نەهاتوو ، و لە گەڵ ئەوانەدا بم كە خوای پەروەردگار سەبارەتیان فەرموویەتی : ﴿ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴾ [٤٩٥] .

محمد ناصرالدين الألباني

---

العقيلي وغيره من أهل الحديث . وقال شيخ الاسلام في الرد على البكري ( ص ٦٨ ) : ( وما روي عن عائشة رضي الله عنها من فتح الكوة من قبره إلى السماء لينزل المطر فليس بصحيح ولا يثبت إسناده . قال : ومما يبين كذب هذا أنه في مدة حياة عائشة لم يكن للبيت كوة بل كان بعضه باقيا كما كان على عهد النبي ﷺ بعضه مسقوف وبعضه مكشوف وكانت الشمس تنزل فيه كما ثبت في الصحيحين عنها أن النبي ﷺ كان يصلي العصر والشمس في حجرتها لم يظهر الفيء بعد ) .

[٤٩٣] ومما يوسف له أن هذه البدعة والتين بعدها قد نقلتها من ( كتاب المدخل ) لابن الحاج ( ١ / ٢٥٩ ، ٢٦٤ ) حيث أوردها مسلما بها كأنها من الامور المنصوص عليها في الشريعة ! وله من هذا النحو أمثلة كثيرة سبق بعضها دون التنبيه على أنها منه ، وسنذكر قسما كبيرا منها في الكتاب الخاص بالبدع إن شاء الله تعالى ، وقد تعجب من ذلك لما عرف أن كتابه هذا مصدر عظيم في التنصيص على مفردات البدع وهذا الفصل الذي ختمت به الكتاب شاهد عدل على ذلك ، ولكنك إذا علمت أنه كان في علمه مقلدا لغيره ، ومتأثرا إلى حد كبير بمذاهب الصوفية وخزعبلاتها يزول عنك العجب وتزداد يقينا على صحة قول مالك : ( ما منا من أحد إلا رد ورد عليه الاصاحب هذا القبر ) ، ﷺ .

[٤٩٤] قال شيخ الاسلام في ( الرد على البكري ) ( ص ٣١ ) ، ( ومنهم من يظن أن الرسول أو الشيخ يعلم ذنوبه وحوائجه وإن لم يذكرها وأنه يقدر على غفرانها وقضاء حوائجه ويقدر على ما يقدر الله ، ويعلم ما يعلم الله ، وهؤلاء قد رأيتهم وسمعت هذا منهم وعنهم شيوخ يقتدى بهم ، ومفتين وقضاة ومدرسين ! ) والله المستعان ، ولا حول ولا قوة إلا بالله .

[٤٩٥] جرت المباشرة بطبعه عام ١٣٨٥ ولكن قدر الله تبارك وتعالى توقف الطبع في إحدى مطابع المكتب الاسلامي مدة ثلاث سنوات وانتهي طبعه في

## ناوەرۆك



رمضان سنة ١٣٨٨ فالحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات ... وإياه تعالى أسأل أن يكتب السداد والتوفيق لهذا المكتب وصاحبه الاستاذ الفاضل الاخ زهير الشاويش وأن ييسر له الاستمرار في طبع الكتب النافعة من تراث سلفنا الصالح وما جرى مجراها إنه سميع مجيب .

هەندێك لــە بەرهەمەكانی
( مامۆستا عدنان بارام )

١ ـ چۆنێتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لە تەكبیرەی ئیحرامەوە تاكو سەلام دانەوە هەروەكو لە پێش چاوتدا بێت ، نوسینی شێخ : محمد ناصرالدین الألباني ، وەرگێڕان .

٢ ـ چۆنیتی ڕۆژوی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا ، نوسینی شێخ : سلیم الهلالي وعلي الحلبي ، وەرگێڕان .

٣ ـ چۆنێتی حەج كردنی پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی كە جابر ( ڕەزای خوای لێ بێت ) لێی دەگێڕێتەوە ، نوسینی : شێخ محمد ناصرالدین الألباني ، وەرگێڕان .

٤ ـ ڕێگەكانی بەرەو سەلەفیەت چون وچۆنێتی ناسینەوە و جیاكردنەوەی حزبیەكان ، وەرگێڕانی بە دەستكاریەوە .

٥ ـ هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بەو تەقینەوە و خۆتەقاندنەوانەی كە لە كوردستان و عێراق و جیهاندا ڕوو دەدەن ، نوسین و ئامادەكردن .

٦ ـ چەواشەكاری و ئاوەژوكردنی ڕاستیە مێژوییەكان ، لێكۆڵینەوەیەكی شەرعی و زانستی و لۆژیكی ، لە مەڕ ئەوەی ( كە ئایا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ كەسێكی نەخوێندەوار یان خوێندەوار بووە ؟! ) ، ئامادەكردن .

٧ ـ حوكمی عەبای ئافرەتان و مەرجەكانی ، نوسین .

٨ ـ ئەستێرەكانی بەخت هاوەڵ بڕیاردانێكی كۆنە لە پۆشاكێكی نوێدا ! نوسین .

٩ ـ یان هەرسێكی كەراماتە !! یان ئەمەشیان كڵاوتی بەناوپیاوچاكانە ، ئامادەكردن .

١٠ ـ بیرخستنەوەیەك لە چۆنیتی دەستنوێژ و نوێژی پێغەمبەر ﷺ ، نوسینی: شێخ علي الحلبي ، وەرگێڕان .

١١ ـ دیاری بۆ ئەوەی موسڵمان لە ڕوانگەی سوننەت و قورئان ، ئامادەكردن .

١٢ . نوێژكردن لە نێوان كۆڵەكەكانی مزگەوت لە ڕوانگەی فەرمووە ( صحیح ) ەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ .

www.R-rast.com
abo.sunnah@gmail.com